خۆشەویستی الله بۆبەندەکانی

# في ظلال المحبة

شەرحکردنی

**مامۆستا کامەران کەریم**

نووسینەوە و ئامادەکردنی

**زانستخوازێکی شەرعی**

## پیشەکی :

( الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، سوپاسی الله دەکەین کەوا یارمەتی خۆی پێ داین و نیعمەتی پێداین کەوا هەلسین بەکۆکردنەوەی باسیك لەسەر (في ضلال محبه) کەوا مامۆستای خۆشەویست لەلای ئەهلی تەوحید و موحیدان مامۆستا کامەران کەریم (رحمه الله ) شەرحی دەکا ئێمەش هەستاین بە کۆکردنەوەی دارشتنی بۆ ئەوەی فێرخوازانی زانستی شەرعی بتوانن سودی لێ ببینن و لی شارەزا بن لەم زەمەنی پر فیتنە و ئاشوبەدا کەوا هیچ کەسێك نیە لەئەهلی عیلم سیقە پێکراو تابتوانی وەلامی پرسیارەکانمانی لابکەین وە تابتوانم سودی قیامەتی خۆمانمانی تیدا بەرجەستە بکەین وە زانینی ئەوەی الله کێ خۆش دەوێی وامان لێ دەکا کەوا هەولبدەین ئەو کارانە ئەنجام بدەین تاوەکو یەکێك بین لەوانەی الله یان خۆش دەوێی .

مامۆستای خۆشەویستمان (رحمه الله) لەم کیتابەدا باسی کۆمەلێك بابەتی گرینگ و هەستیار دەکا تاوەکو لەمانای ئەم کیتابە بگەین وە بابەتەکانیشی دابەش کردوە بۆ چەند بەشێك کەتێدا لەسەرەتادا باسی نیشانەکانی ئەو کەسانە دەکا کە الله تعالی خۆشی دەوێن کێن ئەو کەسانەی الله تعالی خۆشی دەوێن جا زانینی ئەم بابەتە ورە و هێزی زیاترت پێدەدا لەباسی دووەم دا دەچێتە سەر باسی نیشانەکانی ئەو کەسانەی بەراستی الله تعالی یان خۆش دەوێی حەتمەن ئەمەش ورەیەکی بەرزت نیشان دەدا وە زیاتر بەرە و ئەو کردەوانە هەنگاو دەنێ کە بەحەقیقی دەرخەری ئەوەت بۆ دەکا کە تۆ الله تعالی ت خۆش دەوێی چونکە ئێمەی ئەهلی ئیمان ان شط الله ئەبێ ئەهلی عەملی چاك بین .

پاشان مامۆستای خۆشەویستمان (رحمه الله) ئەچێتە سەر باسێکتر ئەویش بریتیە لەهۆکارەکانی خۆشەویستنی الله تعالی بەهۆی ئەم هۆکارانەوە تۆ بەردەوامی و زیادە بەم خۆشەویستە دەدەی تادەگەیتە پلەی موتەقی و ئیحسانەوە ، پاشان ئەچێتە سەر بابەتێکیتر کە ئەویش لەژێر ئەم باسەدا و خۆی دەبینێتەوە خۆش ویستن لەپێناو الله تعالی کە هیمنی و کامەرانی دەهێنێتە نێوانی ئینسانە موسلمانەکان چونکە هیچ بەرژەوەندیەك لەنێواندا نابی إلا فی سبل الله یەکتریان خۆش دەوی و بەرەکەت ورەحمەت و ئارامی دەهێنێتە نێوانیانەوە .

پاشان باسی بابەتێکیتر دەکا باسی ئەو سیفەتانە دەکا کەوا الله تعالی پێی خۆشە لەبەندەکانیدا هەبێ جا زانینی ئەوەی الله تعالی پێی خۆشە بەندەکان بیکەن زانیاربون بەمە وات لێدەکا تۆ بەرە و ئەم کارە

بچيت و خۆشەويستى الله تعالى بەدەست بێنى ، پاشان باسى بابەتێكتر دەكا ئەويش الله تعالى كێ خۆش دەوێى باسى ئەو كەسانە دەكا كە لە قورئان و سونەدا هاتوون كە الله تعالى خۆشيانى دەوى .
جا هيوادارم الله تعالى ئێمە بە يەكێك لەخۆشەويستەكانى خۆى حيساب بكات و بگەين بەو پلەى الله تعالى ئێمەى خۆش بوێى ئێمەش بەراستى و بەيەقين و بەكردەوەوە الله تعالى مان خۆش بوێى و كردەوانێك بكەين كە رازيبوونى الله تەنها مەبەستمان بێ .
لەكۆتايدا داواكارم لە الله تعالى كەوا ئەم تەرخان كردنى كاتەم بۆ ئەم بابەتە بكاتە تێشووى قيامەتم و لێمان وەرگرێى وە داواكارم لە الله تعالى بيكاتە يەكێك لەكردەوە چاكەكانى ميراتێكى مامۆستاى كۆچ كردومان و بێتە زەخيرەى چاكەكانى لەقيامەت ، وە داواى لێخۆشبون لە الله تعالى دەكەين لەهەر كەم و كورتيەكمان تيدا هەرچى چاكە و راستى هەيە لەم كيتابەدا ئەوە لە الله وەيە هەرچى نارێكى و ناراستيش ئەوە لەئێمەوەيە .

(وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين)

(سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)

(وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين)

## نیشانەکانی خۆشویستنی الله بۆ بەندەکەی

## الحيية عن الدنيا

دوور خستنەوە لەدونیا :

هاتینە سەر دونیا گەر سەیری دونیا بکەین دونیا بەنیسبەت ئێمەی پیاوانەو هەمووی بریتیە لە مال و ئافرەت یاخود بەنیسبەت ئافرەتانەوە بریتیە لەمال و پیاو ئەگەر مال و ئافرەت لە ژیانی پیاو لابدەی یان مال و پیاو لە ژیانی ئافرەت لابدەی لەگەل خواردن و پۆشاکدا سەیری بکەن چی ئەمێنێتەوە ؟! هەرئەوەندەیە ! زۆربەی کێشەکان هەتا کوفریش کە بەسەر ئینساندا دێت لەمال و سەروەت و سامان لەگەل ئافرەت ئەمە بەنیسبەت پیاوانەوە .

نیشانەی یەکەم ئەوەیە الله تعالی ئەم بەندەی لەدونیا ئەپارێزی نایەلێت تووشی دونیا ببێت نا یەلێت مەشغول بێت بەدونیاوە سەرقال و مەشغولی ئەکات بەخۆییەوە بەخۆشەویستی خۆیی و بەعیبادەتی خۆیەوە بەبیر کردنەوە لە قیامەت بەبیر کردنەوە لەبەهەشت چونکە ئەم دونیایە ئەروات و نامێنی بەچەندەها ملیۆنت هەبێ وەکو قارون ئەبێ وەکو کەنزەکەی چۆن چوو بە زەویدا تۆش ئەوها هەرئەچیت بە زەویدا ئەگەر نەچیت بە زەویدا تۆ ئەمریت و بەجێی دەهێلی بۆ میراتگرانت ئەبی زۆر وریا بین ، گەورەترین پاشاکانی جیهان کۆن و ئێستادا لەسەرچی ئەم هەموو شەرو شۆرەیان بۆ دروست دەبێ ؟ لەسەر خوایە ! یاخود لەسەر مال وسامان و پارەیە !لەسەر وەی حەزدەکا هەر بۆ خۆی وا دەزانی لەباو باپیرانیەوە بۆ ئەو ماوەتەوە هەر دەبی بۆ ئەو بێت و بۆنەوەی نەوەشی بڕوات هەموو بابەتەکە لەسەر دونیایە لەبەر ئەوە یەك لە نیشانەکانی الله بۆتۆ ئەوەیە لەدونیا بتپارێزیی .

( عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال : قال صلى الله عليه وسلم " إن الله تعالى ليحمي عبده المؤمن من الدنيا وهو يحبه كما تحمون مريضكم الطعام والشراب تخافون عليه )[1] واتە :ئەبو سەعید (رەزای الله لێی بێ) ئەلێ :پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : الله تعالی بەندە بڕوادارەکەی خۆیی ئەپارێزی لەدونیا (سەرقالی ناکا بەدونیاوە ) لەکاتێکدا ئەو دونیایی خۆش دەوێی الله دەیپارێزی (تۆ دونیات خۆش دەوێی بەس الله پێتی نابەخشی تۆ نازانی ئەمە نیشانەی خۆش ویستنی الله بۆتۆ ! ئەلێ لێ گەری دونیات ناداتێ وە سەرقالت ناکا بەدونیاوە لەوانەش چەندین خۆزگە بخوازی کە ئەوەم هەبوایە

[1]: الكتب » المستدرك على الصحيحين كتاب الأطعمة «إن الله ليحمي عبده المؤمن الدنيا

بەلام نیتە )وەکو چۆن نەخۆشەکەتان (سەیر دەکەی هەندێك نەخۆش هەیە[٢] هەندێك خواردن و خواردنەوە بۆی باش نیە کاتێك عەمەلیات ئەکرێی زۆرجار دکتۆرەکان ئەلێن ئاوی پێی نەدەیت جارێی کەچی ئەو هاوار دەکا ئاوم بدەنی کەچی دکتۆرەکە ئەلیٚ نەخێر بیدەتی بۆی خراپە ئەم نەخۆشە ئاوەکەی خۆش دەوێی بەس تۆ چۆن ئەیپارێزی لەم ئاوە بۆئەوەی هەتاوەکو چاك ببێتەوە یاخود هەندێك خواردن و خواردنەوە دکتۆر ئەلیٚ زیانی پیٚ دەگەیەنێت و مەیدەنیٚ بۆنمونە زەختیەتی ئەگەر شتی سوور بخوا پیٚ خۆشە بخوا بەس دکتۆرەکە پیٚ دەلیٚ مەیخۆ ئەم رێگری وکردنە لەخواردنی ئەم خواردن و خواردنەوانە لەنەتیجەی خۆشەویستی تۆیە بۆ ئەم نەخۆشە خۆ رقت لیٚ نیە تا توشی زیان و موصیبەتی گەورەتر نەبیٚ ) ئەلیٚ الله تعالی بەم شێوەیە بەندەکەی ئەپارێزی لەدونیا بەس تۆ ئاگات لیٚ نیە لەوانەیە بشلێت بۆ الله نادا بەمن وە چەندین کوفر بکەی لەسەریی لەبەر ئەوە تیٚ دەکەویت ئەواکاتە .

لەبەر ئەوە ئاگادارین ئەگەر الله تعالی تۆیی پاراست تۆ شاکیر بووی لەسەری تۆش روو لە الله بووی ئەوە بزانە ئەوە الله تۆیی خۆش دەوێی بۆیە تۆیی لەدونیا پاراستوە ،لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەوانەی دەکەونە ناو دونیاوە لە سەتا ٩٠ ی دەرناچن رەنگە تۆ پرسیار بکەی کەس دەولەمەند نەبیٚ و مالی نەبیٚ و کەس خۆشی دونیای نەبیٚ ئەدی ئەوە نیە ئایەت وا دەلیٚ رەنگە زۆرکەس تۆمەتبارمان بکا بە توندرەوی و تی نەگەیشتوو بلێن ئەمە چیە !؟ئێمە باسی نیسبەتەکە دەکەین رێژەکە سەیری زۆرینەی دەولەمەندان بکەن لە چ دونیایەك دەژین ؟! لەتەقوا و تاعەت و ئیماندا ئەژین ؟ یان لەئەرق خۆری و لەسك تێر نەبوون و سەرسەریەتی و فسق و فجوریدا ئەژین یان لەزولم و زەوردا چەندین مال و مولکی هەیە هێشتان هەر هاوار دەکا ، یاخود سەیر دەکەی کابرا مالێکی زۆری هەیە کەچی زۆر تاوانبارە لەوانەش بلێت ئەمە چیە باشە الله بۆ دەیدا بەم نایدا بەمن کوفر ئەکرێی ئەلیٚ سەیرەکە الله ئەیدا بەکیٚ و نایدا بەمن نازانیٚ بخوا (والعیاذ بالله) تەعلیق لە الله ئەدا و رەخنە لە الله دەگرێی .

استدراج : بریتیە لەوەی کە الله تعالی پیی بەخەشی رووی لەخوا نەبوو ناوشکری کرد لەسەری و کوفری کرد.

واتا خوای تعالی چۆن (ولله مثل أعلی) تۆ ئەچیت بۆ راوێك نێچیرێك ئەگریی شتێکی بۆ دا ئەنیٚ کەتۆ ئەوشتەی پیٚ ئەدەیی پێت خۆشە بخوا نەخێر ئەتەوێت رای بکێشی تاببێت بەتەلەکەوە . ئەیداتی زۆر

2

دواتر دەیگرێی و بەری نادا قوردەکرێی بەسریدا و لە دەعمی  سەیارەدا پارچە پارچە دەبیٚ و (لا اله الا الله)ی لەبیردەچیٚ یان توشی موصیبەتێکی دەکا بەیەکجار شەرەف و ناموس و مال بەیەکجار هەموی لەناو دەبا لیٚ دەستێنتەوە جا ئاگاداری خۆتان بن تاقیکردنەوە الله زۆر گەورەیە.

( أن يحفظه من متاع الدنيا ويحول بينه وبين نعيمها وشهواتها ) الله تعالى خۆشیەکانی دونیای ناداتیٚ (ويقيه أن يتلوث بزفرتها لألا يمرض قلبه بها وبمحبتها ) الله تعالى ئەو دلەی دەپارێزی بۆئەوەی پیس نەبێت بە جوانی و پیسایەتی دونیاوە بەرازاندنەوە جوانی دونیا گرینگی نەدا بەم بابەتە (وقل أن يقع أعطاء دنيا نسحتها إلا استدراج من الله  ) ئەلیٚ زۆربە کەمی هەیە الله بدات بەکەسێك إلا إستدراجە واتا رای دەکێشی چونکە لەناو تاواندایە دەیداتی دواتر توشی بەلاو موصیبەتی دەکا دواتر أنتقامی لیٚ ئەستێنی بەقسەی الله ی نەکردوە خۆ الله زولم لەکەس ناکا جل وعلى (لاكراه من  ومحبته لمن أعطاء ) واتا رێزی لیٚ نەناوە.

بۆیە ئاگاداربن زۆربەی بەخشینەکان و نەبەخشینەکان نابێتە پێوەر و معيار نابێتە میزان بۆ باشی  و خراپی کەسەکە ئاگاداربن کەتۆ بلیٚ الله بەمنی دا رێزی لەمن نا بەمنی نەبەخشی رێزی لیٚ نەنام نەخێر وانیە هەمووی تاقیکردنەوەیە ،بەلاٚم لەزۆربەی پێنەدانەکاندا الله تعالى ئەو بەندەیە دەپارێزی بۆئەوەی خەریکی نەکا بەدونیاوە بۆئەوەی خەریکی عیبادەتی ئەو بیٚ چونکە قیامەتی بۆ هەلگرتوە بەهەشتێکی نەبراوەی هەتا هەتایە .

(وعن عقبة بن عامر – رضي الله عنه – عن النبي – صلى الله عليه وسلم – قال : " إذا رأيت الله عز وجل يعطي العبد من الدنيا على معاصيه ما يحب فإنما هو استدراج " . ثم تلا رسول الله صلى الله عليه وسلم : فلما نسوا ما ذكروا به فتحنا عليهم أبواب كل شيء حتى إذا فرحوا بما أوتوا أخذناهم بغتة فإذا هم مبلسون)[٣] واتە : عوقبەی کوری عامر (رەزای خوای لیٚ بیٚ ) دەفەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : ئەگەر بینیت الله بەبەندەیەکی دا لەدونیاو لەخۆشیەکانی دونیا لەسەر تاوانەکانی وە ئەو کەسە تاونبارە و الله پێشی ئەدا چی پیٚ خۆشە ئەیداتیٚ بزانن ئەوە إستدراجە و راکێشانە  بۆئەوەی تووشی سزادانی بکا دوای ئەم ئایەتەی خوێندەوە (**فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ**)[٤] واتە : کاتێك

[٣]:رواه أحمد
[٤]:سورة الانعام اية :٤٤

که لەیادیان چوو ئەوەی که الله ئەوانی بیر خست بوویەوە ئایەتەکانی بۆناردبوون کەوا عیبادەتی الله بکەن ئەوان ئەوەیان لەبیرخۆیان بردەوە ( فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ )لەدوای ئەوەی که پشتیان له الله و لەدینەکەی الله کرد الله دەرگای هەموو شتێکی بۆ کردنەوە پێی بەخشین ( حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا ) دلخۆش بوون بەوەی الله بەوانی داوە چەند مالم هەیە چەند مولکم هەیە ! ( أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً )لەناکاو الله بەعەزاب ئەوانی گرت ( فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ) بێ هیوا بوون لەبەر ئەوەشە بە ئیبلیس ئەوترێی ئیبلیس چونکه بێ هیوا بووە ماناکەی بێ هیوایە هیوای نەما بە رەحم و مەغفیرەتی الله هیچ کاتێك هیوای نەماوە هەمووتان ئەزانن کەوا هەتا هەتاییە لە جەهەنەم بەلکو الله تعالی رۆژی قیامەتیشی باسکردوە کەوا ئیبلیس لەناو جەهەنەمدایە چی دەلێت واتا هیچ مەجالێکی نەماوە ئیبلیس رەنگە هەندێك بیربکاتەوە دەبێت تەوبە نەکا ؟! نەخێر تەواو .

مبلیس :کەسێکە کە بێ هیوایە واتا الله تعالی پێ دەلێ هیچ هیوات نەما وەکو فیرعەون  هیچ هیوایەکی ما فیرعەون کە الله تعالی لەناو بەحەرکەدا خنکاندی وتیشی (لا اله الا الله ) بەلام بێ هیوا بوو لەکاتی مردندا یە وسودی نیە مردنیش لەناکاوە و توانای هیچت نامێنی .

## حسن التدبير له

(فيربيه من الطفولة على أحسن نظام ويكتب الإيمان في قلبه وينور له عقله ويجتبه لمحبته ويستخلصه لعبادته ويشغل لسانه بذكره وجوارحه لخدمته.) واتا : الله تعالى هەر لەمنداليەوە ئەو بەندەيەی پەروەردە دەكا ناهێلێت تووشی خراپەكاری ببێت زۆرجار وایە الله تعالى كەسێكی خۆش بووێی هەرلەمنداڵەوە پەروەردەی دەكا لەسەر باشترین پەروەردە پەروەردەی ئەدا تووشی ئەو خراپكارییەی ناكا كەمنداڵان تووشی ئەبن پاشان تازە پێگەیشتووە كان و پێگەیشتووەكان و تا دەگاتە كاتی مردنی ئیمان لەدلیدا ئەنووسی عقلی رۆشەن دەكاتەوە هەلی دەبژێرێی بۆخۆشەویستی خۆی پۆختەی ئەكاتەوە بۆعیبادەتی ئەوكەسە هەر لەمنداليەوە خەریكی عیبادەتی الله دەبێ .

نمونە زۆر جار ئەبینین و ئەبیستین ئەلێن : سەیری فلان كەس ماشاء الله هەر لەمنداليەوە خەریكی عیبادەتە و روو لەمزگەوت و دەرسی شەرعییە ئەوە نیشانەی خۆشەویستی الله یە بۆ ئەو كەسە .

زمانی سەرقال ئەكا بە زیكری خۆی نەك زمانی سەرقال بێ بەزیكری كەسیتر ، ئەمرۆ سەیری زمانەكان بكەن هەتا جارێك ئەلێ الله هەزار جاری ناوی غەیری الله دێی .

(وجوارحه لخدمته ) واتا :چوار پەلەی سەرقال دەكا بە خزمەتی خۆیەوە بەنوێژ و تاعەت و عیبادەتەوە وە بەگوێرایەلی الله تبارك وتعالى .

---

## الرفق

ئەگەر الله تعالى بەندەیەكی خۆش بوێی ئەو بەندەیەی نەرم و نیان ئەكا .

مەبەست پێ ئەوەیە كەوا ئینسانێكی نەرم و نیان ئەبێ و لەئیش و كارەكانیدا دوور دەبێ لە توورەی و گرژی ، بەس ئاگاداربن كە نەرم و نیان بوو مانای ئەوە نیە كەوا دین بە شلرەوی وەربگرێی وای لێ بكا ئەگەر كەسانێك سنوری الله یان شكاند ئەو هەر بێ دەنگ بێ یانی لە سروشتی خۆیدا كەسێكی نەرم و نیانە ئێستا كەسی واهەیە لە هەر لە سروشتی خۆیدا كەسێكی تورەیە هەر قسەی لەگەل بكەی وەك فیشەك بەرووت بەرزدەبێتەوە ، شەخصیش هەیە رێك و پێكە بەلام مانای ئەوەیە نیە كە رێك و پێك و نەرم نیانە دەست درێژی لەسەر مال و خێزانی بكرێی وە تەعدا لە الله و پێغەمبەرەكەی بكرێی هەر نەرم و نیان بێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) وانەبوو ئەگەر سنوری الله بشكێنرابایە زۆر بێ تاقەت دەبوو .

جابری كوری عبدالله (رەزای خوای لێ بێ ) دەفەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : ( إن الله إذا أحب أهل بيت أدخل عليهم الرفق)[٥] واتە : الله ئەگەر بنەمالەیەكی خۆش ویست (سەیربكەن لەم حەدیسەدا الله تعالى سیفەتی خۆشەویستی هەیە بۆ ئەو بنەمالەیەی كەوا ئەگەر خۆشی بوێی رفق و نەرم ونیانی دەخاتە نێوانیانەوە )مال و مندال هەیە تورە و توندە هەمووی ئەو لەو ئەدا ئەو لەو تورە دەبێ پیاو ئەلێ تاقەتم نەماوە و دەر ئەچێ لەمال ئەلێ ئەو رۆژەم خۆشە كە لەمال نەبووم ئەوە مال و مندال نیە ئەوە كە الله تعالى خێری ئەو كەسەی ویستوە ، مال و مندالیش هەیە كە حەزدەكەی لە مال دەرنەچیت .

## القبول في الأرض

: [٥] صحيح الجامع ١٧٠٤

الله تعالى وا لەو بەندەیە دەكا كەوا لەسەر زەویدا لەدلی موسلماناندا جێگای ببێتەوە بۆیە وتمان هەمووی خەلكی نا چونكە ئینسانی بە تەقوا و بەئیمان بەزۆری لە خەلكی منافق و كافرو یەهودی و نەصرا و موشریك جێگای نابێتەوە حەز دەكەن ئەو ئینسانە ئیمانداره نەمێنی ئەوەتا چەندەها پێغەمبەر كوژراوه پێغەمبەران باشترین كەسن یاخود چەندەها پیاو چاك و صالحین كوژراون چوار خەلیفەی هەبوو پێغەمبەر لەدوای خۆیی (صلی الله علیه وسلم) سێ یانی شەهید كرا . كەواتە لەدلی پیاو چاكاندا خۆشە ویستن.

بۆ نمونە ئەلێ كاكە وەزنی ئەم پیاوە چۆنە لەناو گەرەكەكەیدا ئەلێ هەمووی رقی لێ یەتی یاخود ئەلێ هەمووی خۆشی ئەوێی ، با سەیری ئەو هەمووە بكەین بزانین كێن ؟ بەچ پێوەرێك ئەو كەسەیان خۆش دەوێی ئەلێن ئەوەندەی حەز لەگۆرانی و مۆسیقایە ئەوە كەسێكی زۆر باشە ئەمە !! هەموومان خۆشمان ئەوێی ! ئەوەندەی حەز لە زینا و ئافرەت و تێكەلاوی ئارەق خواردنەوە گالتە و گەپ هەیە بۆیە خۆشمان دەوێی ئەمە قبول نیە لەسەر زەوی بەلكو ئەمە توورەی و غەزەبە .

بەس كاتێك ئەلێ فلان كەس ئەلێن الحمدلله زۆر رێك و پێكە دەست پاك و چاوپاك نمەی نابیستی لەگەرەكەكەدا ماشاء الله زەری بۆ كەس نیە ئیماندار نوێژی خۆی ئەكا مال و مندالی زۆر رێك و پێك . كەچی زۆر كەس هەیە ئەلێ ئەمە وشكە ئەمە چیە ئەوە ئەلێ ئینسانێكی كۆمەلایەتی نیە ئەمە كۆمەلایەتی ئەوەیە دەبی خیزانەكەت رووت بێ و رەشبەلك و شایی بكەیت و گۆرانی بلێت و تێكەلاو بی و خێزانت تێكەلی خەلكی بكەی بەدلی ئەم خەلكە ئەبێ لەگەل هەموومان هەموو بی ، ئەو ها نابێ بەم شێوەیە .

بۆیە ئەلێ ( قبول القلوب له بالمحبة والميل إليه والرضا عنه والثناء عليه )كەسانی پیاو چاك كەسانی لەالله ترس لێ رازین .

ئەبوو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) ئەفەرمووی :پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی ( إن الله إذا أحب عبداً دعا جبريل فقال إني أحب فلاناً فأحبه ) ئەگەر الله تعالى بەندەیەك لەبەندەكانی خۆش ویست (وتمان الله لەئاسمانە لەسەرووی عەرشەوەیە)دواتر جوبرائیل و مەلائیكەی أعلى و ئەوانیتر ئەمانە هەمووی لە ئاسمانن ئەمانە پێیان ئەوتری بەندە صالحەكان كە لەئاسمانن جا ئاگادارین لەئاسمان بەندەی الله هەیە وە لە زەویەكی بچوكی وەكو دەنكە نیسكێكە ئەم هەموو خەلكەش هەیە بەلام ئەم هەموو خەلكە چیە لەچاو ئەو هەموو مەلائیكە كە الله تعالى هەیەتی ئەفەرمووی هیچ ئاسمانێك نیە لەئاسمانەكان بستێك نابینێتەوە مەلائیكەی تێدا نەبێ ژمارەی ئەوان زۆر زۆرترە (**وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ**

إِلَّا هُوَ)[٦] تەنها الله ئەزانی جوندیەکانی چەندە . ئەلیٚ کاتیٚك الله تعالی بەندەیەك لە بەندەکانی سەر زەوی خۆش ویست بانگ لە جوبرائیل دەکا ( جبريل فقال إني أحب فلاناً فأحبه ) ناوی ئەبا من فلان کەسم خۆش ئەویٚی تۆش خۆشت بویٚی ئەی جوبرائیل (قال فيحبه جبريل )جوبرائیل ئەلیٚ مادەم تۆ خۆشت ئەویٚی منیش خۆشم ئەویٚی (ثم ينادي في السماء فيقول إن الله يحب فلاناً فأحبوه )جوبرائیل بانگ ئەکا لەئاسمانەکاندا ئەلیٚ ئەهلی ئاسمانەکان گویٚبگرن الله تعالی فلان کەسی خۆش دەویٚی ئیٚوەش خۆشتان بویٚی (فيحبه أهل السماء ) ئەهلی ئاسمان هەموویان خۆشیان دەوی بزانە ناوت هەیە ئاگاداربە هەموومان ناومان هەیە لەم ئاسمانە خراپ کارەکانیش ناویان هەیە لە ئاسمان (ثم يوضع له القبول في الأرض ) دواتر الله تعالی دلی خەلکی رائەکیٚشی و خۆشەویستی خەلکی بۆیی رادەکیٚشی  خەلکی لیٚ رازی دەبن وەك وتمان خەلکی باش ).[٧]

ئەبو هویرەیرە (رەزای خوای لیٚ بیٚ )دەفەرمووی : پیٚغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم فەرموویەتی :( وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ فَيَقُولُ إِنِّي أُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضْهُ قَالَ فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضُوهُ قَالَ فَيُبْغِضُونَهُ ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الْأَرْضِ)[٨] واتە :ئەگەر الله رقی لە بەندەیەبیٚ (ئەمەش یەکیٚکی ترە لە سیفەتەکانی الله  کە شایستەیە بەخۆی و نازانین چۆنە  ! ) ( دَعَا جِبْرِيلَ فَيَقُولُ إِنِّي أُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضْه ) الله تعالی دەفەرموویٚ : جوبرائیل من رقم لە فلان کەسە تۆش رقت لیٚ بیٚ (ئەی خاك بەسەر ئەو کەسەی الله و جوبرائیل و ئەهلی ئاسمان رقیان لیٚ بیٚ ئەهلی سەر زەوی هەمووی رقی لیٚ دەبیٚ  ) ( قَالَ فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ ) ئینجا جوبرائیل رقی لیٚ دەبیٚ (ئەلیٚ منیش رقم لیٚ یەتی مادەم تۆش رقت لیٚ یەتی ) ( ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ ) دوای بانگ لەئەهلی ئاسمانەکان ئەکا ( إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضُوهُ ) الله رقی لە فلان کەسە هەمووتان رقتان لیٚ بیٚ ( ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الْأَرْضِ ) دواتر لەسەر زەوی ولەلای موسلمانان و موحیدان ئەوانیش رقیان لیٚ دەبیٚ .

پرسیاریٚك ئەکەین : ئایا الله و جوبرائیل و مەلائیکەتەکان وئەهلی ئاسمان و زەوی و موسلمانەکان تۆی خۆش بویٚی باشتریٚکە یاخود ئەهلی فجور و فاسق و کافرانی سەرزەوی ؟! وە بەپیٚچەوانەشەوە ؟

[٦]:سورة المدثر اية :٣١
[٧]:رواه البخاري
[٨]:رواه مسلم

ئەمرۆ ئەگەر تۆ بێت و دەست بدەیتە ئیسلام دەست پاك و چاو پاك و رێك و پێك بیت ئەلێن نەخێر كاكە ئەوانە موسلمانن و خۆشتان نەوێی ئەمە خەتەرن و ترسناكن ئەمانە لەبەر ئەوەی چاوپاك و دەست پاكە زینا ناكا وعەرق ناخوا بەس ئەلێ الله خوامە ئەوە با رقمان لێ بێ خەلك ناوێرێی بچی بەلایدا ، بەلام ئەگەر دواێن پیس و جەرد و دز و پیاو خراپ بێ برۆ هەزار واستەی لەلا بكە دەستی ئەروا خەلك رێزی لێ دەگرن ، ئاگاداری ئەم حەدیسە بن و لەلای الله خۆتان خۆشە ویست بكەن لەلای ئەهلی ئاسمان ترسی ئەوەتان هەبێ الله رقی لێتان بێ ئەهلی ئاسمان رقی لێتان بێ .

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ ) دەفەرمووێی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی : (ما من عبد إلا وله صيت في السماء)[9] واتە : هیچ بەندەیەك نیە إلا دەنگۆی هەیە لە ئاسمان بەچاك یاخود بەخراپ باسی هەیە هەموو كەسێك هەمووومان باسمان هەیە .
ئایا ئەم دونیایە بەهەوەنتە ئەروا ! ؟ بەبێ مراقە بە بروا ؟! هیچ شارێك و ولاتێكتان بینیوە بەبێ چاودێرو مراقەبە بڕوا بەرێوە ئێستا ئەمرۆ خەلك لەماڵەكەی خۆشیدا ئەترسێت ئەلێ نەكا بەواستەی مۆبایلەكەم قسەكانم نەقل بكا بەواستەی قەمەر صناعی گوێبگرن لەخەلكا لەوە ئەترسێن بەس لە الله و مەلائیكەتەكانی الله ناترسێن كە لەسەرمانن و ئەینوسن ئەلێ إلا دەنگۆتان هەیە لە ئاسمان بەباش یاخود بەخراپ .
پاشان حەدیسەكەی تەواو ئەكا و ئەلێ (فإن كان صيته في السماء حسنا وضع في الأرض وإن كان صيته في السماء سيئا وضع في الأرض)[10] واتە : ئەگەر دەنگۆت باشبێ لە ئاسمان الله تعالی لەزەویشدا باشت بۆ ئەكا ئەگەر دەنگۆت خراپ بێ خراپت بۆ دەكا .

ئەبوزەر (رەزای خوای لێ بێ ) دەفەرمووێی (قال قيل لرسول الله صلى الله عليه وسلم " أرأيت الرجل يعمل العمل من الخير ويحمده الناس ( وفي رواية ويحبه الناس عليه ) قال تلك عاجل بشرى المؤمن)[11]واتە : وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ئەبینی پیاوێك كاری باشە ئەكا خەلك سوپاسی ئەكا خەلك پێ خۆشە خەلك دەست خۆشی لێ دەكا ئایا ئەمە دەچێتە قالبی ریا وسمعەوە ؟! پێغەمبەری

[9]: صحيح الجامع٥٧٣٢
[10]: صحيح الجامع٥٧٣٢
[11]: وروى مسلم (٢٦٤٢(

خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : نەخێر الله تعالى موژدە ئەدا بەهەمووکەسێك لەکاتی مردنیدا بەس ئەم موژدەی بۆ پێش خستووە ئەمە موژدەیە موژدە واتا ئەو خەلکش لیٚ رازییە وئەو خەلکش خۆشی ئەوێی کەدەست خۆشی لیٚ دەکەن چونکە ئەم کەسە لە ئەصلدا مەبەستی پیٚ ریئ وسمع نیە کە ئەو کەسە کاری باش دەکا خۆ خەلك پیٚ ناخۆش نیە ئەوەشی پیٚ ناخۆش بیٚ فیترەیەکی زۆر قەبیح و ناشرینی هەیە .

## إبتلاء

تاقیکردنەوە و تووشبون بەبەلا و موصیبەت لە کوشتن و نەخۆشی و نەبون ئەم حالەتانە .

ئەنەسی کوری مالك (ڕەزای خوای لێ بێ ) دەفەرموی : (إن عظم الجزاء مع عظم البلاء)[١٢] واتە : گەورەترین پاداشتی الله لەگەل گەورەترین نارەحەتیەکان و ناخۆشیەکانی زەویدایە بۆ بەندە موسلمانەکان ، چەندێك تووشی نارەحەتی ببیت لەدین و لەدونیادا لەجەست و مال و مندال دا الله تعالی ئەوەندە ئەجرت ئەداتەوە ،وە ( (وإن الله إذا أحب قوما ابتلاهم) ئەگەر الله قەومێکی خۆش ویست (ئاگاداربە کاتێك پیاوێك یاخود کەسێك تووشی ناخۆشیەك دەبێ ئەلێ خوایە تۆ بۆ رقت لەمن بوو ! خوایە من چیم کرد تۆ ئەوەت بەسەر من هێنا خوایە تۆ بۆ منت وا لێ کردبۆ کەسانیترت وا لێ نەکرد بۆکافرەکانت والێ نەکرد ئاخر تۆ نازانێ تۆ نەهاتووی دیراسەی دینەکەی خۆت بکەی ئەوەتا پێت ئەلێ ئەگەر الله بەندەیەکی خۆی خۆش ویست توشی بەلاو موصیبەتی ئەکا داوی ئەکا بەداوی نەخۆشی و مردن و کوشتن و بەلای زۆرترەوە بەنارەحەتیەکانی رۆژگار بەتایبەتی لەسەر دینەکەی (فمن رضی فله الرضا ومن سخط فله السخط)[١٣] هەر کەسێك رازی بێ بەو بەشەی الله ئەوە الله لێ رازییە هەرکەسێکیش رقی هەلسێ الله تعالی رقێ لێ هەلدەستێ تۆ تووشی بەلاکە دەبێ و الله رقیشی لێ هەلدەستی چارمان نیە ئێمە عەبدین ئەبێ بزانین کەوا الله خۆشی ئێمەی ویستووە الله چاکەی ئێمەی ویستوە کە توشی ئەوەی کردووین تۆش لەو حالەتەدا ئەلێ الله رازیم بەبەشت .

سەیرکە الله تعالی چی دەفەرمووێ کە زۆربەی زۆری خەلکی دەیلێتەوە بەبێ ئەوەی ماناکەشی بزانی (إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ)[١٤] ئەلی ئەگەر موصیبەتت بەسەردا هات چی بلێ واتا ئێمە بەندەی الله ین چیمان بەسەردا ئەهێنی با بهێنی بۆمان نیە قسە بکەین ئێمە بەندەی الله ین وە بۆلای ئەویش دەگەرێنەوە کێ هەیە ئەو مانای لەخەیالدا بێ لەو کاتەدا( **إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ**)[١٥] من بەندەی خەلك نیم من بەندەی الله م چیم بەسەر دەهێنی ئەوە مشیئەتی خۆیەتی من بۆ لای ئەو دەگەرێمەوە پاداشت و سزا هەر بۆ ئەوە ئەگەر رازیبم پاداشت هەیە ئەگەر نارازیبم سزا هەیە .

(فيبتليه بأنواع البلاء حتى يمحصه من الذنوب) ئەلێ الله تعالی ئەوەندە تووشی بەلای ئەکا هەتا لەگوناهەکانی پاکی دەکاتەوە .

[١٢]:صحيح الجامع :٢١١٠
[١٣]: صحيح الجامع :٢١١٠
[١٤]:سورة البقرة اية :١٥٦
[١٥]:سورة البقرة اية :١٥٦

بۆیه علما   یان ئەگەر تووشی بەلاو بوونایه ئەوەئەیانوت خاك بەسەرمان دیاره الله منی خۆش ناوێی ئەیەوێی هەروا بەلەش ساغی برۆمەوە بۆلای و لەوێی لێم بسێنێتەوە .

( وفرغ قلوبهم من الاشتغال بالدنيا غيرةً عليهم أن يقعوا فيما يضرهم في الآخرة ) الله حەز ناکا لە ئاخیرەتدا تووشی نارەحەتی و ناخۆشی ببن ئەلێ با لەدونیدا هەموو سزاکەی خۆیی وەربگرێی یاخود ئەو گوناهانەی کەوا کردوویانە بەهۆی ئەم بەلایانەوە با پاکی بکەمەوە بۆ ئەوەی بەبێ گوناه بێتەوە بۆلای من .

الله تعالی دەفەرمووی (وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ)[١٦] واته : لنبلونكم واتا (لنختبرنكم )ئێمە ئێوه تاقی دەکەینەوە هەتا بزانین کێ تێ دەکۆشێ لەپێناوی ئێمەدا کێ صەبر دەگرێی لەسەر ئازارەکان خۆ الله تعالی کاتێك نارەحەتیکت بەسەردا ئەهێنی خۆ خۆشی لەوە نابینی و بەتۆ خۆش حال بێ تاقیت دەکاتەوە تۆ ئینسانی دروست بووی تۆی دروست کردوە تاوەکو تۆ تووشی خۆشی و ناخۆشی بکا لەهەردوو حالەتدا دەبێ تۆ صابر و شاکر بی (وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ) واتا (نختبر أعمالکم )ئەبێ بزانین و تاقیتان بکەینەوە بزانین ئیشەکانتان چۆن ئەروا .

( الْفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ : يقول ذات ليلة وهو يقرأ سورة محمد ويبكي ويردد هذه الآية : ( ولنبلونكم حتى نعلم المجاهدين منكم والصابرين ونبلو أخباركم)[١٧] ئەم پیاوە بەرێزە دەگریا کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە نەك وەك ئێمە بەسەریدا برۆین و کە نازانین ماناکەشی چیە ! داواتان لێ ئەکەم کە قورئان دەخوێنن داوای ماناکەی بکەن هەر مەرۆن بەسەریدا ئەو ئایەتەی دەخویندەوە و ئەگریا ئەیوت (وجعل يقول : ونبلو أخباركم ، ويردد : وتبلو أخبارنا ! إن بلوت أخبارنا فضحتنا وهتكت أستارنا ، إنك إن بلوت أخبارنا أهلكتنا وعذبتنا ، ويبكي " .)[١٨]خوایه تاقی مان مەکەوە ئەگەر تاقیمان بکەیتەوە والله ئەدرۆێن و دەرناچین کێ هەیە لەتاقیکردنەوەدا بەزۆری دەرچوو بێت کێ هەیە ژنەکە ی و مال و مندالی مردبێ وتبێتی ( إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ)[١٩] دەی هەلسن کاکە باکفنی بکەین و نوێژی لەسەر بکەین با بچینەوە سەر ئیش و کارەکانمان و رازین بەوەی لەلایەن الله وە بۆمان هاتووە  ئەو قیژە و قارە لەکێ ئەبینن ! ئەمە إبتلا  و تاقیکردنەوەیە دەبێ صەبرت هەبێ لەسەری هەموو شتێك بروا لەگەلیدا ئەبێ بەصەبر لەگەلی برۆیت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) کاتێك کە کورەکەی مرد چاوی فرمێسکی لێوە

[١٦]:سورة محمد اية : ٣١
[١٧]: الكتب » حلية الأولياء لأبي نعيم «الْفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ
[١٨]: الكتب » حلية الأولياء لأبي نعيم «الْفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ
[١٩]:سورة البقرة اية :١٥٦

هات بەس هاوارو قیژە قیژی نەکرد وتیان ئەوە تۆش ئەگری فەرمووی ئەوە رەحمەتە مەنعی گریانی رەحمەت ناکرێی بەس ئەو قیژە و تەعزیەدانانە ئەو هەموو خیمە و عاقەیە هەمووشی بۆ خەلك و سمع و ریا یەسەرەرای نادروستیەکەی ئەمەی ناوێی الله تعالی بۆیە لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا کەم کەس دەردەچێ ئاگاداربن .

سەعد (رەزای خوای لێ بێ ) دەفەرمووی : بە پێغەمبەری خوام وت (صلی الله علیه وسلم) (أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاءً) کێ لەهەموو کەسێك زیاتر تووشی بەلا دەبێ (قَالَ : الأَنْبِيَاءُ) فەرمووی : لەپێش هخەموویانەوە پێغەمبەران ،بەقیسای ئێمە بێ دەبێ ئەوان لەخۆشترین ژیاندا بووبن بەس وانیە لەهەموو کەسێك زیاتر تووشی بەلا بوون صەلات و سەلامی الله یان لێ بێ (ثُّم الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ) دوای کێ باشتر بێ کێ باشتر بێ کێ لەدینەکەیدا باشتر بێ لەهەموو کەس زیاتر بەلا ئەبینی (فَيُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ ) هەموو کەسێك بەپێ دینەکەی خۆیی تاقیدەکرێتەوە (فَإِنْ كَانَ دِينُهُ صُلْبًا اشْتَدَّ بَلاؤُهُ ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ ) دینەکەت چەند توند و تۆل و باشبێ (صلب واتا توند و تۆل و قەولی ئەلێن کاکە دین بە توندی مەگەرە بەفشە بیگرە نابێ بەلکو ئەبێ بە توند و تۆلی و قەیمیەوە بیگری هەرکەسێك ئەگەر لەدائیرە ئەگەر فەرمانبەر بێت ئیشەکەی بە فشە بکا ناتوانی ئەی بۆ دینی الله بەفشە بگیری ! )ئەگەر دینەکەی بە توند و تۆلی وقایمەیەوە گرت ئالەو کاتەدا تاقیکردنەوەی و نارەحەتیەکانی الله زۆر دێنە خوارەوە (فَمَا يَبْرَحُ الْبَلاءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ مَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ) [20] هەتا ئەو کابرایە ئەوەندە بەلایەی بۆ دێی ئەوەندەی بۆدێی هیچ گوناهی پێوە نامێنی ئەچێتەوە بۆلای الله بە پاکی . بەپاکی بچینەوە بۆلای الله باشترە یان بەچەندەها کۆلە گوناه ، وە ئێمە لێرەدا داوا لە الله دەکەین کەوا بەرەحمەتی خۆیی پاکمان بکاتەوە توشی ئەزیەت و ئازار و نارەحەتیمان مەکە دوعا دەکەین و بۆمان هەیە دوعا بکەین بەس کە الله بەسەریدا باراندی لەنارەحەتیەکان سوپاسی بکە .

ئەبو سەعید دەفەرموێی (دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم، وَهُوَ يُوعَكُ.) یوعك واتا (وهو محمون)ئەلی چوم بۆ لای پێغەمبەری خوا تایەکی زۆر گەرمی لێ هاتبوو (صلی الله علیه وسلم) (فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَيْهِ. فَوَجَدْتُ حَرَّةُ بَيْنَ يَدَيَّ، فَوْقَ اللِّحَافِ) کە دەستم خستە سەری لەژیر لیفەکەی گەرمای لاشەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەر لاشەم ئەکەوت ئەوەندە تایەکی بەهێزی لێ هاتبوو (فَقُلْتُ: يَا

[20]: روى الترمذي (٢٣٩٨(

رَسُولَ اللهِ! مَاَشَدَّهَا عَلَيْكَ! ) وتم ئەی پێغەمبەری خوا ((يُضَعَّفُ لَنَا الْبَلاَءُ وَيُضَعَّفُ لَنَا الأَجْرُ) بەلامان بۆ چەند قات دەکرێتەوە بۆئەوەی ئەجرمان بۆ چەند قات بکرێتەوە (قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاً) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کی لە خەلکی زیاتر نارەحەتی و بەلای بۆ دێتە خواری ؟ (قَالَ (الأَنبَياءُ) وتی پێغەمبەران (قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ (ثُمَّ الصَّالِحُونَ. )وتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوای ئەوان کیْ وتی : پیاو چاکان (وَإِنْ كَانَ أَحَدُهُمْ لَيَفْرَحُ بِالْبَلاَءِ كَمَا يَفْرَحُ أَحَدُكُمْ بِالرَّخَاءِ) ئالەو پێغەمبەر و پیاو چاکانە ئەوەندە خۆشحالن بەو بەلایانە بۆیان دێی ئێوە چەند خۆشحالن بەوەی توشی خۆشیەك دەبن کاتێك کەتۆ خانوێك دەکرێی یاخود ژن دەهێنی ئەگەر قازانجێکی باش بکەی بەس ئەمان بەپێچەوانەوەی بەناخۆشیەکان دلخۆش دەبن .

## الموت على عمل صالح

واتا عاقیبەت خێرت دەکا لەسەر کارێك و عیبادەتێکی باش تۆ ئەمرێنێت   واتا لەو کاتەی کە تۆ ئەمرێی لە عیبادەتێکدا ئەمریی جا هەر عیبادەتێك بیْ بۆ الله یان لە زکرێکدا نەك الله پەنامان بدا لە زینا و ئارەق خۆریی وخراپەکاری کوفرو بیدیندا .

ئینسانی موسلمان کە لە رۆژانی جومعەدا ئەمریی ئەیپاریزی لە فیتنەی  گۆر .

(عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَمِقِ –رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ– ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَ سَلَّمَ : إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا عَسَّلَهُ .؛ قَالُوا : يَا رَسُولَ اللهِ ، وَ مَا عَسَّلُهُ ؟ ، قَالَ : يَفْتَحُ لَهُ عَمَلاً صَالِحًا بَيْنَ يَدَيْ مَوْتِه ، حَتَّى يَرْضَى عَنْهُ مَنْ حَوْلُهُ)[٢١] واته عمری کوری حەمەق (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ ) دەفەرمووی پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : ئەگەر الله بەندەیەکی خۆش بویٚت الله تعالی باسی باشەی دەخاتە ناو خەلکی وتیان واتای چی کە باسی باشەی دەخاتە ناو خەلکی !؟ فەرمووی : الله تعالی مۆفەقی دەکا لەسەر عەمەلیٚکی باش لەسەر ئەو عیبادەتە ئەمریٚ لەپیٚش دەستی ڕۆح هەرکیٚشانەرەکەدا بینیومانە الحمدلله زۆرکەس لەکاتی مردندا لەسوجەدا بوون یاخود لەجیهاد دا بوون یان لەزیکردا .

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

## نیشانەکانی خۆشەویستنی بەندەکان بۆ الله تعالی

### پیٚشەکی :

بسم الله والصلاة والسلام على من لا نبي بعده ، سوپاسی الله تعالی دەکەین کەوا یارمەتی داین بۆ ئەوەی بتوانین دەست بکەین بە کۆکردنەوەی چەند وتاریٚکی مامۆستای خۆشەویستمان (کامەران کەریم ) کەوا باس لە نیشانەکانی خۆشویستنی بەندەکان دەکا بۆ الله تعالی کەوا تۆی بەندە کەوا بانگەشەی

[٢١]: أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ فِي "المُسْنَدِ" (٥/٢١٩٩٩)

خۆشویستنی الله تعالی دەکەی ئایە ئەم نیشانانەت تێدا بەرجەستە بووە یاخود خۆشەویستیەکەت تەنها بانگەشەیەکە و تەنها بەزمان بانگەشەی خۆشویستنی الله تعالی دەکەی.!

گرینگی زانینی نیشانەکانی خۆشویستنی الله تعالی لەلایەن بەندەکانیەوە دەبێتە هۆکاری زیاتر بەرە و پێشچونی ئەم بەندەیە لە الله تعالی و زیاتر پەرە بەو عیبادەت و کارو کردەو وتانەی بدا کەوا هۆکاربووە بۆ ئەوەی الله تعالی خۆش بووێی چونکە بەزانینی نیشانەکانی ئینسانەکان تارادەیەك لەگەل دلیدا ئارامی دەبێت کاتێك دەزانی بەراستی الله تعالی خۆش دەوێی ئیتر بەهۆی ئەم نیشانانەوەی هۆکاری باشتر و شەرعیتر ئەگرێتە بەر بۆ ئەوەی زیاتر بتوانی الله تعالی خۆش بوێی لەژیانیدا بۆ ئەوەی ئەم خۆش ویستنەی الله تعالی لەلایەن ئەم ئینسانەوە وای لیّ بکا الله تعالی ئەویشی خۆش بووێی ، الله تعالی دەفەرمووی (**قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ**)[٢٢] ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم پێیان بلیّ ئەگەر بەراستی ئەوانە الله تعالی یان خۆش دەوێی ئەوا با شوێنی تۆ بکەن ، جا بەراستی خۆش ویستنی الله تعالی و بە شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەبیّ نەك تەنها بە دەم بوترێی . بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو رد)[٢٣] هەرکەسێك کار و کردەوەیەك بکا فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبیّ ئەوە رەد ئەکرێتەوە لەخاوەنەکەی وەرناگیرێت .

حەسەنی بەصری و کەسانیتریش لە پێشنین وتویانە : هەندیّ کەس وتویانە الله مان خۆش دەوێی ، الله تعالی تاقی کردونەتەوە بەم ئایەتە کە دەفەرمووی (**قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ**)[٢٤]واتا دەبیّ شوێنی پێغەمبەرەکەی بکەون نەك تەنها بەدەم باسی خۆشەویستی الله تعالی بکەی بۆیەش ئێمەش باسی نیشانەکانی دەکەین بە بەلگەی قورئان و سونە .

(واعلم أنَّ المحبَّة يدَّعيها كلُّ أحد، وما أسهل الدعوى وما أعزّ المعنى، فلا ينبغي أن يغترَّ الإنسان بتلبيس الشيطان وخدع النفس مهما ادَّعت محبَّة الله تعالى، ما لم يمتحنها بالعلامات، ولم يطالبها بالبراهين) واتا :بزانە خۆش ویستنی الله تعالی هەموو کەسێك بانگەشی بۆ ئەکا ئێستا بزانە لەهەرکەسێك بپرسن خوات خۆش ئەوێی ئەلیّ بەلی! ئەمە بانگەشەیە بەس ئەلیّ ئەبیّ تاقیی بکەیتەوە بەنیشانەکانی بزانی بەراستی

[٢٢]:سورة ال عمران اية : ٣١
[٢٣]:رواه مسلم
[٢٤]:إبن أبي حاتم :٢٠٥|٢

وایە (وما أسهل الدعوی وما أعزّ المعنی) بانگەشەکە کردنەکە زۆر ئاسانە بەلام بەراستی خۆشە ویستی و مەحیبەت زۆرگرانە خۆشەویستی الله ئایە هەمە یاخود نیمە زۆر زۆر گرانە نابێ ئینسان هەلبەخەلەتێ بەوەی شەیطان هەلی بخەلەتێنی ، شەیطان هەلمان دەخەلەتێنی بەوەی بەلێ تۆ الله ت خۆش دەوێی موسلمانیتی وسەیربکە خەلك ئاوا دەکا و تۆش واناکەی ! لەبەر ئەوە پێویستە ئەو نیشانانە سەیربکەین بزانی لەخۆتدا هەیە کەوا تۆ الله ت خۆش دەوێی بۆئەوەی بزانی ئایە هەر بەراستی تۆ الله ت خۆش دەوێی یاخود هەر بەراستی تەنها وەکو خەلکیتر تەنها بانگەشەکردنی خۆشەویستیە بەبێ ئەوەی هیچ یەکێك لەو نیشانە لەتۆ دا هەبێ جا ئێستا باسی نیشانەکانی خۆش ویستی بەندە بۆ الله دەکەین بزانین بەچ شتێك ئەزانین کەوا بەندە الله ی خۆش دەوێی . بۆئەوەی کاتێك نیشانەکانمان ناسی زیاتر لە ژیانی خۆماندا پەرەی پێ بدەین و جێ بەجێ بکەین لەکارەکانی رۆژانەماندا .

(وصلی الله علی نبینا محمد وعلی آله وصحبه أجمعین)

## حب لقاء الله تعالی في الجنة

ئەو کەسەی أدعای خۆشەویستی الله دەکا ئەوەی زۆر زۆر پێ خۆش بێ کە بەدیداری پەروەردگاری بگا لە بەهەشت هەول بدا و شەو ورۆژ لەو هەولدانە بێ بۆئەوەی بەو دیدارە بگا .

تۆ بە مردن بە دیداری الله دەگەی خۆ لەدونیادا بە دیداری الله ناگەی کەس لە دونیادا الله نابینی ئەمە رەئی صەحیحە لەلای ئەهلی سونە و جماعە هەتا پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەدونیادا الله تعالی نەبینیوە کاتێکیش بەرزکرایەوە پەردەیەك لەنێوانیاندا هەبوە .

کەواتە مردنێك هەیە لە بەردەماندا  دەبێ تۆ ئەو مردنەت خۆش بوێی کێ مردنی خۆش ئەوێی ئەوە گرینگە ! سەیر بکە پێش بینینی الله مردن هەیە .

(فإنه لا يتصور أن يحب القلب محبوباً إلا ويحب لقاءه ومشاهدته)تەصەورناکرێی هەرکەسێك کەسێکی خۆش بوێی إلا حەز دەکا بەدیداری شاد بێ ، کەستان هەیە خۆشەویسترینی کەسی لەدونیادا لێتان دابڕێی حەز ناکەن زووتر ببینن ! عەقلیەتی ئینسان وایە حەزدەکا خۆشەویستەکەی زووتر ببنێ ، جا گەورەترین خۆشەویستی ئێمە الله یە ئایا تۆ هەول ئەدەی ببینی !؟ خۆتت بۆ ئامادەکردوە ؟!

(وإذا علم أنه لا وصول إلا بارتحال من الدنيا ومفارقتها بالموت فينبغی ان يكون محبا للموت غير فار منه) ئێ تۆش یەقینت هەیە کە ئەو الله یە نابینی إلا ئەبێ لەدەرگای ئەو مردنە بچیتە ئەو دیەوە کەواتە ئەبێ مردنت خۆش بوێی .

(فإن المحب لايثقل عليه السفر عن وطنه إلي مستقر محبوبه ليتنعم بمشاهدته)ئەگەر کەسێك کەسێکی خۆش ویست ئەگەر لەو پەری دوبناش بێ خۆیی بۆ ئامادە ئەکات و سەفەری بۆ ئەکا. ئەگەر کورێکت غەریب بێت یان ناسیاوێکت یاخود خزمێکت لەشوێنێك بێ هەولبدەی ببینی چۆن خۆتی بۆ ئامادە ئەکەی چەند حەز دەکەی ببینی !  یاخود ئەگەر کەسێك لەدەرەوە بێ خزم و کەس و کارەکەی لەناوەوە بێ هەردەم حەز دەکا خێرا بێت و بیان بینێت خۆی بۆ ئامادە دەکا .

کەواتە لەلای گران و قورس نیە سەفەری بۆ بکا نابێ موسلمان و بروادار لەلای گران بێ  کە هەول بدا سەفەر بکا بۆلای الله تعالی سەفەرەکەشمان مردنە .

(والموت مفتاح  اللقاء وباب الدخول إلى المشاهدة)مردنیش کیلی ئەو دیدارەیە . کە بە پەروەردگار بگەی .

باشە کە ئێمە ئەمرین چی ئەبێ ؟! قیژە و هاوار و خۆزگە نەرۆیشتایە یان ئەلێن خۆزەگە نەرۆیشتایە بۆلای خوا ! لەلای ئێمە بوایە ئەروا ئەبێ هەمووومان برۆین (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)[٢٥] .

لەعوبادەی کوری صامەتەوە (رەزای خوای لێ بێ ) دەفەرموێی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (فقال النبى صلى الله عليه وسلم : { من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه)[٢٦] واتە : هەرکەسێك خۆشحال بێ بەدیداری الله و زۆری پێ خۆش بێ بەدیدارای الله بگا الله تعالی ش پێ خۆشە زوو ئەوکەسە بێت بۆ لای ، وە هەرکەسێك رقی لەدیداری الله بێ الله تعالی رقیەتی بێت بۆ لای .

[٢٥]:سورة البقرة اية : ١٥٦
[٢٦]: رواه البخاري ومسلم

با ورد بینەوە لە حەدیسەکە لەوانەیە بەهەرکەسێك بلیٚ بلێت من دیداری الله تعالی م پیٚ خۆشە علمط یان چۆن سەیری ئەم حەدیسە دەکەن ! ئەلێن (وقال بعض العلماء مطیع لله مستأنس من ربە فهو یحب القاء الله والله یحب الیقاءە)ئەوکەسەی کەوا حەزبکا الله ببینی هەول ئەدا لەزوترین کاتدا بمرێت و بگرێتەوە بۆلای الله الله تعالی ش زۆر پیٚ خۆشە ئەوکەسە بگرێتەوە بۆلای ، وە ئەوکەسەی .( والعاصي مستوعیشم بینه وبین الله وحشة ذنب فهو یکره القاء ربە ولابد منه)بەلام تاوانبار حەزناکا بیبینی چونکە بەکۆلی تاوانەوە ئەگەرێتەوەی بەردەمی .

لێرەدا نمونەیەکی دونیاوی ئەهێنینەوە : ئەگەر سەرۆکێك لەدونیادا بینرێن بۆلای بابێت بۆلام ئەگەر تۆ لەو کەسانە بی کەوا هیچ مخالەفەیەکت نیە هیچ کێشەیەکت نیە هیچ موشکیلەیەکت نیە سەرۆکەکەشت خۆش دەوێی لەبەر ئەوەی ئینسانێکی بەتەقەوا و ئیمانداره ئەویش تۆی خۆش دەوێی لەبەر ئەوەی بەتەقوای خوا خواتە داوات بکا تاوەکو بچیت بۆلای ،ئەی ئەگەر سەرپێچی کەر بووبێتی مخالەفاتت هەبیٚ و دزبی یاخود قۆلبربیت پیاو کوژبیت بەناحەق خراپکاربیت و کەس لێت رازی نەبیٚ کە ئەتنێرن بەدواتا پێت خۆشە ! لەدلیی خۆتدا ئەلیٚ بەخوا حەتمەن شتێك بووە ! ئەوەیە تۆ پێت خۆش نیە بچیت بۆ دیداری ئەویش پیٚ خۆش نیە تۆ ببینی کاتیٚ ئەو سەرۆکە ئەنێرێت بەدواتا پیٚ خۆش نیە بت بینی ئەیەوێی تۆلەت لیٚ بکاتەوە .

الله تعالی کاتێك ملك الموت ئەنێرێی بۆلای تۆ ئادەی رۆحەکەیم بۆ بهێنن ئەگەر دەست پاك و ئیمان پاك و دەم پاك بی حەزدەکەی زوو بچیتەوە بۆلای الله تعالی ، تخوا بەس بەمن بلێن ئەم دونیایە چیە !؟بەس بەمن بلێن خۆشی ئەم دونیایە لەچی دایە ! ئادەی پێم بلێن هەتاکەی تۆ بژیت شەو و رۆژ هەموو دونیایە ، ئەخەویی هەلدەستیتەوە نیوەرۆیە عصره مەغریبە عیشایە بخەوە و هەلسەوە هەرئەوەندەیە هەموو ژیانت بەم شێوەیە نیە ئەی ! بخۆ و بخەوە هەتا کەی دە سال بیست پەنجا شەست حەفتا نەوت سەد چەند ! !هەر ئەو شەو و رۆژەیە چ خۆشیەکی تێدایە ئەم دونیایە ، تۆ وەرە جیاوازیەك لەنێوان ئەم دونیا بکە لەگەل قیامەت خواردنەکەت هەر بەنارەحەتی پەیایی ئەکەی بەنارەحەتی دەیخۆیی و بەنارەحەتی ئەچێتە خوارەو و بەنارەحەتی ئەچێتە دەرەوە چەند سکچوون و نارەحەتی و زەغت و سوکرەی و نارەحەتیتان هەیە ئەمە خۆشە ! خواردنەکەی بۆگەنی ئەبیٚ و نارەحەت ئەبی ئەبیٚ بیپارێزی˝! لەویدا شتی وا نیە و نارەحەت نابی لێرە ئەمریت و لەوێدا نامریت لێرە نەخۆش ئەبیٚ لەوێی نەخۆش نابی لێرە قسەی ناخۆش ئەبیستی لێرە نابیستی ئەمە کەی دونیایە هەمووی بەنارەحەتی و بەزەعەمەت کێشانە ئەو

كەسەی بەدونیا دلی خۆش بێ حاشا لەرووتان زۆر بێ عقلە . عقلی نیە ئەزانن عاقل واتای چی ئەبێ ئیوە عاقل و زیرەکی لێك جیا بکەنەوە :

عاقل : ئەوەیە کە ئەتگرێتەوە لەکاری خراپە .بەس زۆر کەسمان هەیە زیرەکن لەکار و باری دونیا بەس خۆیان لەشتی خراپە ناگرنەوە ئێستا ئەوروپا و ئەمریکا زیرەکە بەلام عاقل نیە (وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ)[٢٧] ئەگەر گوێمان لە قورئان بگرتایە و بەقسەمان بکردایە عاقل بووینایە خۆمان پێ بگرتایەتەوە ئەوە لە ئەصحابی دۆراو وسەعیرنەدەبووین .کەواتە عاقل ئەو دونیایەی پێ خۆش نیە .

نیهێنی حەدیسەکەی لەمەدایە کەوا ئینسانی تاوانبار حەزناکا بگەرێتەوە بۆلای الله تعالی کێتان ئێستاکە لەخۆی ئەمینە بەتەقوا و تاعەتێکی چاك و پاك و رێك وپێك سەیری کێشانی چاك و خراپەکانی کردوە چاکەکانی زۆر زۆرترە لەخراپەکانی حەز دەکا بچێتەوە بۆ لا ی الله ئەوە ئەو کەسە الله پێ خۆشە بچێ بۆ لای کێش حەزناکا دیارە شتێك هەیە وادیارە لەخۆی ئەمین نیە دیارە رابردووی شتێکی تێدایە با خۆی چاك بکا بابەتەوبەیەك بابەگەرانەوە بۆلای الله تعالی بگەرێتەوە و تەوبە بکا لەرابردووی چونکە رابردوو ناگەرێتەوە داهاتووش هێشتان نەهاتووە کات ئەوکاتەیە کەتۆ تێدایی ژیانت ئەو حالەیە کەلەئێستادا تۆ تێدیت بەچیەوە بەسەری ئەبەین لە چاخانەکان و کافتریاکان بەچەندین کات بەسەردەبن و کاتی تێدا بەسەر دەبن بەس تاقەتی نیە نیو سەعات راوەستێ لە تەراویحەکە یاخود نوێژەکەدا تخوا ئەوە خۆ ئامادەکردنە بۆ الله ! یاخود خۆ ئامادە کردن بۆ الله لە مزگەوتەکانی الله دەبێ ، دوای عیشا لە جیاتی تەراویح و شەونوێژ بەم شەوە کورتە چەند سەعاتێکە لەجیاتی لەپێناوی الله و موناجاتی الله بیباتە سەر دۆمینە و قورمار و چی و چی ! والله ئەوە درۆیە تۆ بلێ الله م خۆش دەوێی ئەوە الله خۆشە ویستی نیە ئەی باشە لەوکاتەدا الله بتمرێنی چی دەکەی لەسەر مێز و کورسی تاولەکە و دۆمینەکە مسلسەکەت تخوا الله تۆی خۆش دەوێی ! نەوالله.! بەرێزەکانم دونیا هیچ نیە بۆ ئەوە دروست نەکراوی ،.

وە ئەلێ(وهذا لا ينافي كراهة الموت) جا لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ ئایا مردن خۆشە ؟! ئەو هەناسەت بچرێت و لوت و دەمت هەناسەی نەیەت خۆشە !؟

ئەلێ نەخێر ئەوە خۆش نیە مەبەستەکە لێرەدا لە غەرغەرەی مرندا نیە لەودیویەتی لەدەرگاکە هەر ئەوەندە رەت بوی ! بۆنمونە : عەمەلیاتێك ئەکرێی ئایە ئەم عەمەلیاتە بێ نارەحەتی ئەبێ نەخێر بەلام لەدوای ئەو عەمەلیاتە دکتۆر پێت ئەلێ ئەو شوێنەی کەوا عەمەلیاتی بۆ ئەکەی چاك ئەبێتەوە تۆ پێت

[٢٧]:سورة الملك اية :١٠

خۆش نیە بچیتە بەردەمی خۆ عەمەلیات خۆش نیە بەس هەر دەبێ بیکەیت بەس دوایەکەی خۆشە کە رزگارت ئەبێ ئەوەیە مەسەلەکە .

(وهذا لا ينافي كراهة الموت فإن المؤمن يكره الموت ، ولقاء الله بعد الموت ) موسلمان مردنی پێ ناخۆشە بەس لیقای الله لەدوای مردنە .

(وفى السلف من أحب الموت . ) هەشبووە لەرابردووان لەپێشینەکانی ئەم ئومەتە مردنی پێ خۆشبووە ،( ومنهم من كرهه) وەتێشی دا هەبووە مردنی پێ ناخۆش بوە .( إما اليضاع المحبته لكونها مشوبه بحب شيء من الدنيا ) ئەلێ هەرکەسێك ئەوەی پێ خۆش نەبێ کە بمرێت إلا شتێك هەیە یان خۆشەویستی بۆ الله دەرەجەی کەمە چونکە خۆش ویستنی الله بەدەرجەیە ئیمانیش دەرەجاتی هەیە ئیمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەل ئیمانی ئەبو بکر وەك یەك نیە ئەبو بکر لەگەل عومەر وەك یەك نیە صەحابە وەك تابعین وەك یەك نیە ئەوان وەك ئێمە وەك یەك نین دەرەجەی ئەوان زیاترە خۆشەویستیان بۆ الله گەلێك لەئێمە زیاتر بووە ، جا ئەگەر دەرەجەی خۆشەویستنەکەت بۆ الله کەم بوو ئەوا حەز کردن بە دیداری الله ش کەم ئەبێتەوە .

(لأنه يرى ذنوبه فيحب أن يبقى ليتوب) یاخود هەیە ئێستا پێ دەلێت مردنت پێ خۆشە ئەلێ نەبەخوا ئەلێ بۆ ئەلێ رابردووم ئەوەندە ناشرینە حەزناکەم بگەرێمەوە بەم شێوەیە نەك لەبەر ئەوەی پێم خۆش نیە بگەرێمەوە بۆلای الله حەزدەکەم تەوبە بکەم و بگەرێمەوە . دەخۆتی بۆ ئامادە بکە زوو خۆت نەجات بدە لەو گوناهانە .

(ومنهم من يرى نفسه فى ابتداء مقام المحبة ، فيكره عجلة الموت قبل أن يستعد للقاء الله تعالى ) هەشە تازە خەریکە لەدین و ئیمان تێدەگا ئەلێ کاکە من رابردووەکم هەبوە دین و ئیمانەکانم تازەیە لە سەرەتایی خۆشەویستی الله م حەز دەکەم دەرەجەکەم زیاد بێ ئینجا بگەرێمەوە بۆلای الله، ئەلێ ئەمە (وهذا كمحب يصله الخبر بقدم حبيبه عليه ، فيحب أن بتأخر قدومه ساعة ليهييء له داره ويعدل له أسبابه ، فيلقاه كما يهواه : فارغ القلب عن الشوغل) ئەلی ئەوە کەسێکە ئەیەوێی خۆشەویستەکی خۆیی ببێنی بەلام خۆی ئامادە نەکردوە بۆیی ،واتا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەنایەوێی خۆشەویستەکەی ببینی بەلام خۆی ئامادە نەکردوە بۆی .، بۆنمونە میوانێکت دێت خۆشەویستە زۆر حەزدەکا بێتە مالەوەت بەلام تۆ خۆت ئامادە نەکردوە ئەلێ بێت چی بدەم پێی خۆزگە زووتر وەلامی بدابام خۆیی ئامادە نەکردوە جارێی ، جا خۆی ئامادە ئەکا تاوەکو بەوشێوەیە الله تعالى لێ رازی بێ وە بیبینێ .

بزانن کەوا جێهێشتنی خۆشەویست زۆر زۆر زەحمەتە ئەگەر خۆشەویستێکت هەبێ بەجێ بهێلیت زۆر زۆر زەحمەتە ، جا هەمووتان سەرنج بدەن دونیا یەکێکە لەوشتانەی کەوا لەدلی ئینسانەکان دایە بەداخەوە لەزۆربەی زۆری دلەکاندا لەجیاتی الله دونیای تێدایە ، ئەم کەسە ئەگەر لەدلیدا دونیا هەبێ و دونیاکەش زۆر خۆشەویست بێ پێ خۆشە بەجێ بهێلێ ؟! دەفتەرە دۆلارەکانتان و مالەکانتان و زەراعەتەکانتان ئیتر لەپاشاکان هەتا کۆتا کەس کە شتێکی هەبێ پێ خۆشە بەجێ بهێلێ ؟! نەخێر حەزناکا ئالەم حالەتەدا پێت خۆش نیە بمریت و لیقای الله ببینی .

کەواتە نابێ بهلێت کە دونیا لەدلتدا هێلانە بکا ئەو دلە یەك کەس دەبێ تێدا بێت ئەویش الله تعالی یە . ئەگەر الله تێدا نەبوو یاخود الله و شتیتری تێدا بوو ئەوشتەت دا بەسەرالله دا ئەوکاتە پێت خۆش نیە الله تعالی ببینی کەواتە دلتان خالی کەن بۆ الله تعالی .

(فیکون قدمك بالموت علی ماتکره) کەواتە کاتێك تۆ ئەمریت و ئەچیت بۆلای الله تعالی هەست دەکەی کە وادەزانی مەبن مەمرینە خۆشەویستەکانم بەجێهێشتووە لەدواوە نامەوی ئەویتر ببینم وای لێ دێ.

( وفراق کلمه تحبه وکل من فارق محببا کان أذاه في فراق بقدر حبه لو أنسبی)چەنێك شتێکت خۆش ویست بەجێهشت و بەجێهلانی ئەوشتە بەقەدەر ئەوەندەیە نارەحەتیەکەی ئەگەر الله لەلات لەهەموو کەسێك و شتێك خۆشەویستر بێ ئێستا لەدلتدا نارەحەتترین شت ئەوەیە کەتۆ الله نابینی حەز دەکەی بچیتەوە بۆلای ، بەلام ئەگەر الله نەبێ دونیا بی یان شتێك بێ یان مردوێك بێ بۆیە ئەلێ شەریك پەیا مەکە بۆ الله کەس حەدی نیە بگاتە ئاستی الله تعالی لەو خۆشەویستیەدا وەلامم بدەنەوە کەس ئەتوانێ بلێ لە الله خۆشەویستر هەیە ئەگەر وتیبەلێ ئەگەر بەزمانیش نەیلێ لەواقیعی حالیدا کەسێکیتری تێدابوو ئەوە شەریکی بۆ الله بریاداوە ئەو کەسەی کردوە بەشەریکی الله.

شەریك هەر ئەوە نیە بلێ ئەو کەسە لەگەل الله ئەرز و ئاسمانی دروست کردوە ئەوە راستە شەریکە بەلام شەریکێکی تر هەیە لەخۆشەویستیدا (وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ)[٢٨] الله تعالی دەفەرموێ بروادارن لەهەموو کەسێك و شتێك زیاتر الله یان خۆشتر دەوێ . ئایا ئێمە واین ! ؟ هەر کەس خۆی تاقی بکاتەوە .

[٢٨]:سورة البقرة اية :١٦٥

-------------------------------------------------------------------------------------

## موناجات كردن

(أن يكون أنسه بالخلوة ومناجاة الله تعالى وتلاوة الكتابه)يەكێك لەنیشانەكان بەتەنهایی و موناجات كردنە لەگەڵ الله تعالی و خویندنی كیتابەكەیەتی لەشەودا .

ئەلێ ئەگەر تۆ لە شەو ورۆژێكدا خۆت خالی كرد و لەگەڵ الله دا قسەت كرد ،ئێستا تۆ سەیری پێغەمبەری خوا بكەن (صلى الله عليه وسلم) پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر ئەلی : خالی بوون لەلای الله تعالی لەلا خۆشەویست كرابوو ئەرۆیشت و ماڵەوە و مەككەی بەجێ ئەهێشت ئەچوو بۆ ئەشكەوتی حەرا لەوێی ئەمایەوە چل رۆژ و سی رۆژ و ئەمایەوە بەتاقی تەنها . تۆ بیری لێ بكەوە لەسەر شاخێك ئەوانشی چوون بینیویانە هەمووی جێگەی یەك نەفەری تێدا ئەبێتەوە ئەشكەوتەكە شوێنێكی تەسكە لەوێدا شەو رۆژ دەمایەوە مارە و دووپشك نەبوونیە و برسیەتیە شتێكی كەمی لەگەڵ خۆیدا ئەبرد و لەزەتی ئەبرد لەگەڵ الله بووندا دواتریش كە بوو بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم حاڵەتەی نەما بروات بۆ ئەشكەوت

یانی لەحەدیسێکدا نەهاتوە لەدوای ئەوەی بوو بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بیست و سێ سال پێغەمبەرایەتی کرد جارێکیتر نەچوە ئەشکەوتەوە بۆ خەلوە کردن بەلکو نوێژی ئەکرد ئەو خەلوەیە نوێژەکە جێگەی گرتەوە شەو هەل دەستا و قاچەکانی شەقی ئەبرد . کێ مان سەعاتێك وەستاوە لەشەودا ؟! لەتەراویحەکاندا چەند ئایەتێك ئەخوێنیتەوە ئەلێن زۆرە کاکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەقەرە و ئالی عمرانی دەخوێند لەیەك رکەعات دا صەحابە لە (الة القدر)لەپاش عیشاوە دەستی پێ بەردەوام بوو تا نزیك بانگ ئەترساین کەوا پارشێوەکەمان بچێ بەس لەنوێژدا بووین ،ئێستا نیو سەعاتە ئەلێن نیو سەعات !! ئەلێن زۆرە تخوا ئەوە موناجاتە ئەوە خۆش حالیە بەموناجاتی الله تعالی لەلایەنی تۆوە ئەی تخوا ئەگەر بۆ بەنزینەکەت ئەگەر دەسەعات بێ راناوەستی بۆیی ! والله بەنزینەکە خۆشەویسترێکە لە الله هەمووی وایە کەس نەلێت وانیە مەگەر ئەوانەی ئیمانداری راستەقینەن ،ئەگەر ئێستا بلێ هەر مالەو دوو وەرەقەیان دەدەینی دوو سەعات لەبەر دەم ئەم خۆرە راوەستن والله رادەوەستن و زووتریش دەچن دەلێن با بەبەرمان بکەوێت کەواتە دونیاکە خۆشەویسترێکە لەلات لە الله ئەمە راستیە با خۆمان هەلنەخەلەتێنین و خۆمان چاك بکەین .

خۆشەویستی الله چۆن وا دەبێ کوا خۆشەویستی الله الله تعالی دەفەرمووی (إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا)[٢٩] الله بۆیە دیفاعمان لێ ناکا چونکە ئیمانەکەمان ئەو ئیمانە نیە .

ئەمە بەحەق وەربگرن و بیخەنە ناو دلتانەوە ئەلێ ئەبێ ئەوکەسە زۆر خۆشحالبێ بە موناجات و خەلەوە کردن لەگەل الله دا جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاوا بوو حالی وەکو وتمان کە دەفەرمووێی : (وَجعلت قُرَّة عَيْني فِي الصَّلَاة)[٣٠] ئەفەرمووی من خۆش بینینی چاوم خۆشحالی و لەزەتم لەنوێژەکەمدایە ، کە دەچووە ناو نوێژ هەموو شتێکی لەیاد ئەکرد ،هەتا بەبیلالی ئەوت ئادەی با ئیسراحەتمان پێ بدا ئەم نوێژە بانگ بدە با ئیسراحەت بکەین ، ئەوانەی ئەمرۆ ئەلێن ئادەی با لەکۆل خۆمانی بکەینەوە .

پێویستە ئینسانی موسلمان شەو نوێژی هەبێ پێویستە هدوئیەتی شەو بێ دەنگی شەو بەلایەنی کەم سەعاتێك یاخود نیو سەعاتێك لەنێوان خۆت و الله دا بیبە سەر و بلێ بەراستی الله بەس تۆ خوای والله ئەویتر هەمووی بەتالە (ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الْبَاطِلُ)[٣١] الله وا دەفەرمووی بلێ بەس الله حەقە و ئەویتر هەمووی بەتالە تۆ منت دروست کردوە ئەبێ عیبادەت بۆ تۆ بکەین لەسەر

[٢٩]:سورة الحج اية :٣٨
[٣٠]: روى النسائي
[٣١]:سورة القمان اية :٣٠

دین وئیمان بمژێنه و بممرینه و زیندووم بکەرەوە لای خۆت لەدوعاکردن بەردەوامبە و لەگەلی خەریکە خوایە لەگوناهەکانم خۆشبە رەحمم پێ بکە خوایە رەحم بەمال و مندالم بکە .

(فإن أقل درجات التنعم بمناجاة الحبيب فمن كان النوم والاشتغال بالحديث ألذّ عنده من مناجاة الليل فكيف تصح محبته ؟)ئەگەر قسەکردن لەگەل خەلکدا پێی خۆش بێ دۆمینە و سەرمێز و شەوبەسەربردن بەگۆرانی و مۆسیقا لەموناجاتی الله پێ خۆشتربێ لەتەراویح و قورئان خوێندن کەی ئەمە خۆشەویستی الله یە (فإن المحب يتلذذ بخدمة محبوبه وتصرفه في طاعته) کەسێك کەسێکی خۆش ویست زۆرپێ خۆشحالە کەوا خزمەتی بکا گیانی لەپێناو بکا بەقوربان (وكلما كانت المحبة أقوى كانت لذة الطاعة والخدمة أكمل) چەنێك ئەو خۆشەویستیەت بۆ الله بەهێز بێ ئائەوە بەوشێوەیە رۆژو و نوێژ و تاعەت و خێر و چاکەکانیشت بەهێزتر ئەبێ سەیری خۆت بکە چەندێك بەهێز و بەقوەت بوو خۆشەویستیەکەشت ئاوایە .

ابن القيم : دەفەرمووی : هەرکەسێك کەسێکی خۆش ویست حەز لەقسە کردنی دەکا لەگەلیدا . قسە کردنی الله ش قورئانەکەیەتی ، ئەلێ چەنێك لەقورئان نزیك بێ ئەوەندە لە الله نزیکی چەنێك لە قورئان دووربێ ئەوەندە لە الله دووری ئیتر سەیری خۆت بکە ! ئەلێ نەخوێندەوارم ئەی خۆ پێغەمبەریش نەخوێندەواربوو حەرفیشی نەئەزانی .الله فێری کرد دەتۆ برۆ با کەسێك فێرت بکا ئەلێ نەخوێندەوارم ئەی باشە هەمووتان ئەزانن کەوا صەحابەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) الله تعالى دەفەرمووی ؛( هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا)[٣٢] لەناو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی نارد ئەو نەخوێندەوارانە هەموویان شارەزا نەبوون ئەدی ! ئێستا بلێن ئادەی دەی پێرەمێرد و پیرەژنە نەخوێندەوارەکان کە ئەلێ نازانم والله پێت بلێن ئادەی رۆژی وەرەقەیەکت پێ ئەدەین سورەتێك فێربە !ئەی کا یاخود نا !؟ والله دەیکا نالێ نەخوێندەوارم ئەلێ فێرە فەرەنسیش ئەبم بیهێنە !! قەزیەکە بریتیە لە مەحبەتەکە نازانی قورئانەکەی چەند سورەتی تێدایە نازانی الله کەی چی وتوە نازانێ الله کەی چی حەلال کردوە و چی حەرام کردوە ! چی پێ خۆشە و چی پێ ناخۆشە .

ئەلێ پێغەمبەرم خۆش ئەوێ (صلى الله عليه وسلم )ئی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) زۆر رقی لەو کەسە بوو کە ئەیوت بەسەری باوکم ! بەگۆری باوکم و بەبرایەتیمان و ئێ باشە تۆ شتێك ئەلێ کە پێغەمبەر پێ ناخۆشە چۆن پێغەمبەر تۆی خۆش دەوێ (صلى الله عليه وسلم) دەبزانە پێغەمبەرەکەت چی پێخۆش بووە (صلى الله عليه وسلم) .

[٣٢]:سورة الجمعة اية : ٢

ئەلیٚ الله م خۆش ئەویٚی الله شیرکی لە هەموو گوناهەکان پیٚ ناخۆشترە ئیٚ تۆ ئاخر شیرك ئەکەی شیرك ! پەرۆیەك و نەبوویٚك و پەریٚك ئەخەیتە پال الله تعالی ! پیاویٚك ئەخەیتە پال الله تعالی مەنهەجیٚك ئەخیتە پال الله تعالی ئیٚ ئاخر الله چۆن تۆیی خۆش ئەویٚی ! والله هەتا ئیٚوارە إدعای بۆ بکەی ئەو تۆی خۆش ناویٚی ، خۆتان یەك لای بکەنەوە بۆ الله تعالی .

دیرە شیعریٚك لە نونیەی إبن القیم دەفەرمووی :

(فلواحدٍ كن واحداً في واحد .... أعني سبيل الحق والإيمان)

واتە: فلواحد: بۆیەکیٚك کە الله یە (کن واحدا) یەك بە و دووروو مەبە یەك کەس بە ئەمرۆکەسەکان نەك یەك روو بەلکو دەروو و هەزار روون یەك لەگەل مندا قسەیەك ئەکا ئەچیٚت لەگەل یەکیٚتردا قسەیەکی تر دەکا قسەکان کۆبکەیتەوە هەمووی بیٚ سەروبەرە دژی یەکترییە لەگەل موسلمان موسلمانە لەگەل کافر کافرە ! بۆئەو خوایە ببە یەك کەسە (في واحد)راستە شەقامەکەی پیٚغەمبەر بگرە بەر (صلی الله علیه وسلم) ئیٚستا نەیەك خوامان هەیە لەژیانماندا نەخۆشمان یەکین ! نەریٚبازەکەشمان یەکە هەزار ریٚبازمان هەیە هەزار کەسیش لەدلماندایە ، تەنها ئەم وتانە سودمان پیٚ دەگەیەنی ٚ ئەویتر هەمووی بەتالە فلان کەس و زەرد و سۆر و کەسك و مردوو و زیندوو هەتا پیٚغەمبەر پەرستن بەکەلکی تۆ نایەت تەنها عیبادەتی الله بکەن الله دەفەرمووی (وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا)[٣٣] ئینجا باخۆمان هەلنەخەلەتیٚنین یاخود قورئان فریٚی بدەین و نە خوا و ئەم قورئانە هەمووی درۆیە (والعیاذ بالله)وەکو کافرەکان م ومولحیدەکان و شوعیەکان ئەمە درۆیە و خوای چی و پیٚغەمبەری چی ! ئەوکاتە بۆ خۆشیەکانی دونیا لەکچ و پارە وخواردن لە کیس خۆمان بدەین یاخود بلیٚن الله راستە کە الله راستە بەبیٚ وتنی ئیٚمەش ئەوکاتەش دەبیٚ خۆت یەکلای بکەیتەوە لەگەل الله تعالی دا بلیٚ هەتا کەی من دەبیٚ بەندەی ئینسانەکان بم ئەبیٚ بەندەی الله تعالی بم بەتەنها (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)[٣٤] .

[٣٣]:سورة النساء اية :٣٦
[٣٤]:سورة الفاتحة اية :٥

---

## ئارام گرتن

(أن يكون صابراً على المكاره)دەبی ئەو کەسە کەسێکی ئارامگر بیّ  لەسەر نارەحەتیەکان و ناخۆشیەکانی دونیا چونکە ئەم ژیانە الله تعالى پیّ وتووین بۆ خۆشی و بۆ هەتا هەتایی دروست نەکراوە بەلکو جێگای تاقیکردنەوەیە ، تاقیکردنەوەش هەر خۆی لەخۆیدا بریتیە لەناخۆشی ئێستا هەریەکێك لەئێمە بلێن کاکە ئیمتحانت ئەکەین ؟! سەیر دەکەی ترسێك و نارەحەتیەکت لیّ ئەنیشیّ هەرناوەکەی خۆی لەخۆیەوەتی ئینجا وەرە بچۆرە ناو ئیمتحانەکەوە ئەوەیان وەلام بدەوە ئەوە نازانیّ ،، ! هەمووی ئەبێتە هۆی قەلەق و نارەحەتی لەسەرت لەم ژیانەشدا الله تعالى توشی جۆرەها نارەحەتیت ئەکا توشی برسیەتی و توێنویەتی نەبوونی و نەداری و هەژاری و تووشی جۆرەها وشێوەت ئەکا ئەیەوێی بزانیّ تۆ تا چ رادەیەك تۆ صەبرت هەیە لەسەر ئەوەی کە الله توشی کردوویت .

(والصبر من آكد المنازل في طريق المحبة وألزمها للمحبين ) لەرێگەی خۆشەویستی الله تعالى دا ئارامگرتن یەکێکە لە گەورەترین مەنزیلەکان (وهم أحوج إلى منزلة الصبر من كل منزلة ، وهو من أعرف المنازلة من طريق التوحيد وأبينها و حاجة المحب إليه ضرورية) هەرکەسێك الله خۆش بووێی ئەبیّ  ئاگاداری صەبر و ئارامگرتن بیّ زۆر گەورەیە ئارام گرتن وە هەمووتان ئەزانن کەوا لەکوردەواری ئەلیّ : صەبر تالە بەس بەرەکەی شیرینە ، جا تا ئەو تالیە نەچێژی ئەوشیرینیە ناچێژی .

(فإن قيل كيف تكون  حاجة المحب إليه ضرورية مع منافاته لكمال المحبة ، فإنه لا يكون إلا مع  منازعات النفس لمراد المحبوب؟)لێرەدا بابەتێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە ئەوتریّ چۆن ئینسانێك

کەسێکی خۆش بوێی صەبر یەکێکە لەگەورەترین مەنازیلەکان لەبەردەمیدا لەکاتێکدا صەبر گرتن بریتیە لە منازەعە کردن واتا بەربەرەکانی کردن .

بۆنمونە تۆ شتێکت خۆش دەوێی الله تعالی ئەوشتەی خۆش ناوێی دەبێ تۆ ئەوشتە لابەی بەربەرەکانی بکەی لەنێوان ئەوشتەی تۆخۆشت دەوێی ئەوی الله تعالی و دەبێ ئەوەی الله تعالی سەربخەی یانی کاتێك تۆ حەزەکانی خۆت بەجێ دەهێلی زۆر زەحمەتە ئەمە ببێتە دەرەجەی ناسینی تۆ بۆ الله تعالی .

نهێنیەکە لێرەدایە (قیل: هذه هي النكتة التي لأجلها كان من آكد المنازل في طريق المحبة وأعلقها به )کاتێك کەتۆ واز لەخۆشیەکانی خۆت ئەهێنی بۆ الله تعالی تۆ خۆشەویستی الله ت زال کردوە بەسەر خۆشەویستی خۆتدا .

یاخود کاتێك الله ناخۆشیەك یاخود نارەحەتیەك بەسەر تۆ دا ئەهێنی تۆ ئەلێ صەبرم هەیە یا الله زۆر سوپاسی بێزایەن و نەبراوەت ئەکەم و من شاکرم ئەوە نهێنی بابەتەکەیە لێرەدا کەتۆ هەلنەچووی و نارەحەت نەبووی بەتاقیکردنەوەکەی الله تعالی ئەوە دەلالەتی خۆشەویستی تۆیە بۆ الله ، بۆنمونە : تۆ کەسێکت زۆر خۆش ویست ئەگەر ئەو کەسە هەر زیانێکت لێ بدا ئەلێ قەیناکە لەبەر خۆشەویستیەکەی ئەلێ قەینا فلانکەسە دەلێ گەرێی ئەگەر کەسێکیتر بیت شێت و هار دەبی بەس ئەگەر خۆشەویستێك بێ مەوقیفت چی ئەبێ لەبەرامبەر زەرەرەکە هەمووتان ئەلێن قەیناکە فلان کەس لەسەر سەرە مالەکەش هەمووی تێك بدا قەیناکە ئەوەیە خۆشەویستی الله تعالی .

کە ئەو الله تعالی ئەو خۆشەویستیە بەسەرتۆدا ئەهێنی نارەحەتیەك بەسەرتۆدا ئەهێنی لەمردن و لەنەخۆشی ونەداری و نەبوونی ئەلێ یا الله تۆبووی ؟! مال و مندالم هەمووی بۆتۆ هەمووی لەپێناوی تۆدا بێ تۆ چی ئەکەی بیکە سەیرکەن لەخۆشەویستیەکەی الله تعالی شتەکانت هیچ لەبەرچاو نابێ و صەبرێکی گەورە دەگریی لەبەرامبەر ئەو شتەدا . ئایا ئێمە واین ؟! هەر کەس خۆی بکێشێت بەم قسانەی کە کردوومان .

(وبه يعلم صحيح المحبة من معدومها )ئا بەمە ئەناسرێی کێ خۆشەویستیەکە راست و دروستە و هی کێش وانیە ! (وصادقها من كاذبها )کێ خۆشە ویستیەکە راستە و کێ خۆشەویستیەکەی درۆینەیە .

هەر ئەوەشە لەدونیا ئەگەر کەسێك بلێت تۆم خۆش دەوێی ئەگەر ئەو کەسە نارەحەتیەکت لەبەرامبەر بکا و لێ تورەبوویتەوە یەکسەر ئەلێ ئەوە منی خۆش ناوێی دلی ئەشکێی ئەلێ ئەگەر منی خۆش ویستبایە ئەو مەوقیفەی نەدەبوو بەرامبەرم .

(فإنه بقوة الصبر على المكاره في مراد المحبوب يعلم صحة المحبة)ئەگەر بێتووو کەسەکە چەندێك صەبرەکەی بەهێز و بەقوەت بوو لەسەر ناخۆشیەکان لەبەرامبەر ئەو مەبەستەی کە خۆشەویستیەکەی دەهێنێتە ڕێگەی ئابەوە ئەزانی کە ئەو خۆشەویستیە چەندێك راستە .( ومن هنا كانت محبة أكثر الناس كاذبة)ئالێرەوە بۆمان دەر ئەکەوێی کەوا زۆرینەی زۆری خۆشەویستیەکان راست نیە !! بیخنە بەردەمی خۆتان ئەگەر لەو شارەدا موصیبەتێك بێت لەسەتا چەندی رازییە لەچەندی شوکری الله تعالی دەکا چەندی ئەڵێ ((إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)[35] رازییە و بێ دەنگ ئەبێ و بەهادیئی ئەڕوات وە لەسەتا چەندی کوفر ئەکا و نارەحەت ئەبێ ئەنواع و ئەشکال شت ئەکا ! زۆربەی زۆرەکەی ناشکور و نارەحەتە و کوفر ئەکا (یا الله لەوانە بین کە دەماندەیتی سوپاست بکەین و ناشمان دەیتی هەرسوپاست بکەین).
ئەگەر پێ داین زگمان پر بوو گیرفانمان پربوو الحمدلله ئەگەر لێ شی برین خوایە ئەوە حالە بەسەر ئێمەت هێنا! سەیرکەن هەرەشە لەخوا و رەخنە لەخوا و کوفر بەخوا دەلێ والله ئەو نوێژەت بۆ ناکەم کورە من ئەوەندە دوعام کرد هیچی قبول نەبوو کورە بەخوا ناچمە حەج والله زەکاتیش نادەم من بۆکێ بکەم (والعیاذ بالله) خۆمن ئەوەندە دوعام کرد تەقیم !کەسێك نەبوو وەلامم بداتەوە ئەوە صەبر ناگرێی ئەم کەسە ئالەوێدا الله تعالی پێویستی بەتۆ نیە وە پێویستی بەهیچمان نیە بەخوا نەپێویستی بەملائیکەیە نە بەپێغەمبەرانە نەبەخەلکەکەیە (وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ)[36] هەرکەسێك کەوا نەیکا ئەوە الله دەولەمەندە و پێویستی بەکەس نیە ، نەبەتاعەتی ئێمە زیاد ئەکا نەبەمەعصیەتی ئێمەش کەم دەکا بەس ئێمە زەرەرەکە ئەکەین ئێمە !! ئێمە باجی بەندایەتیەکەی خۆمان ئەدەین ئەوکاتە .
(لأنهم كلهم ادعوا محبة الله تعالى ) هەموویان ئەلێن الله مان خۆش ئەوێی ! (فحين امتحنهم بالمكاره انخلعوا عن الحقيقة محبه ) کاتێك تاقیان ئەکاتەوە بەناخۆشیەکان یەکسەر لەبەرگی خۆشەویستی دێنە دەرەوە (ولم يثبت معهم إلا الصابرون) تەنها ئارام گران خۆیان پێ ئەگیرێت بۆیان ئەو خۆشەویستیە ئە پارێزن ئەوانەی صەبریان هەیە .( وقد تبين بذلك أن أعظم الناس محبة لله أشدهم صبراً ) کامیان صەبری زۆرتر بوو لەهەمووان زیاتر الله ی خۆش ئەوێی .

الله تعالی باسی پێغەمبەر ئەیوب دەکا (علیه السلام) هەمووتان بیستوتانە کەوا چی بەسەر هات ئەم پێغەمبەرە وە حەدیس و قەولی درۆ زۆرە لەسەری کەوا وای لێهاتوە و واو و وا بەنەخۆشیەکەیەوە بەلام

[35]:سورة البقرة اية : ١٥٦
[36]:سورة ال عمران اية:٩٧

حەدیسێکی صەحیح هەیە علماء یان باسی ئەکەن و ئەفەرموون پێغەمبەر ئەیوب (علیە السلام) هەژدە سال نەخۆش کەوت بەنەخۆشیەك هەموو کەسێك دوورکەتەوە لیّ دوور و نزیك دوو برادەری رۆژێك هاتن وسەردانیان کرد (تۆ سەیری ئەم نەخۆشیە بکە ئێستای ئێمە کە توشی نەخۆشیەك ئەبین نەخۆش ئەبین چەندەها کەس دێت بۆلامان دلمان ئەداتەوە ) ئەو پێغەمبەرە نازدارە هەموو کەسێك دوورکەوتەوە لیّ کەس نەمایەوە ئەلیّ دوو برادەر هەبوون ئەهاتن وسەردانیان ئەکردن لەرێگا کەهاتن بۆلای یەکیان بەیەکیانی وت : والله ئەگەر ئەم پێغەمبەر ئەیوبە ئەگەر گوناهێکی گەورە گەورەی نەکردبیّ ئەوهای لیّ نەدەهات ئاخر بۆچی وای لێهاتوە ! ئەلیّ ئەویش گومانی تیّ کەوت چونە لای و ئەویتر خۆی بۆ نەگیراو بۆی گێرانەوە وتی لەرێگادا ئەم برادەرەم وای وتوە ، پێغەمبەر ئەیوبیش وتی : والله هیچ شتێك شك نابەم کەکردبێتم مەگەر تێپەرییبێتم بەلای کەسانێکدا باسی خوایان کردوە و تورە بوونە ئەگەر سوێندیان بە خوا خواردبیّ من لەمالەوە خێرا کەفارەتەکەم داوە ویستومە کە ناوی خوای گەورە بەهەوەنتە نەروا کەفارەتم داوە لەبەر خاتری ئەمە هیچ نابینمەوە لەخۆمە ! ، جا ئەم پێغەمبەرە بەرێزە هەژدە سالّ ئاوابوو هەموو کەسێك تەرکی کرد ، وە ئەم پێغەمبەرە دوعاشی ئەکرد دوو دوعای هەیە لەوقورئاندا (**رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ**)[٣٧] (**رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ**)[٣٨] ئەمە داواکەی بوو و لەالله داوای کرد لەکەسیتر داوای نەکرد بەلام هەژدە سال دوعا ئەکا ئینجا گیرا ئەبییّ خێزانەکەی ئەیبرد و هەلیدەگرت و دەیبرد بۆ سەرئاو و دەیهێنایەوە رۆژێك بردی تاخیر بوو نەهاتەوە ئەیوب و راوەستا خێزانەکەی تاوەکو کارو باری خۆیی تەواو دەکا زۆر تاخیر بوو ونەهاتەوە ئالەو کاتەدا الله تعالی وەحی بۆ ئەیوب پێغەمبەر دەکا (**ارْكُضْ بِرِجْلِكَ ۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ**)[٣٩] الله تعالی بە ئەیوبی فەرموو : بەپێت لەزەوی بدە بەقاچت بدە لەزەویدا ئاو دەر ئەچیّ خۆتی پیّ بشۆو بیخۆرەوە هیچت پێوە نامێنی لەو نەخۆشیە ئابەو ئاوە الله تعالی چاکی کردەوە ئەوە موعجیزەی الله تعالی ، کاتێك کەهاتەوە خێزانەکەی چاوەری کەسە نەخۆشەکە ئەکا دەستی بگرێت و بیباتەوە سەیردەکا کەسێکی جوانی رێك و پێك پێش هەژدە سال ئەیوب چۆن بوو ئەوها بوو ئەویش لیّ تێك چوو وتی رەحمەتی الله ت لیّ بیّ ئەریّ ئەیوبت نەبینیوە والله پێش هەژدە سال هەر لەتۆ ئەچوو ؟ ئەویش وتی : من ئەیوبم الله چاکی کردومەوە . ئەم پێغەمبەرە نازدارە هەژدە سال ئەنالێنی سەیری قورئان بکەن چی ئەلیّ لەدوای ئەوەی کە چاکبوویەوە (**إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ الْعَبْدُ ۖ إِنَّهُ أَوَّابٌ**)[٤٠] ئێمە ئەیوبمان ئاوا بینی کە بەندەیەکی

[٣٧]:سورة ص اية :٤١
[٣٨]:سورة الأنبياء اية :٨٣
[٣٩]: سورة ص اية:٤٢
[٤٠]:سورة ص اية :٤٤

صابیر بوو ،رۆژێك لەرۆژان گلەی لە الله نەكرد نەیوت یا الله خۆمن پێغەمبەرم گوناهم نیە تۆ بۆ وام لیٚ ئەكەی ! باشە بۆ كافران وا لیٚ ناكەی بۆمن والیٚ ئەكەی ، نەخێر ئەو ئەزانیٚ وە خۆشەویستی الله لەدلیدایە ئەوە صەبرە جا الله تعالی لەنەتیجەدا ئەم خەلاتەی ئەداتیٚ (نِّعْمَ الْعَبْدُ)باشترین بەندەیە ئەوە (إِنَّهُ أَوَّابٌ)واتا بەبەردەوام ئەگەرێتەوە بۆلای الله تعالی متعە بۆ الله تعالی عیبادەتی الله تعالی دەكا .

هەروەها الله تعالی فەرمانی بە پێغەمبەری خۆمان كردوە (صلی الله علیە وسلم) بەصەبر بۆ ئەو حوكمەی كە الله تعالی دایناوە هەمووتان ئەزانن ١٣ سال لە ئەشكەنجە و عەزاب و ئازاری موشركینی مەككەدا بووە ئەفەرموویٚ صەبر بگرە كە ئەوانە موسلمان نابن وە پیٚ راگەیاندوە كە صەبری ئەو ئەگەر بیگرێت هەر ئەبیٚ الله بیداتیٚ وە دەبیٚ بشزانی كە صەبرەكەت هەر لەلای الله تعالی وەیە ، ئێمە دەبیٚ وا فێربین بلێن :یاللە صەبرمان بدەیتی بەلام ئەشزانین ئەگەر تۆ نەمان دەیتی نیمانە صەبر (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)[41] نستعین واتا داوای یارمەتیت لیٚ ئەكەین خوایە .

الله تعالی پیٚ دەفەرمووی (وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا)[42]ئەی محمد تۆ صەبر بگرە بۆ ئەو حوكمەی الله تعالی كەوا سەرت ناخا كەوا ئەوان ئیمان ناهێنن كە ئەزیەتت ئەدەن كەئەشكەنجەت ئەدەن تۆحەقت پیٚ یە و ئەوان لەسەر بەتالن كەچی الله تعالی لەم كاتەدا تۆ سەرناخا ئارام بگرە تۆ بەبەر چاومانەوەیەت و سەرت ئەخەین ئێمە لەگەلتاین و ئەتپارێزین صەبرت هەبیٚ فێری صەبری ئەكرد الله تعالی .

الله تعالی بەپێغەمبەر محمد (صلی الله علیە وسلم) دەفەرمووی لەئایەتێكتردا (وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ)[43] ئارام گربە ئەوەش بزانە ئارام لەلایەنی الله وە بۆتۆ نێت نیە واتا ئارامگرتنەكەت ئەبیٚ الله بتداتیٚ داوای لیٚ بكە(وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ) خەفەت مەخۆ بەكوفرەكەیان خەفەت مەخۆ بەشیركەكەیان تۆ بەس هەولبدە تۆ لەگەلیان خەریك بە وەبیٚ تاقەت مەبە بەو هەموو فرو فێلەی دروستی دەكەن بەرامبەرت (إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ)[44] الله تعالی لەگەل تەقواكەراندایە وە لەگەل محسین و چاكەكەراندایە .

[41]:سورة الفاتحة اية :٥
[42]:سورة الطور اية :٤٨
[43]:سورة النحل اية : ١٢٧
[44]:سورة النحل اية : ١٢٨

الله تعالى متحى ئارامگرەكانمان دەكات لەقورئان و دەفەرمووی (الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ)[٤٥] ئەوانەی ئارامگرن جا بزانین ئارامگرتن چۆنە !

علما يان بەسێ جۆر باسی ئارامگرتمان بۆ دەكەن :

١–ئارام گرتن لەسەر تاعەتەكانی الله لەسەر نوێژ و زەكات و رۆژوو حەج و چاكەكردنەكان .ئارام گرتن لەسەر دوعا كردن .–ئارام گرتن لەسەر بانگەوازكردنی خەلكی ودابران نیە لەسەری و بەردەوام ببی لەسەری .

٢–ئارام گرتن لەسەر حەرمەكان : مەلێ با تاقی بكەمەوە بزانم ئەم عەرەقە تامی چۆنە ! ئارام بگرە مەلێ بزانم ئەم زینایە چۆنە فلان ئافرەت بانگی كردم خۆ بەجارێك هیچ نابێ ! ئارامبگرە ، ئەو مالە شتێكی باشە با دوو دەفتەری لێ بدزم خۆ لەبن دەستی خۆمە منی بە ئەمیندار داناوە نازانێ من دزیومە ! ئارام بگرە ، شەیطان دێت پێت ئەلێ ببە و بكە بلێ ! ؟ بلێ نەخێر الله تعالى دەلێ مەكە ومەیبە و مەلێ .ئەم ئارامگرتنە زۆر گرینگە ئەتوانی بیكەی .

وەرن بادانیشین ئێمەی موسلمان و مامۆستایانی ئاینی چەندین جار ئەوەمان وتۆتەوە زینا مەكەن عەرەق مەخۆن لیواط مەكەن دزی مەكەن ، دەورە بیكە كاكە ! بزانە مورتاح ئەبێ كاتێك ئەیكەی ! والله والله مورتاح نابی لەنەفسی خۆتدا نەك دانەیەك ملیۆنێك دانە بكەی نەك زینایەك هەزاران زینا بكەی بەخوا هەر یەك تامە هەر ئەو كاتەیە و تەواویش ئەبی ! ئەوانەی كە كەوتونەتە ناو زۆنگاوی تاوانەكان لێیان بپرسە ئەلێ خۆزگە نەمكردبایە راستە لەوانەیە ئێستا شەیطان هەلی خەلەتاندبێت هێشتان ئاوری نەداوەتەوە بە ئاخیرەتەكەی دا ئاوی نەداوتەوە بەقەبرەكەیدا خۆشە هەر ئەلێت ئەروا گوێی لێ نیە بەس رۆژێك هەر دەلێ پەشیمانم خۆ ئەگەر لەدونیا نەبێ لەكاتی مردنەكەدایە !ئەلێ خۆزگە وام نەكردبایە یا الله بم گەرێنەوە بۆدونیا تا ئیشی چاكە بكەم تازە رۆیشت و ناگەرێتەوە ئەو كاتە ، ئارام بگرە لەسەر گوناهەكان و مەیكە .

٣–ئارام گرتن لەسەر قەدەرانەی كە الله بەسەر ئیماندارانی دەهێنی : لەفەقیری و نەخۆشی ونارەحەتیەكانی ژیان لەزەحەمەت كێشان ئارامی لەسەر بگرە .

[٤٥]:سورة ال عمران اية :١٧

---

ئینجا ئەمە لەپێناوی الله دایە لەبەر خۆشەویستی الله کێ ئەمەی هێناوە بەسەر ئێمەدا الله تعالى  الله تعالى صابرەکانی خستۆتە لای منفقین و صادقان و قانیتەکان و مەتحیان ئەکا وە الله تعالى دەفەرمووی (وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ۗ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا ۖ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ)[46]

ئەمە پێوەرێك و میزانێکە و کێشانێکە پێت ئەلێ کێ راست ئەکا (أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا) ئەوە راستی کرد کێ یە ؟ ئەلێ (وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ) ف لبأسا :واتا فەقیری ،( وَالضَّرَّاءِ)واتا : نەخۆشی و نارەحەتی ، (وَحِينَ الْبَأْسِ)یانی لەکاتی جیهاد و غەزا و قیتالدا کە زۆر قورسە و لەوپەری ناخۆشیدایە صەبر بگری ! وە یەکێك لە گەورەترین کبائیرکان (الفرار و یوم الزحف)لەگەل کۆمەلی موسلمانان بجەنگی دژی کافران پاشە کشە بکەیت و واز لەکۆمەلەی موسلمانان بهێنی ئەو ئارام گرتنت بۆ نەگیرێی ، جا الله تعالى دەفەرمووی : ئەو کەسەی کە خۆی دەگرێتەوە لەناشوکری لە کاتی فەقیردا و لەکاتی نەخۆشی و نارەحەتیەکاندا (أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا) ئەمانە راستیان کرد (ۖ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ) ئەمانە ئەو کەسانەن کەبەهۆی ئەو ئیمان و صەبرەیانەوە خۆیان لەعەزابی الله دەپارێزن .

یەکێك لەشتە گرینگەکان بریتیە لە ئارامگرتن ئاگادارین وە منزیلەی زۆر گەورەیە بەتایبەتی لەقورئان گەر سەیری بکەی هەموو تاعەتێك الله تعالى ئەلێ بەقەدەر ئەوەندە جەزای ئەدەمەوە پاداشتی ئەدەمەوە بەس صەبر نەبێ و بەبێ ئەندازەیە . بۆنمونە ئێستا کابرا بلێ سەعاتێك ئیشم بۆ بکەی دەهەزارت ئەدەمێ دوو ئەوەندە سێ ئەوەندە واتا بۆت دیاری دەکا .ئەی ئەگەر کەسێك پێت بلێ وەرە من حیساب ناکەم بەکۆل پارەت ئەدەمی تۆ چی ئەکەی !

الله تعالى دەفەرمووی : (إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ)[47] ئارام گران الله تعالى پاداشتیان ئەداتەوە بەبێ حیساب بەمانای بەبێ حد و ئەندازە بەبێ مقدار ، مەنزیلەیەکی زۆر گەورەیە الله تعالى لەگەل ئیحسان و ئیمان و ئیسلام پێکەوەی بەستۆتەوە کردویەتی بەهاوری یەقین و تەوکول و ئیمان و ئەعمال و تەقوا .

الله تعالى دەفەرمووی ؛ (وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ)[48] صەبری خستۆتە پال نوێژەوە .

الله تعالى دەفەرموی : (إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ)[49] خۆ صەبریش عەمەلی صالحە بەلام الله تعالى دەری هێنا تایبەت مەندی کردەوە .

[46]:سورة البقرة اية : ١٧٧
[47]:سورة الزمر اية:١٠
[48]:سورة البقرة اية :٤٥
[49]:سورة هود اية :١١

الله تعالی دەفەرمووی : (إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ)[٥٠] تەقوا و صەبر خۆ صەبر هەر لەگەل تەقوایە بەس الله تعالی جیای ئەکاتەوە وتایبەت مەندی دەکا بۆئەوەی کەوا مەنزیلەکەی دەرخا .

الله تعالی دەفەرمووی : (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ)[٥١] خستۆتیە پال شاکیرەکانەوە.

الله تعالی دەفەرمووی : (وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ)[٥٢] .

الله تعالی دەفەرمووی : (وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ)[٥٣]

الله تعالی دەفەرمووی : (لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ)[٥٤] یەقین و صەبری خۆستۆتە پال یەکتریەوە الله تعالی .

الله تعالی دەفەرمووی (وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ)[٥٥] خستۆتیە پال راستگۆیەوە .

الله تعالی کردویەتی بەهۆکاری خۆشویستنی خۆی و بەهۆکاری لەگەلدا بوونی خۆیدا لەگەل ئەو کەسەدا فەرموویەتی ئایەتەکانم کی سودیی لیّ دەبینی ئەوانەی کەوا صەبریان هەیە وە صەبر باشترێکە و پێویستە ئارامگربیّ و وە مەلائیکە سەلامیان لیً دەکا .

(إنما يضعف الصبر لضعف المحبه) ئەلێی بۆ صەبرت کەمە کاکە تۆ ؟! ئەلی لەبەر ئەوەی خۆشە ویستی الله ت کەمە ئاگاداربە هەر کەسێك لە ئێمە صەبرەکەی کەم بوو یەکسەر بگەرێتەوە بۆ دەرەجەی خۆشەویستیەکەی بۆ الله چەند الله ت خۆش بوێی ئەوەندە صەبر لە بەرامبەریدا ئەگریی .

[٥٠]:سورة يوسف اية :٩٠
[٥١]:سورة لقمان اية :٣١
[٥٢]:سورة العصر اية : ٣
[٥٣]:سورة البلد اية :١٧
[٥٤]:سورة السجدة اية :٢٤
[٥٥]:سورة الأحزاب اية : ٣٥

## (لا يؤثر عليه شيئًا من المحبوبات)

(أن لا يؤثر عليه شيئًا من المحبوبات ، ومن آثر على الله شيئاً من المحبوبات فقلبه مريض) ئەلێ نابێ بەهیچ شێوەیەك ئەوشتانەی كە هەتە و خۆشت ئەوێن زالی بكەی بەسەر خۆشەویستی الله تعالی دا هەركەسێك وا بكات ئەوە دلی نەخۆشە .

بۆنمونە لەسروشتیەتی ئێمەدا ئەوەیە كەوا نانی پێ خۆشە ئەگەر كەسێك بلێ حەزم لە قورە و حەزم لەنان نیە ! ئەوكاتە ئەلێن تۆ دلت نەخۆشە چۆن شتی وا ئەبێ !

كەسێكیش كە غەیری الله لەدلدا بوو ئەلێن دلەكەت نەخۆشە تۆ ئەبێ الله لەناو دلتدا بێت خۆشەویستی الله ئەگەر شتێكیترت خستە دلت و ئەوت فرێدا بوو ئەوشتەیترت كردبوو بەدەرەجەی یەكەم ئەوە دیارە دلەكەت نەخۆشە برۆ چارەسەری خۆت بكە .

ئیمامی مقدیسی دەفەرمووی : (ومرض القلب خفي قد لا يعرفه صاحبه)[٥٦] واتا : نەخۆشی دل زۆر و خاوەنەكەشی هەستی پێ ناكا ، تۆ بۆخۆت هەستی پێ ناكەی دلت نەخۆشە لەم روانگەیەوە (فلذلك يغفل عنه) گوێی پێ نادا چەند كات ئەروا وا ئەزانێ كەوا شتی چاكی كردوە كەچی واش نیە ! (وإن عرفه صعب عليه الصبر على مرارة دوائه)خۆ ئەگەر زانیشی دەوئەكەی زۆر قورسە دوائەكە موخالەفەكردنی هەوایە ئارەزوەكانی خۆت بەجێبهێلە ویستەكانی الله تعالی بخەرە پێشەوە چەند نارحەتە .

ئێستا بگەرێ بەسەر زۆربەی خەلگیدا بەتایبەتی رەمەزانن بۆ بەرۆژوو نابن ئەلێ والله كاكە پێم ناگیری و گەرامەیە زۆر خۆ پێ ئەگیری وە بیگریت و بیخەیتە ژوورەوە سی شەو سێ رۆژ بی نانی بكەی ئەژی یاخود ئەگەر پارەی بدەیتی دوو شەو دوو رۆژ نان و ئاو مەخۆ ئەیكات كەواتە ئەو برە پارەیە لە الله باشترە لەلای ئەو ! ئەوە كێشەكەیە خۆی ئەكوژی لەسەری بلێ ئەوەندەت ئەدەمی چەكم بۆ هەلگرە برۆ بۆ شەر ئەچێت پارەكەی پێ خۆشە !

ئەی خۆشەویستی الله بابەتەكەمان ئەوەیە ئەو كەسە دلی نەخۆشە وهەوا وئارەزوەكانی ئەخاتە پێش الله تعالی وە ئەما ئەگەر خۆشە ویستی الله لەدلیدا بێ نایگۆرێتەوە بەكەس بەبەباوك نەبە كور نەبەژن

[٥٦]:مختصر منهاج قاصدين

نەبەهیچ کەسێك نەبەخۆشی ، زۆر جار ئەلێن خوایە بەقوربانت بین ئایا وایە ئێوە بیر لەو قسەیە بکەنەوە بزانە راستە یان درۆیە لەتاقیکردنەوەکاندا بزانین وایە کە ئەکەوێتە سەر تاقیکردنەوە وانیە ئەڵێ خوایە تۆ بەقوربانم بی (والعیاذبالله) بەپێچەوانەی لێ دێتەوە هەرخۆم تەواو ! .

## خۆشویستنی سونەتەکان

(ومنها أن یکون مؤثرا ما أحبه الله تعالي علی مایحبه فی ظاهره وباطنه فیلزم فیجتنب إتباع الهوی)
ئەویش نیشانەکەیتر نزیکە (ویعرض عنه دعة الکسل ، ولا یزال موظبا علی طاعة الله ومتقربا إلیه بالنوافل )نوفیل واتا سونەتەکان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لەحەدیسێکدا دەفە رموویی: (کە الله تعالی فەرموویەتی: هیچ کەسێك لێم نزیك نابێتەوە بەوەی بەفەرزەکان لێم نزیك ئەبێتەوە )ئاگاداربن واتا فەرز لەپێش سونەتە ، کەسێك ئەگەر فەرز نەکا و سونەت بکا چۆن دەبێ ! نابێ و فەرز واجبە لەسەرت و ئەبێت بیکەی جا فەرزەکان لەوانە نوێژە فەرزەکان رۆژووە فەرزەکان و زەکات دان حەج ، دواتر ئەڵێ ئەگەر ئەوانەی کرد و سونەتەکانی لەگەل کرد خۆشە ویست دەبێت لەلام ! .
واتا کاتێك کەتۆ سونەتێك ئەکەی وردبن لەوە ئەوە یەکێکیان واجبە لەسەرت ئەبێ بیکەی بەلام کاتێك کە تۆ ئەو تتع ئەو سونەتە ئەو مەندوبە ئەوشتەی کەوا فەرز نیە لەسەرت خۆت هەلدەستی دەیکەی خۆت تتع ئەکەی ئەمە دەلالەت لە خۆشەویستی تۆ ئەکا بۆ الله کە تۆ ئەمە دەکەی ، لەبەر ئەوەی ئەوانەی کە سونەت زۆر زۆر ئەکەن لەنوێژەکان و لەرۆژووەکان ئەوانە خۆشەویستی الله ن دەلالەتی ئەوەیە کە الله تعالی یان خۆش دەوێی واتا بێگاری ناکا یاخود نایکا کە کردی بەخۆشەویستی الله دەیکا ، بۆنمونە : کە شەو هەلدەستێتەوە و شەو نوێژەکە بکا لەبەر کێ و لەبەر چی هەلدەستێتەوە !؟ بۆ الله یە لەبەر خۆشەویستی الله یە ئەوەش نیشانەی خۆشەویستی تۆیە بۆ الله تعالی .
(تعصي الاله و أنت تزعم حبه)ئەڵێ تۆ ئەچی سەرپێچی لەفەرمانەکانی الله دەکەی پاشان تۆ إدعای ئەوە دەکەی کە خوات خۆش دەوێی ! (لَوْ کانَ حُبُّكَ صَادِقاً لأَطَعْتَهُ، إنّ الْمُحبّ لِمَنْ یُحِبُّ مُطِیعُ.)[٥٧] ئەگەر خۆشەویستی تۆ راست بێ بۆ الله أتاعەی دەکەی و بەقسەدەکەی .

[٥٧]:الشافعي

سەیر بکەن تۆ ئێستا سەرۆك بی یاخود لە ژێر دەستدا بی یاخود هەرشتێك بی ئەگەر الله ت خۆش بەوێی بەقسەی الله ناکەی ! نالێت الله هەرچی بلیٚ بەسەرچاو .

سەیری ذوالقرنین بکەن هەمووتان گوێتان لەبەسەرهاتی بوە لە سورەتی الکهف لەعلما یان هەندێك ئەلیٚ پێغەمبەربووە وە هەندێکیتر ئەلیٚ مەلیکێکی پیاو چاك بووە شەرق و غەربی بەدەستەوە بووە ئەم ذوالقرنینە گومانی تێدا نیە کە مەلیك بووە بەلام پێغەمبەرە یاخود پێغەمبەر نیە ئەمە خیلافی تێدایە نەیهێشتووە یەکێك لەسەر ئەم زەمینە بەبیٚ ئیمان بمێنێتەوە (**أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ**)[٥٨] هەرکەسێك کوفر بکا ئەوە ئێمە عەزابی ئەدەین یا بگەڕێتەوە بۆلای الله ئەویش عەزابی بدا.مەلیکێك بووە لەخۆشەویستی ئەم الله یە نەیهێشتوە یەك کەسیش لەم سەر زەوییەدا کوفر بکا ، مەلیکایەتی ئەوها دەبیٚ ئەگەر الله خۆشبووێی کیٚ حەدی هەیە مخالەفەی الله بکا !

ئەی بۆ باسی سلێمان ناکەن کە بەتەئەکید پێغەمبەر بووە !!

ئەم سولێمانە مەلیك بووە لەسەر ئەم زەمینە و پێغەمبەریش بووە ئەم مەلیکە هدد هدێك هەوالێکی بۆ دەهێنی کە لە سبا ئافرەتێك پاشایە و قەومێکن کەوا خۆر دەپەرستن ، زۆری بەلاوە سەیر دەبوو چۆن دەبیٚ لەغەیری الله بپەرستن فەرمووی : برۆ ریسالەیان بۆ بنێرە والله ئەگەر ئیمان نەهێنن ئەوهایان لیٚ دەکەین زۆربەتان ئەم خەبەرەتان نەبیستوە !؟ نەیهێشت وا بمێنەوە بەخۆر پەرستی بمێنەوە ئەو مەلیکەی الله ی خۆش بوێی ئەوها دەکا ئەوە نیشانەکەیەتی .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەژیانی خۆیدا ١٣ سال لەمەککە بوو ١٠ سال لەمەدینە بوو لەم ١٠ سالە سەرۆك و مەلیك وپاشای ئەو خەلکە بوو لەمەدینە ئەی هێشت کەسێك بیٚ تەقوای الله بکا ! مونافیق نەیدەوێرا بەهیچ شێوازێك نوێژ نەکا ئەزانن عبدالله کوری سلول سەرۆکی مونافیقان بوو نۆ سال لەگەل پێغەمبەردا بوو لەدوای ئەو نوێژی ئەکرد لەترسا خۆ رقیشی لێبوو بەس نەیدەوێری ئاشکرای بکا چونکە فەرموو بووی : هەرکەسێك نوێژ نەکا لەملی ئەدەم ((أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا ألا إله إلا الله، وأن محمداً رسول الله، ويقيموا الصلاة، ويؤتوا الزكاة، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحق الإسلام وحسابهم على الله)[٥٩] فەرمووی : والله لیٚ ناگەرێم کەسێك لەسەر ئەم زەوەیە ئیمان نەهێنی بە الله وبەپێغەمبەرەکەی و نوێژ نەکاو زەکات نەدا والله ملی لیٚ ئەکەمەوە . نۆ سال ئەم عبدالله کوری ئوبەی کوری سلول نوێژی ئەکرد لەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مونافیقین نەیان دەوێرا نوێژ

[٥٨]:سورة الكهف اية :٨٧
[٥٩]: رواه الشيخان البخاري ومسلم في الصحيحين

نەکەن ئەترسان نوێژ نەکەر نەبوو لەوکاتە وە زەکات دەر نەبوو هەتا پێغەمبەر وەفاتی کرد پێغەمبەر وەفاتی کرد (صلى الله عليه وسلم) جەماعەتی بنی حنیفە بەشێکیان هەلگەرانەوە و بەشێکیان وتیان زەکات نادەین ئەبو بکر خۆی و جەیشی ئامادە کردو هەمویان کوشت چۆن زەکات نادەی ! ئەوە نیشانەی خۆشەویستی بەندەیە بۆ الله کەی لەپێناوی ئەودا هەمووشتێك ئەکا .

أبن القيم دەفەرمووی :

(شرط المحبة أن توافق من ... تحب على محبته بلا عصيان

فإذا ادعيت له المحبة مع خلا ... فك ما يحب فأنت ذو بهتان)[٦٠]

واتا : ئەلێ ئەگەر سەیری مەرجی خۆشەویستی ئەوەیە ئەبێ تۆ موافەقەی ئەوکەسە بکەی کە خۆشت ئەوێی ناکرێی خۆشیشت بوێی و موافەقەی نەکەی وە نابێت عصیانی بکەی الله ت خۆش دەوێی عصیانی مەکە ئەگەر أدعای ئەو مەحەبەتت کردو تۆ مخالەفەی ئەوت کرد ئەوە تۆ بوختان چیت راست ناکەیت و بوختانت کردوە تۆ خۆشت ناوێی .

ئاگاداربە شتێك هەیە ئەویش ئەوەیە ئایا ئێمە هەموومان گوناهە ناکەین !.؟ بەلێ ، ئەی ئەمە مانای چیە ؟!

ئەلێن ئەبێت بەچەند بەشێکەوە :

ئاستی یەکەم : ئەگەر گوناهەکە لەئاستی کوفردا بوو ئەلێن ئەوە پێ کافر ئەبین تەواو .

ئاستی دووەم : ئەگەر گوناهەکە لەئاستی گوناه دا بوو لەئاستی کوفردا نەبوو دەرجەی مەحەبەتەکەت دێتە خوارەوە . تۆ گوناهیش بکەی و بلێ دەرەجەی خۆشەویستیەکەم سەتاسەتە نابێ ! بەلکو دێتە خوارەوە وەکو ئیمتحانە وایە کاتێك ئەچیتە ئیمتحانەوە پرسیارەکانت بۆ دێی چەندێك وەلام بدەیتەوە و چەندێکت راست بێ ئەوەندە دەرجە وەرئەگریی چەندێکیش هەلە بێ ئەوەندە سفر وەرئەگریی ئیتر ئەبێ سەیری خۆت بکەی چەنێك موخالەفەی الله بکەی ئەوەندە سفرت بۆ دێتەوە ،ئەی ئەگەر لە پرسیارە گەورەکاندا کە دەرەجەی گەورەی لەسەرە نەیزانی ؟! ئەوە دەرناچی واتا لەوشتانەی کە کوفرە تێدایە تۆ مخالەفەی بکەی ئەوە تۆ دەرناچی تێدا جوێن بە الله و بەپێغەمبەر بدەی (صلى الله عليه وسلم) نوێژنەکەی ئەوشتانەی کە کوفرە لەدلە لە زمانە لە کردەوەدا بێ ئەوە ئیتر ئیمانت هەمووی ئەدۆرێنی با بشلێت الله م خۆش دەوێی ! .ئێستا خۆ یەهود خۆ ئیدعای خۆشەویستی الله دەکەن (**قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ**

[٦٠]: نونية ابن القيم = الكافية الشافية

---

هَادُوا إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ مِن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ)[٦١] الله بەوە تاقیان دەکاتەوە ، الله تعالی دەفەرمووی : ئەی یەهود ئەگەر ئێوە ئەلێن ئێمە ئەولیا و خۆشەویستی الله ین دە وەرن تەمەنایی مردن بکەن ئەگەر راست دەکەن الله تعالی دەفەرمووی قەت تەمەننای مردن ناکەن ، واتا درۆ دەکەن کەواتە خۆشەویستیەکەیان درۆیە یەهود خۆشەویستیەکەیان درۆیە لەعنەتی الله یان لێ بێ .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لەکۆتایی تەمەنیدا دەفەرمووی : (لعن الله الیهود والنصاری)[٦٢] لەعنەتی الله لەیەهود و نەصارا .

لەو خالە گرینگانەی کە زۆر گرینگە ئەویش ئەوەیە کە ئەوە بزانین کە ئەو عصیانەی کە ئێمە ئەیکەین کە بوو بەچەند ئاستێکەوە جاری وا هەیە بەشێك لەو بەشانە کوفر نیە بەلام عصیان کە دەرجەی خۆشەویستی دەهێنێتە خوارەوە مانای وایە خۆشەویستی هەر ناهێلێ ؟!

نەخێر ئەیهێلێت بۆنمونە : صەحابەیەك لە صەحابەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە حەدیسی نوعیمان مەشهورە ئەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەچیە ؟ ئەوە عەرەقی خواردۆتەوە ، حەدیان لێدا ، دواتر یەکێ لەصەحابەکان لەکاتی حەدەکەدا لەعنەتی لێکرد وتی ئەك بە لەعنەتی الله بی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : لەعنەتی لێ مەکەن ئەوە الله و پێغەمبەری الله دەپەرستێ .

کە تۆ عصیان نێك و سەرپێچیەکت کرد مخالەفەیەکت کرد و گوناهێکت کرد کەوتیتە ناوگوناهێکەوە بەوەی کەتۆ بەشەری وە باوکمان گوناهی کردوە کە ئادەمە ئەکرێ بلێن ئادەم الله ی خۆش نەویستوە ؟! نەخێر دەرەجەی مەحەبەت لە عصیاندا دێتە خوارەوە ئیمان ئەوهایە بەرز و نزم ئەکا .

هەر خۆت سەیر بکە کە تۆ دێتە ناو مەجلیسی زیکرەوە ئیمانت بەرزدەبێتەوە کە ئەچیتە بازارو شوێنی خراپ ئیمانەکە دێتە خوارێی خۆتت بۆ ناگیرێی ، ئەلەو کاتەشدا تۆ هەر الله ت خۆش دەوێی بەس دەرجەکەت دێتە خوارێی پلەکە بەرز دەبێتەو و سەردەکەوێی و دێتە خوارێی هەتا دەمرین ئیمانی ئێمە لەم دوو قوناغەدایە خۆشەویستیەکەشمان بۆ الله بەم شێوەیەیە .

[٦١]:سورة الجمعة اية : ٦
[٦٢]: صحیح البخاري

جا نابیٚ بەهەلە لەو حەدیس تێبگەین وەکو ئەوەی هەندێك ئەلێن : ئارەقیش بخۆرەوە و خۆ هەر ئیمانیشمان هەیە والله شمان خۆش دەوێی نەخێر بەلکو دەبیٚ تۆ بزانیٚ ئایە دەرجەی ئەم صەحابەیە وەکو ئەبو بکر وابوو کە عارەقی نەدەخوارد وەکو عومەر و عوسمان و عەلی وابوون ؟! کە عەشەرەی موبەشەرە بوون؟! نەخێر لە صەحابەش دەرەجاتی بەرز و نزم هەیە ئەوەتا الله تعالی دەفەرمووی : (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ)[٦٣] باسی پێشەکیەکان دەکا ئەوانەی لەپێشەوە بوون ئەوانەی لە نارەحەتیەکاندا لەگەل پێغەمبەر بوون (صلی الله علیه وسلم) صەحابەکانی پێغەمبەر کە لەپێشی یەکەمەکان بوون ئیمانیان بەرزبوویەوە فەرقی هەیە لەگەل صەحابەکانی دوای ئەوانەوە وە صەحابەش هەموویان بەرێزن (الله تعالی لێیان رازی بیٚ ) بەلام ئەوانیش دەرەجاتیان هەیە .

### هۆکاری کەم بوونی ئەم خۆشەویستیە؟:

یەك لەهۆکارەکانی ئەمە بەگەورە راگرتنی الله و بەهەیبەت راگرتنی الله لەدلدا کەم دەبیٚ بۆیەش ئەم خۆشەویستیە کەم دەبیٚ کاتێك هەیبەت و بەگەورە زانینی الله تێدا بوو و زیاد بوو خۆشەویستیەکەش زۆر دەبیٚ.

[٦٣]:سورة التوبة اية :١٠٠

## بەردەوام بوون لەسەر یادکردنەوەی الله تعالی

(أن يكون مولعا بذكر الله تعالى ، لايفتر لسانه ولايخلو عنه قلبه ، فإن من أحب شيئا أكثر من ذكره بالضرورة ومن ذكر مايتعلق به)یەکێکیتر لەنیشانەکانی خۆشویستنی بەندەکان بۆ الله تعالی ئەوەیە کەوا بەردەوام بن زۆر بە خۆشحالیەوە لەسەر یاد کردنەوەی الله تعالی و زیکری الله تعالی ، زمانی نەوەستێی و بێتاقەت نەبێ دلی لێ خالی نەبێ ، چونکە هەرکەسێك کەسێکی خۆشویست زۆر باسی دەکا باسی ئەوشتانە دەکا کە پەیوەستە پێوەی .

(ولهذا أمر الله سبحانه بالعباده بذكر على جمع الأحوال) الله تعالی فەرمانی کردوە بەبەندەکانی لەهەمووکاتێکدا یادی ئەو بکەنەوە . چونکە ئێمە بەندەی ئەوین ئەو خوای ئێمەیە ئەو ئێمەی دروست کردوە و ئەمان ژێنێت و ئەمان مرێنی و رۆزیمان پێ ئەدا دونیا و ئاخیرەتی ئێمە هەمووی بەدەستی ئەوە داوای لەئێمە کردوە یادی ئەو بکەینەوە و دەفەرمووێی یادی من بکەنەوە .(وأمر الله تعالى عباده بذكره في أخوف المواضع) لەوکاتەی کە زۆر لەترس وبێمە ونارەحەتیدان یادی بکەن .

بۆنمونە : الله تعالی دەفەرمووی (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّـهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**)[٦٤] ئەوە لەمەیدانی جەنگدا ئەفەرمووێی ئەی برواداران ئەگەر کۆمەڵەی کافرانتان بینی و شەرکەوتە نێوانتانەوە دامەزراوبن و دابمەزرێن و ثەباتان هەبێ دژی ئەوانە بجەنگێن زۆر یادی الله بکەن لەوکاتەدا بەهۆی ئەو یاد کردنەوەی الله تعالی سەردەکەون .

(فعلامة المحبة الصادقة ذكر المحبوب عند الرغب والرهب)نیشانەی خۆشەویستی راستەقینە بۆ الله تعالی ئەوەیە کە تۆ یادی بکەیتەوە لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا .

### سەرنجێك ئەدەین لەحالەتە خۆشی و ناخۆشیەکانمان :

هەمووتان ئەزانن ئێمە شین و شایمان هەیە هیچی بەو شێوەیە دەروا لەئێستادا ئەوەی کە الله وتویەتی !؟ خۆشی و ناخۆشیەکانی ئەم کۆمەلگایانەی ئێمە کەژن هێنان و مردنە لەو خۆشی و ناخۆشیانەدا لەسەر فەرمایشتی الله تعالی دەرۆین !؟ ،،،،

[٦٤]:سورة الانفال اية : ٤٥

## شاییەکانمان و خۆشیەکانمان :

ئەوە ژنی هێناو دایك و باوك پێ خۆشبوو کەوا کورەکەی ژنی هێنا برۆ هەرچی ئەکەی بیکە بەس الله رازی مەکە ! هەرچ بەندەیەك رازی دەکەی بکە بەس الله رازی مەکە ! ،

جاری لەپێش هەموو شتێك بیغیرەتی ئەو خەلکە دەست پێدەکا بەوەی ئەو ئافرەتە جوانە و لەم تەمەنە جوانەدا نیشانی هەموو کەسێك ئەدەن ، کەس هەیە ژنەکەی خۆیی نیشانی کەسێك بدا !؟ دوای هێنان یاخود پێش هێنانی ئەو ئافرەتە ئەرازێنێتەوە نیشانی خەلکی بدا ؟! ئەو دایك و باوکە ئەو کچەی خۆیان نیشانی ئەو خەلکەی ئەدەن ئەلێن وەرن سەیری کچەکەمان بکەن لەغەیری ئەو کاتەدا !؟ بۆ لەوکاتەدا تۆ ئەبێ نیشانی هەموو خەلکی بدەیی و بیرازێنیتەوە ! رسمی بگرن و هەرچی کەسێکیش هەیە ئاساییە و ئەم سەرو ئەو سەری رسمی کچەکەم بگرن بۆخۆتان و حەلالە بۆتان ئەوە بێغیرەتی نیە ! ئەوە خۆشیەکەمان !.

لەجێگای ئەوەی یادی الله بکەین لەوکاتەدا یادی شەیطان ئەکەین الله تعالی دەفەرمووی : (قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ)[٦٥] تۆ بەبرواداران بلێ چاوی خۆیان بگرن و جێ شەرمی خۆیان بپارێزن ئەمە خاوێنترە بۆ دلیان . هەمووتان ئەزانن ئەگەر نێرینە مێینە ببینێ لەهەموو سنفێك لەئینسانەکان و حەیواناتەکان یەکسەر ئارەزووی هەلدەستێ بەهۆی فیطرەتی ئینسانەکان وایە بۆیە الله تعالی دەفەرمووێی بیشارەوە چاوی خۆت بگرەوە لەوشتانەی ئارەزووت هەلدەستێنی چونکە ئەگەر بینیت توشی نارەحەتی دەبی ، وە هەروەها بە ئافرەتانیش ئەلێ (وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ)[٦٦] . کەچی لەم خۆشیەدا یادی الله مان لەبیر ئەچێ و یادی شەیطان دێتە پێشەوە دەهۆل و زورنا و مۆسیقا و هەلهەلە و هەلپەرکێی و رەسم گرتن و هەرچی الله پێ ناخۆشە دەیکەن ئەمە شاییەکەمانە هی کی هەیە وانەبێ !!؟؟.،،،

نمونەیەك دەهێنینەوە لەوەی ئەگەر مالێکی موسلمان کچەکەیان لەکاتی شایدا دا بپۆشن بەپەچە و عەبا کورەکە بێت بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك ئاگای لێ بێ ببیا پاشان لەرۆژی دوایدا وەلیمەی بۆ بکا خەلکی بانگ بکا پیاوان بەجیا و ئافرەتانیش بەجیا دەعوت و نان بخۆن بەبێ تێکەلاوی گۆرانی و مۆسیقا زیکری الله بکەن و دوعای بۆ بکەن الله تعالی بەرکەت برژێنێت بەسەرتا لەوکاتەشدا یادێکمان هەیە کە زۆرینەی خەلکی لەبیریان چۆتەوە و نایزانن (بارك الله لكما وبارك عليكما وجمع بينكما بخير)[٦٧] دوعای بەرەکەتیان

[٦٥]:سورة النور اية :٣٠
[٦٦]:سورة النور اية :٣
[٦٧]: أخرجه أحمد (٢/ ٣٨١) والدارمي (٢١٨٠(

بۆ ئەکەی ئەمەیە یادی الله لەوکاتەدا . کەس لەوکاتەدا وا دەکا ! یاخود دەلێن کاکە بیبە بۆ صالۆن بیبە بۆ هۆلەکان ، ئەم هەموو سەیارەی بەشوێن دەخا ئەم هەموو پیاوە بەدوایەوە ئاخر چۆن جائیزە شتی وا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم )باسی کەس وکاری ئەو کەسە ئەکا بۆ ئەو ژنە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (إیاکم والدخول علی النساء)فەرموی نەکەن خۆبدەن بەسەر ئافرەتاندا برۆنە مال و بەبێ لەدەرگا دا بن بچنەوە مالەوە وتیان :ئەی ئەگەر دایکمان بوو ؟! فەرمووی : حەز دەکەی دایکت بەرووتی ببینی بەلکو دایکت لەژوورەوە بوو رووت بوو !؟ دەرگا لێ بدە و ئیزن وەربگرە (أفرأیت الحمو؟ قال: الحمو الموت)[٦٨] وتیان : ئەی کەس و کاری پیاوەکە بۆژنەکە ؟ برای پیاوەکە و ئامۆزی و پورزای خالۆزایی فەرمووی : ئەوە هەر مردنە ..

لەبەر ئەوەی لێ ئەمین ئەبێتەوە چەندەها مان بینیوە لەورێگەیەوە توشی زینا بوە لەگەل ئافرەتدا بەم شێوەیە ، ئەلێ برای میردەکەم برامە نەوالله برات نیە مەحرەمت نیە ئەوە بە کاتی لێت حەرام بووە ئەبێ چۆن خۆت لەپیاوێکی سەرجادە دا ئەپۆشی ئەبێ ئەویش بەم شێوەیە خۆتی لێ داپۆشی ئیتر هەرکەسیەتی ئەم هەموو ئەحکامانە زۆر گرینگن بیزانین و جێ بەجێیان بکەین هەر لەوەوەیە کەوا کێشەی کۆمەلایەتی و لەنێو کۆمەلگادا دروست دەبێ گوێت لێ دەبێ فلان فلان کەسی کوشت لەسەر کێشەیەکی کۆمەلایەتی ، تۆ لەسەرەتا نایگرێتەوە دواتر کە کێشەکە دروست بوو بە کوشتن چارەسەری دەکەی .

## شین و تازەییەکان و ناخۆشیەکانمان :

لە تازییە و ناخۆشیەکانمان یادی الله تێدایە سوپاس بۆتۆ یا الله هی خۆت بوو گەراندەوە .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جارێك زەینەبی کچی مندالێکی لەسەر مەرگ بوو ناردی بەشوێن پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) ئەویش لە مەجلیسدا بوو فەرمووی : برۆن پێ بلێن (إن لله ما أخذ ، وله ما أعطی ، وکل شيء عنده بأجل مسمی ، فاصبر واحتسب)[٦٩] سەیری ئەو کەلیمە جوانانە فەرمووی برۆن بە زەینەب بلێن : هەرچی الله بیدا هی خۆیەتی بیگەرێنێتەوە هەر هی خۆیەتی ئێمەش نامێنینەوە هەتا هەتایە هەموومان هەتا کاتێکی دیاری کراوین با صەبر بگرێی و ئیحتسابی ئەجر بکا . وەك هی ئێستا نیە بچی صەحابە کۆبکاتەوە وەرن کاکە تۆپەلێك قور بگرینەوە و بیدەین بەسەرماندا فلان کەس خەریکە ئەمرێی و قیژ وقاژ و هاوار بکەین ئەوە ناوێی هەموومان ئەمرین .

[٦٨]: رواه البخاري ، فتح الباري ٣٣٠/٩ .
[٦٩]: الکتب » صحیح مسلم «کتاب الجنائز باب البکاء علی المیت

ئێستا خۆت دابنێ لەهەر نەفەسێك لەو نەفەسانەی كە تۆ ئەیدەیت یەكێك وەر ئەگریی و یەكێك ئەدەیتەوە حەتمەن لەیەكێكیاندا تۆ ئەمریی الله داویناوە كاتەكەی یەك دەقەش پاش و پێش ناكا خۆتی بۆ ئامادە بكە برۆ لە خێزان و مال و مندال و كەس و كارت بلێ من لە كاتێك لەكاتەكانی شەو ورۆژدا ئەمرم كە مردم وەسیەت بێ سەرەتا من لەسەر ئیمان ئەمرم ان شاء الله ئیمانم بە الله هەیە و بە پێغەمبەران و بە رۆژی داوایی یەكخوا پەرستم و شەریك بۆ الله بریار نادەم تەعزیەم بۆ دامەنێن ئەوەمەكەن ئەوەمەكەن ،، بەریم لەهەموو قیژە و هاورێكتان ، خۆ ئەگەر وانەلێ شەریكی ئەو گوناهەی لە گۆردا كە بەسەرتا ئەگرین و هاوار و قیژە و لەخۆدان ئەكەن بەسەرتا ،حەدیسمان هەیە كەوا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووی : مردوو بە قیژ و هاواری كەس و كارەكەی عەزاب ئەدرێی لەگۆرەكەیدا ، لەبەر ئەوەیە چونكە وەسیەتی نەكردوە كەوا لەدوای ئەودا كە مرد نەیكەن . خۆ كێشەكە ئەمرۆ ئەوەیە ئەگەر وەسیەتیش بكەی هەر دەیكەن ئەلێ ئەوە بۆخۆی وتویەتی خەلكەكە لێمان رازی نابێ ئەلێ تەعزەیم بۆ دامەنێن ئەلێ چۆن تەعزییەی بۆ دانەنین ئەوە بۆخۆی وایی وت ئێمە هەر دایی ئەنێن عەیبە و حەیامان ئەچێ ! !

هیچمان بەپێ ئەو شەرعەی الله نارۆین وەرە سەر مەزهەبی ئیمامی شافعی كە خەلكی ئێرە زۆربەی زۆری ئەلێ من لەسەر مزهەبی ئیمامی شافعیم سەیری كتێبی (أم ، مهذب امامی شیرازي ،شرحي مجموع امامي نەوەوي )بكەن هەموویان ئەلێن تەعزیە حەرامە ئەمەت لەكوێی هێنا ئەم تەعزییە .

كەسەكە مرد چوار شت واجبە لەسەرمان (بیشۆ و كفنی بكە و نوێژی لەسەر بكە و بیبە بۆ سەر قەبران) الله لێ خۆش بێ ئێمەش دەمرین ، وەرە دە رۆژ بیست رۆژ دانیشە داوای ئەم دانیشتنە ئەی ئافرەتان كاتێك كە خێمە هەلدەدەن و قور دەپێون دوای مانگێك ئەتان بینەوە لەدەرەوە سافیرە و بەرەلا گۆرانی و مۆسیقا هەر لەگەل بەهارێكدا لەدوای ئەوە سەر چۆپیكەش ئەگرن رۆیی وەزعەكە ئاوایە !

ئەم دونیایە بەمردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) نەوەستا بە مردنی هەر چوار صەحابەكە بە مردنی هەموو پێغەمبەران و ئەنبیاء نەوەستاوە هەر ئەروا هەتا رۆژی قیامەت نا وەستێ ، ئەم نەوەستانە تۆ دەبێ عیبادەتی تێدا بكەی نەك تۆ لەبەرامبەر الله تعالی دا نارازی دەرببریی .

ریش ناهێلێتەوە ئەی كاكە واجبە كەچی مردوەكەی ئەمرێی ریشێك ئەهێلێتەوەیەلێ ئەوە چیە ئەلێ تەعزەیەم هەیە یەكێك لەنیشانەكانی هەبوونی تەعزییە لە ئێستادا ریش بهێلێتەوە ! ! كە ریشی هەبوو پێ دەلێن تەعزییەت هەیە ! .

ئەبێ ئاگادار بین نیشانەی راستەقینەی خۆشەویستی الله تعالی ئەوەیە لەكاتی خۆشی و ناخۆشیدا یاد و زیكری الله تعالی بكەی واتا الله ت لەیاد بێ بزانە الله چی وتوە ، خۆ ئەگەر ئەیكەیت باشە خۆت رزگارت

ئەبێ خۆت سەرفراز ئەبی ئەگەر نایکەیت خۆت مال وێران ئەبی هەمووشت لەسەر نوسراوە خال بەخالی ژیانت .

(.ومن الذكر الدال على صدق المحبة سبق ذكر المحبوب إلى قلب المحبوب ولسانه عند أول يقظة من منامه وآخر شيء يذكره قبل أن ينام مرة أخرى) سەیری خۆمان بکەین ئەلێ لە نیشانەی خۆشەویستی الله ئەگەر تۆ الله ت خۆش دەویێ یەکەمجار کە لەخەو هەلدەستی بزانە یەکسەر یادی الله ئەکەی ! ئێمە زیکرمان هەیە لەدوای خەو کە خەبەرت ئەبێتەوە لەخەو زیکرێمان هەیە ئەلێ (الحمدلله الذي أحيانا بعدما أماتنا و إليه النّشور)[70] (الحمد الله الذي عافاني في جسدي ورد علي روحي وأذن لي بذكره)[71] بەو زیکرو یادە تۆ خەبەرت ئەبێتەوە پێغەمبەری خۆشەویستمان بەم شێوەی دەوت و دەی خوێند پاشان ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی ال عمرانی دەخوێند (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ،،،،،،،،، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)[72] ئینجا هەلدەستا دەست و نوێژی هەلئەگرت بەزیکری الله خەبەری ئەبێتەوە ، تۆش وایت ئەوە نیشانەی خۆشەویستی راستەقینەیە بۆ الله یەکسەر یادی الله بکەیت ، سوپاس بۆ ئەو الله یە کەوا خەبەری کردمەوە و رێگەی دام کەوا یادی بکەمەوە سوپاس بۆ ئەو الله یەی کەوا لاشەی پاراستم منی زیندوو کردەوە ئەمە لەکاتی بەخەبەربوونت . لەکاتی خەو کە دەچێتە سەرجێگا ئاخیر قسەت یادەی الله تعالی بێ (بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحْيَا)[73] یا الله بەناوی تۆ من ئەمرم و زیندوو ئەبمەوە (اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ)[74] یا الله بمپارێزە لەعەزابەکەت لەو رۆژەی کە بەندەکانت زیندوو ئەکەیتەوە ، سەرەتای رۆژەکە و کۆتایی شەوەکە بە یادی الله دەست پێدەکا و کۆتایی پێ دەهێنی ئەمەش نیشانەی خۆشویستنی الله یە بزانە تۆش وایت ! ؟

یادەکانی الله تعالی لەهەموو بوارەکاندا زۆر گرینگە ئەوە ریسالەیەك هەیە زۆریشە و (حسن المسلم )یاخود چەندەها ریسالەیتر پریەتی لەیادی الله تعالی هەلسای چی ئەلێ چویت بۆ بازار چی ئەلێت دەست نوێژت گرت چی دەلێت ئەوەت کرد چی دەلێ ،،،،بەتایبەتی زیکری بەیانیان و ئێواران وە ورد بوونەوە لەوزیکرانە و تەدبرکردن لێ و تیگەیشتنی زۆر گرینگە .

[70]:رواه البخاري
[71]: سنن الترمذي
[72]:سورة ال عمران اية : ١٩٠-٢٠٠
[73]: رواه البخاري برقم (٦٣٢٤). من حديث حذيفة رضي الله عنه.
[74]: رواه أحمد برقم (١٨٦٦٠)

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو : چەندم پێ خۆشە بەیانیان لەدوای نوێژی بەیانی لەگەڵ ئەو صەحابانە دانیشم هەتا خۆر دەر ئەکەوێی یادی الله بکەم عصرانیش تاخۆر ئاوا دەبێ یادی الله بکەم ، ئەگەر ئینسان بۆی گونجا و ئیش و کاری نەبوو ئەوها بکا بەم شێوازە زۆر باشترێکە بەشی ئەوە زیکرانەش بهێڵەوە ئەگەر ئیش و کاریشت هەبوو ئەوزیکرانەش دەدەقەیەکی پێ دەچێ وە ئەم زیکری بەیانیان و ئیوارانە زۆر گرینگە و گەورەیە لەدەست خۆتانی مەدەن .

کاتەکەی :دوای نوێژی بەیانیان و دوای نوێژی عەصرانە بەیانی هەتاوەکو خۆر دەرئەکەوێی وە عەصریش هەتاوەکو خۆر ئاوا ئەبێ ئەمە مەجالەکەیەتی .

ئەم زیکر و یاد کردنەوەی الله هەر بەدەم نەبێت ئێستا زۆر کەس دەیلێت بەس بەخۆشی نازانێ چی دەلێت و لێ تێ ناگا وە سەرەنجی زۆر کەس ئەدەم ئەم زیکرە وەکو پێویست ناکەن کەلیماتێك لەدەمیان دەر ئەچێ کە مانای تەواوی زیکرەکە نادا بەدەستەوە ئەبێ بەلەسەر خۆیی و بیلێت و مانای تەواو بدا (سبحان الله الحمدلله ولا اله الا الله والله أكبر) دواتر بزانە ئەلێ چی !

سبحان الله : واتا یاالله تۆ پاکی و شەریکت نیە و نوقسانت نیە من هیچ شەریکێك بۆتۆ قەرار نادەم کەس حەدی نیە ببێت بەشەریکت نە پێغەمبەران نە مەلائیکە نەپیاوچاکان چ جای پیاو خراپان پیاو چاك نابێت بەشەریکت پێغەمبەر محمد (صلى الله عليه وسلم) نابێ بەشەریکت چ جای پیاوخراپان .

الحمدلله : یا الله سوپاس بۆتۆ حمد لە شوکر گەورەترە یا الله من حمدی تۆ دەکەم سەنا لەسەر تۆ دەکەم کە تۆ یەك خوای بەس نەبوو دوو خوا نەبووی تێك دەچووین گەر دوو خوای تێدا بایە سەیرکەن ولاتێك دوو مەلیکی تێدا بێ وێران دەبێ بەس نەبوو ئەم کەون و کائیناتە یەك خوای تێدایە حمد و سەنا بۆتۆ لەسەر ئەوەی یەکی خوایە پاشان حمد و سەنا بۆتۆ لەسەر هەموو نیعمەتەکانت ئەگەر باران نەبارێت و زەوی سەوز نەبێ ئێمە چی بکەین ، باشە ئێوە بیر لەوە ناکەنەوە دەی با باران نەبارێت بزانم هەموو دونیا ئەتوانی دلۆپێك باران ببارێنێت ؟! دەبا ئەو دانەوێلە سەوز نەبێ هەموو دونیا دەتوانی دانەوێلەیەك سەوز بکا ؟! حمد لەسەر ئەوە ئەکەین الحمدلله ، حمد لەسەر ئەو ئیمانە دەکەی کە پێ بەخشیوین بەس نیە بەچکە یەهودیی نین بەس نیە گاور و جولەکە و بوزی و جن پەرست و مشك پەرست نی الحمدلله سوپاس بۆتۆ یا الله کە منت بەموسلمانی دروست کردوە ئەمەیە الحمدلله و بەبەردەوامی تۆ دووبارەی دەکەیتەوە .

الله أكبر :ئەو کەلیمەیە کە لەدەمان دێتە دەرەوە و دەلێن الله أكبر لەدلیشماندا وایە بەس الله أكبرە . أكبر واتا گەورەترینی گەورەترەکان ئایە وایە ئەگەر الله گەورەترینی گەورەترەکانە لەلامان بەورۆژە نەدەگەیشتین ئێستا کە هەمانە کە لەمزگەوتە و نوێژە الله أكبر کە چوە دەرەوە نەخێر ژنەکەم أكبر نەوالله

پارەکەم أكبر  نەواللە کاربەدەستەکەم أكبر نەواللە هەموو کەسێك أكبر بەس الله أصغره (والعیاذ بالله)ئەمە واقیعەکەمان بەزمان وائەلێن لەدلماندا نیە ئەگەر لەدلماندا بووایە وەکو پێغەمبەر و صەحابەکان وەکو تابعیەکان هەموو دونیایان ئەگرتە دەست بەدینی الله تعالی دەیانبرد بەرێوە .

ئەو زیکرانە کە دەیلێت و دەیکەیت دەبێ وابێت کەوا لەچاوتدا ئاوبێتە خوارەوە لەگەل کردنی.

پرسیارێك : چەند پێ دەکەنی لە شەو رۆژێکدا و چەندیش دەگرێت ؟! هەمووتان خۆتان بەو نیسبەتەوە سەیربکەن لەم ٢٤ سەعاتەی شەو رۆژەدا چەند سەعات پێ دەکەنی و چەند دەقە دەگریی گریان لەترسی الله .

الله تعالی دەفەرمووی : (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ)[٧٥] بەراستی ئیمانداری حەق کەیادی الله ی کرد دلی ئەلەرزێت دلی ئەترسی لە الله تعالی لەگەل ناوی هێنا ئەو عەزیمە ئەو کەسە بیر لەوە دەکاتەوە کێ نالێ لەرۆژی قیامەت کەوا راوەستاوە مەحکەمەی ئەکات کێ نالێت ئەبیات بۆ ئاگر لێ ئەترسێ بەترس و بیمەوە یادی الله تعالی دەکا بەم شێوەیە یادی الله دەکرێی (وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ)یانی (فزعت قلبوهم)ئەترسێ (وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا)[٧٦] کە ئایەتەکانی الله ی بۆ دەخوێنیتەوە ئیمانی زیاد ئەبێ ، ئەمرۆ ئایەتی الله ی بۆ دەخوێنیتەوە ئەلێت کاکە ئێمە لەتۆ موسلمانترین باسی مەکە !! لەبەر چی باسی نەکەم ئەگەر موسلمانی ئەلێت بیخوێنەرە و زیاتریشم بۆ بخوێنەرەوە با دلەکەم نەرم بێتەوە ، ئەوە نیشانەی ئەوەیە دلەکەت هیچی تێدا نیە دلەکەت درۆ دەکا لەگەل خۆشەویستی الله . بەتایبەتی ئینسانی موسلمان وەکو لەکوردەواری دەلێن (پیاو عەیبە باسی خۆی بکا ) نابی باسی ئیسلام و ئیمانی خۆت بکەیت منەت بکەی بەسەر خەلکیدا و بلێت من لەتۆ موسلمانترم ، تەنها الله دەزانی کێ لەکێ موسلمانترە ، الله تعالی دەفەرمووی (فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى)[٧٧] کەس بەخۆی نەلێ من باشم و خراپم تەنها الله دەزانی کێ باش و خاوێنە بترسە لەخۆت و خۆت ئیتهام بکە نەك خۆت وەصف بکەی ،ئەگەر لەوبوارەدای ئەگەر یاتەکانی الله ت خوێندەوە بزانە دلت ئەلەرزێی ئەگریت و ئەلەرزیی!؟ جێگەی خۆیەتی تی بفکرین !!.

بۆنمونە ئێستا ئەگەر نامەیەکت لە بەرپرسەکەوە بۆ بێت هەزارجار چاوت زەق دەکەیەوە بزانی دەتەوێت بزانی چی تێدایە دلت ئەترسێ فلان کەس نامەی ناردوە گەر هەلەشە و گورەشە بێ ئەترسی !، الله تعالی

[٧٥]:سورة الأنفال اية :٢
[٧٦]: سورة الأنفال اية :٢
[٧٧]:سورة النجم اية :٣٢

---

ئەو نامەی ناردوە بۆ ئێمە هەرەشەی تێدایە (لِتُنذِرَ قَوْمًا)[٧٨] واتا بیان ترسێنە بەئاگری جەهەنەم وە بەشارەت وموژدەشی تێدایە بۆئەو کەسانەی کەوا بەقسەی ئەکا ئەوە بەقسەی ئەکا بەشارەتی بدەنی ئەوەشی بەقسەی نەکا بیترسێنە (وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ)[٧٩] پشت بەخوای خۆیان ئەبەستن .

حەدیسەکەی حەوت تاقەمەکەی کە لەژێر سێبەری الله دا حەشر ئەکرێن کەس بیری لێ کردیتەوە و جێ بەجێ کردوە .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی (سَبْعَةٌ يُظلُّهم اللهُ في ظلّه يومَ لا ظِلَّ إلا ظلُّه\حەوت کۆمەل لە ژێر عەرشی الله دا حەشر ئەکرێن کە لەورۆژەدا سێبەر نیە إلا سێبەرەکەی کە الله دروستی کردوە ئەو مخلوقە سێبەرەکەی کە الله دروستی کردوە کە زۆر لە علما رایان وایە سێبەری عەرشە :

(إمامٌ عادلٌ)پێشەوایەك کە خەلکی حوکمرانی ئەکا بەعەدلی دینی الله تعالى .

(وشابٌّ نشأ في عبادةِ اللهِ عزَّ وجلَّ)گەنجێك هەر لەمندالیەوە پەروەردە بووە بە عیبادەتی الله .

(ورجلٌ قلبُه مُعلّقٌ بالمساجدِ)پیاوێك دائیمەن دلی بەمزگەوتەوەیە هەرکاتێك بروا حەز دەکا زۆر بگەرێتەوە و کاتی گەرانەوەی بێ .

(ورجُلانِ تحابَّا في اللهِ اجتمَعَا عليه وتفرَّقَا عليه)دوو کەس لەپێناوی الله یەکیان خۆشویستبێ کە ئەگەن بەیەك لە پێناوی الله کۆئەبنەوە و کە جیاش دەبنەوە لەپێناوی الله دایە ، جا جیابوونەوە مەبەست پی عاجز بوون نیە چونکە ئەمانە هەردووکیان لە ژێر سێبەری عەرشی الله دا حەشر دەکرێن ئەویتر گوناهی کردوە ئەو لێ تورە بووە یان کافربووە لێ لێ جیابۆتەوە ، نەخێر بەلکو واتا ئێستا مەجلیسێك هەیە کۆبووینەوە دواتر جیا ئەبینەوە لەسەر خۆشەویستی الله کۆدەبینەوە لەسەر خۆشەویستی الله جیا دەبینەوە .

(ورجُلٌ دعتْهُ امرأةٌ ذاتُ مَنصِبٍ وجمالٍ فقال إني أخافُ اللهَ) کەسێك ئافرەتێکی زۆر جوان و خاوەن پلە و پایە داوای لێ بکا زینای لەەل بکا بلێ من لە الله ئەترسم ئەی ماشا الله لەو ئیمانە چەند گەورەیە.

(ورجلٌ تصدقَ بصدقةٍ فأخفاهَا حتى لا تعلمَ شمالُه ما تنفقُ يمينُ)کەسێك خێرێك ئەکا بەدەستی راستی چەپی نازانی ، علما ئەلێن مەبەست پێ شاردنەوە خێرەکەیە خۆ ئەگەر ئاشکراش بکرێی خێرەکە هەر ئەبێت بەس ئەمە جۆرێکە لەو جۆرانەی بۆ ئەوەی کەسەکە بیدرێتی و رووی ناشرین نەکرێی لەپێش چاوی خەلکیدا .

[٧٨]:سورة يس اية :٦
[٧٩]: سورة الأنفال اية :٢

ئەم خالەیە کە پەیوەستە بە بابەتەکەی ئێمەوە (ورجلٌ ذكرَ اللهَ خاليًا ففاضتْ عَيناه) کەدەفەرمووی رجل تەنها مەبەستی پیێ پیاو نیە موسلمان دەگرێتەوە هەمووی ، موسلمانێك یادی الله دەکا بەتەنها دائەنیشی بۆخۆی لەماڵەوە لەشوێنێك کەسی تێدا نیە دەست دەکات بەگریان فرمێسك ئەبارێنی ئائەم جۆرە کەسانە لەژێر سێبەری عەرشی الله دا الله حەشریان ئەکا )[٨٠] ئینجا لێرەوە پرسیارەکەم دەکەم چەنێکمان دانیشتین بەتەنها لەنێوە شەو کەوتینە گریان بەسەر گوناهەکانمان بیرمان لەخۆمان کردەوە یان مانگ و دوومانگ ساڵ و دەساڵ دەروا ئەگەر بەس لەشین و ناخۆشیەکانمان بیری گریانمان بکەوێتەوە ئەویش لەبەر ئەوەی تا خەلك نەلێت ئەوە ناگریت زۆرمان بیستوە لەئافرەتان قوری پێواوەتەوە وتویەتی کاکە عەیبە خەلك ئەلێ ئەوە بۆ مردوەکەی نەگریا ئەویش بۆ الله نیە مەبەستمان ئەوەش نیە بلێن کەس هەر نیە هەیە بەس کەمە (وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ)[٨١] کەم ئەو کەسانە لەراستیەتی ئەو قسانە هەرکەسە و لەناخۆی خۆیدا ئەو قسانە بکا بزانن رێژەی گریان و پێکەنینتان چەندە (**فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا**)[٨٢] کەم پیێ بکەن و زۆر بگرین .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (َ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ.)[٨٣] زۆر بەی زۆر ئەو کەسانەی کەوا پیێ ئەکەن زۆر بەی پیێ کەنینەکانیان دلیان ئەمرێنی وپیێ کەنین دل ئەمرێنی ،هەر پیێ بکەنە و هەر پیێ بکەنە دلت ئەمرێی ، کەچی لەولاشەوە دێن وەصفی پێکەنین دەکا و دەلێت پیێ کەنین وا ئەکا و وا ئەکا وا بەرزت ئەکاتەوە .!! ناوالله وا بیێ ئاگات ئەکا ئاگات لە نفست نامێنی چی دەکا . وە ئێمەش نالێن پیێ کەنین حەرامە پێغەمبەر پێش کەنیوە (ًصلى الله عليه وسلم) بەس هەموو حەیاتی دەمی نەکردۆتەوە پیێ بکەنیێ (صلى الله عليه وسلم) گریانەکانی زۆرترێکە لەپێکەنینەکانی .

## توڕەبوون لەسەر مافەکانی الله تعالى

(أن يغار لله فيغضب لمحارمه إذا انتهكها المنتهكون و لحقوقه إذا تهاون بها المتهاونون فهذه هي غيرة المحب حقاً، والدين كله تحت هذه الغيرة فأقوى الناس ديناً وأعظمهم محبة لله أعظمهم غيرة)

[٨٠]: رواه البخاري
[٨١]:سورة سباء اية :١٣
[٨٢]سورة التوبة اية :٨٢
[٨٣]: أخرجه أحمد (٢/٣١٠ ، رقم ٨٠٨١(

یەکێکیتر لەنیشانەکانی خۆشویستنی الله لەلایەن بەندەکەیەوە ئەبێ غیرەتی هەبێ بۆئەوەی کاتێ حەق و مافەکانی الله تعالی پێشێل کران پێ ناخۆش بێت و توره ببێ .

کاتێك کە خێزانەکەی ئەچێ حیجابی شەرعی فرێی ئەدا عەبا و پەچەکەی فرێی ئەدا پانتۆل و تەنورە لەبەر ئەکا و خۆی دەر ئەخا بۆ خەلکی سورا و سپیا و ئەکا بۆ خەلکی ئەبێ غیرەت بیگرێی پێ بلێ تۆ سنوری الله ت بەزاند نابی رازی بێت دوو جار ئەبێ غیرەتی بیگرێی جارێك نابێ وابێ غیرەتێکیش لەسەر شەرەف و کەرامەتەکەی خۆیی ئاخر چۆن عەرز و ناموسی خۆیی پێشکەشی خەلکی دەکا من پێم سەیرە زۆر !! با غیرەتمان هەبێ لەسەر مال و مندالەکانمان ، پێ دەلێ برۆ پانتۆل لەپێ بکە کچەکانمان برۆ خۆت سافیرە بکە کوا غیرەتت منالەکەی کوفر ئەکا پێ ئەکەنێ ئەلێ لێ گەرێی کاکە هێشتان عومری نەبوە بە ١٨ سال لای ئێمە ١٨ سال نیە لای ئەوروپا ١٨ سالە لەلای ئێمە بالغ بوونە خۆتان ئەزانن ئینسان بەچی بالغ ئەبێ ئەگەر بە عومر ئەلێ زۆربەی علما یان ئەلێن لە ١٥ سالی ئیتر باسی بالغ بوون ئەکەین دەلێت تا ١٨ سال منداله کچێکی زل و کورێکی زل هەموو شتێك ئەزانێ دەلێت منداله ! کوفر ئەکا و نوێژ ناکا دەلێ لێ گەری مندالەکاکە جاری سەری لێ تێك مەدە ئەوە گەنجە جاری کە گەورە بوو ئەگەرێتەوە !! ئەوە خۆشەویستی الله بەم شێوەیە دەبێ ! ئاخر بۆیە مندالەکانی ئەم زەمەنە ئاوای لێهاتووە .

لەکار وکاسبەیەکەیدا هەزار دۆر و دزی دەکرێی غیرەتێك نایگرێی (**وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ**)ئەدرێی بەگوێدا گوێی لێ نیە ئاخر ئەوە خواردت و ئەو دزیەت کرد ئاخر بۆ کوێی ئەبەی .

دین هەمووی غیرەتە و هەمووی لە ژێرئەوەدا کۆدەبێتەوە تۆ ئێستا کە ئەگەر کەسێکت خۆش بوێی کەسێك تەعدای لێ بکا رازی ئەبێ ؟!ئەی بۆچی بۆ الله بێ دەنگ ئەبی ئەگەر خۆشت دەوێی دیارە خۆشت ناوێی کە بێ دەنگ ئەبی ، ئینجا ئەمێنێتەوە سەر دووشت بەلایەنی کەمەوە بەدل پێت ناخۆش بێ ئێمە حەدیسمان هەیە ئەگەر شتەکەت پێ ناگۆرێت بەدەست بەزمان ئەگەر بەزمانیش پێت ناگۆریی بەدل ، کەچی ئەمرۆ دلەکەش نەماوە ئەلێ کاکە هەر کەس بۆخۆیەتی من عیلاقەم چیە ، بەلام ئەگەر بێتوو دەستکاری دینار و دۆلارەکەی بکرێی عیلاقەی هەیە دەستکاری شتێك بکرێی کە مقدەس بێ لەغەیری الله عیلاقەی هەیە ناوی کەسێك ببرێی غەیری الله کە ئەو خۆشی دەوێی عیلاقەی هەیە بەس الله قەینا کە موشکیلە نیە جوێنی پێ ئەدرێی هەرچیەکی پێ ئەدرێی کەس قسە ناکا ئەمە نیشانەی خۆشەویستی الله یە ؟! .

## رازیبوون

(ان یرضا بماا یصبه فی سبیل محبوبه لا لحضا وراء ه بل لیکون مراد المحبوب فیکون ألذ الشیاء أعندهما فیه رضا محبوبه ولو کان فی ذلك هلك نفسه ) ئەبیٚ رازیبیٚت کەوا لەپیٚناو خۆشەویستەکەیدا چی بەسەردیٚت چ جۆرە ئازار و ئەشکەنجە و نارەحەتیەك دیٚتە ریٚگەی هەتا ئەگەر مردنیش بیٚتە ریٚگەی ئەوە نیشانەی خۆشەویستیە رازیبت بەوەی کەوا چی بیٚتە ریٚگەت لەپیٚناو خۆشەویستی الله تعالی دا نەك لەبەر ئەوەی کەوا مەبەستیٚکی دونیاوی لەشتەکەدا هەبیٚ بەلکو لەبەر ئەوەی کە ئەوشتە مەبەستی خۆشەویستەکەتە کە خۆتی لەپیٚناودا ئەدەی بەکوشت ،لەبەر ئەوە خۆشترین شت بەلایەوە رازیبوونی الله تعالی یە .

هەرئەمە بوو بۆتە هۆكاری ئەوەی كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)لەپێناوی الله دا بكوژرێن لەقورئاندا سەیربكەن چەندەها پێغەمبەر كوژراون لە پێناو الله دا ، لەبەر ئەوە لەناو چوونی نەفسیان هەلبژاردوە لە پێناوی الله تعالی دا چونكە خۆشەویسترین شت لەژیانیاندا الله تعالی بووە گوێیان نەداوەتە ئەوەی كەوا ئەگەر سەرو مالیشیان لەپێناودا دابنێن ، هەر ئەمە بوو كەوا صەحابە لەگەل پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) سینگ و دەمو چاو گیانیان رووبەرووی ئەو هەموو رم و تیر و ئەشكەنجە وئازارەی كافران بكەنەوە ، یاخود لە پێش ئەوەی بچنە مەدینە ئەو هەموو ئەزیەت و ئازار و نارەحەتەی كە بەسەریاندا هات لەشاری مەككە لەپێناوی پارستنی دین و عقیدەكەیاندا بوو چونكە ئەیانزانی ئەو ئیمانە خۆشترین شتێكە لەلایەن كەوا رازیبونی الله تعالی تێدایە ، الله بەوە رازییە لێیان كە دین و ئیمانیان بپارێزن ، ئەوە نەبوو لەخۆشحالیدا الله بپەرستن لەناخۆشیدا وازی لێ بهێنن وەك زۆربەی حالی خەلكی (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ)[٨٤] ئەگەر خۆشی بێتە رێگایان الله دەپەرستن كە نارەحەتی هاتە پێشەوە وازی لێ دەهێنێ نابێ بەم شێوەیە بێ نیشانەی خۆشەویستی الله ئەوەیە لە نارەحەتیەكاندا زیاتر تۆ دەست بگریی بە عیبادەتی الله تعالی وە.

(وهذا لایكون إلا لنفس المطمئن)ئەمەش دەست نادا إلا بۆ ئەو نەفسانە نەبێت كە موتمەئینن .

## سێ جۆرە نەفسمان هەیە:

١–نەفسی مطمئینە: الله تعالی دەفەرمووی (يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي)[٨٥] الله تعالی بە نەفسە مطمئینەكان ئەلێ بگەرێنەوە بۆ لای رەزاو رەحمەتی الله تعالی بگەرێنەوە بۆ بەهەشتەكەم .

ئەم نەفسە ئەوەیە هەرچی واجبەتەكان جێ بەجێ دەكا وە هەرچی مستەحەباتەكان هەیە جێ بەجێ دەكا هەرچی حەرامەكان هەیە وازی لێ دەهێنی وە هەرچی ئەوشتانەش مەكروهـ وازی لێ دەهێنی یانی كارەكانمان ئەگەر سەیری بكەین بەشێكی واجبە ئەبێت بیكەی وە بەشێكی حەرامە نابێ بیكەی ئەوە نوێژ واجبە و رۆژوو واجبە و زەكات واجبە هەتا دوای ئەوە شیرك حەرامە عەرەق خواردن حەرامە زینا حەرامە هەتا دوای ئەمە حەرامەكانە و ئەمە واجبەكانە ئەم نەفسە هەموو ئەمانە دەكا هەموو ئەوانەش ناكا ، ئینجا هەندێك شت هەیە نزیكن لەوانە پێیان ئەلێن مستەحەبات ئەوشتانەی كەوا سونەتن ئەوانەش دەكا

[٨٤]:سورة الحج اية : ١١
[٨٥]:سورة الفجر اية : ٢٧-٣٠

نالێت فەرزەکەم کرد خوای دەکرد فەرزەکەم الله قبولی دەکرد تاقەتی سونەتەکەم نیە بەلکو سونەتەکانیش دەکا بۆ تەواو کردنی وە بۆ ئەوەی خۆشەویست بێ لەلای الله تعالی ، ئەوشتانەشی کە نزیکن لە حەرامکراوەکان کە ناکا کەپێ دەوترێ مەکروهاتەکان ئەویش ناکا و نزیکی نابێتەوە ئەمەیە نەفسی مطمئینە.تووشی شەهەوات و شوبهات نابێ لانادا هەزارکەس قسەی بۆ بکا لەولا و لەولاوە گوێی پێی نادا هەر رووی کردۆتە الله تعالی و هەر رازیبوونی ئەوی دەوێی.

جا ئەلێ ئەم خۆشەویستیە ئێستا باسمان کرد بۆ کەس نیە بۆئەمانە نەبێ .

٢–نەفسی لەوامە (لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ (١) وَلا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ)[٨٦]نەفسی لەوامە ئەوەیە کەوا گوناه دەکا بەلام دوای ئەگەڕێتەوە بۆلای الله ئەلێ باشە من بۆ ئەو گوناهەم کرد خۆی سەرزەنشت دەکا و خۆی لۆمە دەکا ئەزانی هەلەی کردوە ماوەیەك چاك ئەبێ پاشان ئەگەریچتەوە ئەگەڕێتەوە سەرگوناهەکەی دیسانەوە خۆی لۆمە ئەکاتەوە وەك ئەم نەفسەی یەکەم نیە نەفسی یەکەم زۆر زۆر کەمن نەفسی دووەمیش تێدا زۆرە هەلە ئەکا وئەگەڕێتەوە ،ئەلێن هەر باشە مادەم لۆمەی خۆی دەکا هێشتان دلەکە نەمردوە .

٣–نەفسی ئەمارە خراپ و سو (إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي)[٨٧] نەفس بەعام ئەمرت پێ دەکا بەخراپە إلا مەگەر الله رەحم بکا .

هەر پێت ئەلێ بیکە خۆ هیچ نیە دەبیکە نابینی خەلك چی دەکا دەتۆش بیکە وەك ئەم خەلکە دواتر تەوبە دەکەی ئێستا بیکە سەیر دەکەی هەر لەکردندایی .

ئینجا ئەم سێ نەفسەیە نەفسی یەکەمە کە باسمان کرد (وهذا لايكون إلا لنفس المطمئن) کە لەپێناوی الله تعالی دا رازییە هەر شتێکی بەسەربێ ، ئەمرۆ سەیری حالی خەلکی بکەی هەرکاتێك هەرەش کرا لەنوێژ و مزگەوت و دەرس خوێندنی شەرعی هەمووی دەکشێتەوە ئێ باشە خۆ ئێمە زینامان نەکردوە لە مزگەوت ئێمە چی دەکەین خۆ کەسمان نەکوشتوە بەناحەق خۆ دزیمان نەکردوە دا ئەنیشین وسەیری کەلامی الله دەکەین و دەخوێنین ، کەچی باوکەکان ئەلێ نەچیتە مزگەوت خەتەرە کەستان بینیوە لە صەف نوێژدا عەرق بخواتەوە یاخود زینا بکەین ئەی بۆ نالێت مەچوە بازار خەتەرە .

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : خۆشەویسترین شوێن لەلا الله مزگەوتەکانە خراپترین شوێنیش بازارەکانە .

[٨٦]:سورة القيامة اية :١-٢

[٨٧]:سورة يوسف اية :٥٣

باشه واقیع وانیه نابینن كه وایه ئادەی مندالێك بنێرە ئەم بازاره بزانه به ئەخلاقێكی جوانەوه بۆت ئەگەرێتەوه ئەی بینێره بۆ مزگەوت ئەمرۆ ئەو كەسانەی مولحید و كافرن كەوا روو لەالله نین حەزناكەن ئەم قورئانە سەركەوێی هەروەكو ئەوانەی زوو (لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ)[88] گوێیان بۆ مەگرە ئەگەر قورئان وترا لەغەوە چیەتی بكەن باكەس تێ نەگا.

لەپێناوی الله دا چیت بەسەرهات الحمدلله دواتر ئێمه هەردەمرین هەر دەگەرێنەوه بۆلای الله لەپێناوی الله دا هەرشتێكت بەسەر بێ هەر دەگەرێتەوه بۆلای ئەو الله تعالی ئەتخاتە بەهەشتەكەیەوه بە فەزلی خۆیی لەوه خۆشتر دەبێ ئەی ئەگەر ئەوه نەكەی ؟! بەخوا نە دونیاكەت رازی كرد و خەلكەی لەخۆت رازی كرد نە الله كە و قیامەتەكەشت لەدەست دەچی ! .

جاری یەهود و نەصارا بەهیچ شتێك لەئێمه رازی نابن هەتاوەكو شوێنیان نەكەویی الله تعالی دەفەرمووی (وَلَن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ)[89] هیچ كاتێك یەهود و نەصارا لێت رازی نابن هەتا شوێنیان نەكەویی ، جوان سەیری ئایەتەكە بكە ئەلێ (حَتَّى تَتَّبِعَ)یانی لەلای ئەوان نابێ ببیت بە سەرۆك و گەورەی ئەوان گەورەی تۆ قبول ناكەن هەر دەبێت خادم و خزمەتكاریان بی بەم شێوەیە ئەوان لێت رازی دەبن . هەر خزمەتكاریان بم و الله ش لێم رازی نەبێ و ژیانەكەشم هەروا لەناخۆشیدا بێ ئەمە چ ژیانێكە بەس بەمن بلێ مردن لەوه خۆشتر نیە ! .

(فإذا كان ما يصيب به فی الله وفی مرضات ومحبة رضيت بما نالها فی الله وهذا شأن كل محب صادق يرضا بما يناله فی رضا محبوبه من المكاره )هەرشتێكی بەسەربێ لەپێناوی الله تعالی دا لەپێناو رازیبوون و خۆشەویستەكەیدا ئەو نەفسە رازییە بەوەی كەوا بەسەری هاتوه ئەو نەفسە مطمئینە جا ئەمە شەئنی هەموو كەسێكی خۆشەویستە بۆ الله تعالی .

(من ادعی محبة محبوب ثم سخط ما يحبه وأحب ما يسخطه فقد شهد علی نفسه بكذبه وأسخط عليه محبوبه .)هەركەسێك ئیدعای خۆشەویستی خۆشەویستێك بكا دواتر نارازیی بێت بەوشتەی كە ئەو چی پێخۆشە یاخود خۆش حال بێ بەوشتەی كەوا ئەوكەس چی پێ ناخۆشە ئەوه خۆشەویستی نیە .

(ومن لم يرض بما يصبه في سبل محبوبه فلينزل في درجة المحب) هەركەسێك رازی نەبێ بەوەی كەوا توشی هەرشتێك ببێ لەپێناوی خۆشەویستەكەیدا لەرێگای ئەو خۆشەویستەدا چی تووش بێ رازی نەبێ بەوشتە بادابەزێت لەدەرەجەی مەحیبەت باسی بانگەشەی خۆشەویستی نەكا .

[88] :سورة فصلت اية :٢٦
[89] :سورة البقرة اية :١٢٠

(وهذا هو رضا  بالله ربا وبالاسلام دينا وبحمد رسولا)یەكێك لەزیكرەكانی ئێوارن و بەیانیان ئەلیٚ (رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا ، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا ، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا)[90] تۆ بەیانیان و ئێواران دەلیٚ من رازیم بەوەی الله پەروەردگارم بیٚ الله رێپیشاندەری من بیٚ الله خوا و پەرستراوی من بیٚ رازیم بە محمد (صلى الله عليه وسلم) رێبەری من بیٚ رازیم بە ئیسلام كە دینی من بیٚ ئائەم رازیبوونەی كە تۆپیٚ رازیت دەبیٚ بزانی ئاخر لەپێناویدا باج ئەدەی لەپێناویدا گەورەترین قوربانی ئەدەی ئی خۆ هەر بەدەم نابیٚ دەبزانە لەواقیعدا تۆ رازیت كەوا دەیخوێنتەوە تەنها خۆشەویستانی الله بەوە رازین .

بۆیە ئەلیٚ ریضا واتا رازیبوون بە الله تعالى (ولذلك كان الرضا باب الله الأعظم)گەورەترین دەرگایە بۆلای خۆشەویستی الله تعالى رازیبوون بە الله ،ئێستا لەخۆتان بپرسن رازین الله خواتان بیٚ رازین محمد (صلى الله عليه وسلم) رابەرتان بیٚ رازین ئیسلام رێبازتان بیٚ ئەی چۆن تۆ ئاور ئەدەیتەوە بەلای شتی تردا ! ! ئەوەیە الله تعالى لەقورئاندا چەند جار فەرموویەتی (أَنَّى تُصْرَفُونَ)یان(فَأَنَّا تُؤفكون) أنا واتا كيف چۆن؟ چۆن تۆ روو وەرئەگێری لە الله تعالى كەواتە !ئەلیٚ من رازیم الله رێنمایی كاری من بیٚ خۆشت داوای لیٚ دەكەی ئەلیٚ (اهْدِنَا)[91] یا الله رێنماییم بكە ئیٚ الله رێنمای كردووی قورئانی بۆ ناردوی پێغەمبەری بۆ ناردووی (صلى الله عليه وسلم)كەچی ئاوری لیٚ نادەیتەوە شتەكان لێرە بون بەدەم و عادەت ئیسلامەتی بویتە عادەتی زۆرینەی مەنهەج و دل و رێباز و خوێن وگۆشتمان نیە نالێن خۆشەویستی الله خوێن و گۆشتمە شتی تر ئەلێن خوێن و گۆشتمە بەس ئەوە نالێن .

## خۆشوستنی كەلامەكەی الله

(محبة كلامه)واتا تۆ بەبەردەوام كەلامەكەی ئەوت پیٚ خۆش بیٚ بەردەوام گوێگری بیت . نەك وەك ئەوانەی ئێستا كاتێك سواری سەیارەیەك دەبیٚ قورئانێك لێدراوە ئەلیٚ خێرت ئەگاتی ئەو قورئانە بكوژێنەوە ئەم گۆرانیەی بخەسەر! ! یاخود دەلیٚ كاكە چیە خۆ تەعەزیەمان نیە .! تۆ ئەبیٚ خۆشت بوێی و لەهەموو كەلامێك زیاتر خۆشت بوێی بەلكو بە پێچەوانەی ئەوانیتر ئەو كەلامەی الله كەلەكاتێكدا تۆ لەدلتدا بیٚ و خۆشت بوێی هەموو كەلامێكیتر فرێی ئەدا .

[90]: رواه ابن أبي شيبة في " المصنف " (٣٦/٦)
[91]:سورة الفاتحة اية :٦

ئێسا با ئێمە لە شوێنێك بین ئەگەر الله تعالی خۆمانمان پیٚ نیشان بدا قسەمان لەگەل بکا لەوانەی راستگۆن و خۆشەویستی الله ن کەس رووئەکاتە کەسیتر هەمووی رووده‌کاتە الله تعالی ئەلیٚ باگوێم لە الله تعالی بیٚ ئی ئەوە قورئانەکەیەتی ئی گوێی لێبگرە هەر تیکرار بوونەوە و دووبارەبوونەوەی ئەم قورئانە و پیتێکی حەسەناتت بۆ زیاد ئەکا وەکو کەلامی تر نیە هەر عەرفێکی بە١٠ حەسەنەیە سەیری ئەجر و پاداشتەکەی بکە چەند گەورەیە .

ابن القیم دەفەرموی :(وإذا أردت أن تعلم ما عندك وعند غيرك من محبة الله، فانظر محبة القرآن من قلبك)[٩٢] ئەگەر ئەتەوێی بزانی چەنێك خۆشەویستی الله لەدلی تۆدایە یاخود لەدلی غەیری تۆدایە ؟! ئەو پێوەر و میزانە بزانی سەیری خۆشەویستی قورئان بکە لەدلیدا .تاوەکو بزانی تا چ رادەیەك خۆشت ئەوێی .( فإن من المعلوم أن من أحب محبوبًا كان كلامه وحديثه أحب شيء إليه )شتێکی زۆر معلوم و زانراوە هەرکەسێك کەسێکی خۆشویست قسەکەشی لەهەموو قسەیەك خۆشەویسترە لەلای (فلاشيء عند المحبين أحلا من كلام محبوبهم)لەلای ئەو کەسانەی کەوا ئەلێن ئێمە فلانمان خۆش دەوێی هەرکەسێك ئیتر الله بیٚ یاخود غەیری تر کەلامەکەی ئەو کەسەی لەهەموو کەلامەکان لاخۆشەویسترە (فهو لذة قلوبهم وغاية مطلوبهم)گەورەترین لەزەتی دلیانە ، لێرەدا ئەبیٚ سەرنجێك بدەین پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیشارەتی داوە بە کۆتایی زەمان و فەرموویەتی (أَكْثَرُ مُنَافِقِي أُمَّتِي قُرَّاؤُهَا)[٩٣] زۆربەی خوێنەرانی قورئانی ئومەتەکەی من موناڤقن ، ئەمرۆ سەیری قورئان خوێنان بکەن لەتەعزیەکاندا الله تعالی پشتیان بشکێنی ئەو قورئانەی الله چۆن دەفرۆشن پارەیان مەدێی بۆت ناخوێنی کە خوێندیشی دروست نیە ئیمامی شافعی ئەفەرمووی :پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هیچ مەجلسێکی نەبوە مەجلیسی فاتحە بیٚ هیچ مەجلیسێکی نەبوە مەجلیسی تەعزیە بیٚ ،هیچ مەجلسێکی نەبوە بلیٚ ئەم قورئانە بۆ فلان و بۆ فلان زانراویشە دوو ژنی لە حەیاتی خۆیدا مردوون کە خەدیجە بووە لەگەل زینبی کچی خوزیم وە سیٚ کچی لەژیانی خۆیدا مردوە کە زینب و روقیە و ام کلثم بووە سیٚ کوری لە ژیانی خۆیدا مردووە کە قاسم و عبدالله و ئیبراهیم بوون ،مامی لەژیانی خۆیدا مردوە حە مزە کە شەهید کرا ئەم هەموو خزم و کەس و کارەی لەپێش خۆیدا رۆیشت دانەنیشت مەجلیسێکی تەعزیە بگرێی و بلێت الفاتحە چونکە ئەزانی قورئان بۆ ئەوە نەهاتووە ، دواتر بزانە قورئان عیبادەتێکە و هەرکەس بۆخۆیەتی وەکو نوێژ وایە ، ئەتوانی نوێژ بۆکەسێکیتر بیکەی !؟ دەکرێی بلیٚ ئەم نوێژە خوایە بگەینە بە مردوەکانمان شتی وا هەیە لەژیانت بیستوتە ؟! نوێژ

[٩٢] الجواب الکافي ،ص٢٣٥
[٩٣] :رواه احمد

هەرکەس بۆخۆیەتی هەرکەسێك نەیکا مال وێران ئەبێ و هەرکەس بیکا سەرفراز ئەبێ ،بەلام حەج وانیە حەج ئەتوانی بۆ غەیری خۆتی بکەی .

## عیبادات ئەبێت بەدوو بەشەوە :

١-بەشێکی بۆخۆتە و بۆهیچ کەسێکیتر نیە بۆمردوان نارِوا وەکو نوێژ.
٢-بەشێکی بۆخۆشت و بۆمردوانیشە وەکو حەج و عومرە کەفارەتدانی رۆژوو لەسەر نەخۆشیك کاتیك نەخۆش دەکەوێت ئەمرێت رۆژی رەمەزانی نەگرتوە ئەم نەخۆشە چەند رۆژبووە ئەوەندە کەفارەتی ئەو رۆژوە ئەدەی ئەم ئەمە ئەروا بە نەص .

ئیمامی شافعی ئەلی : قیارئەی فاتحە و قورئان بۆ مردوو نارِوا لەبەر ئەوەی لەنوێژەوە نزیکە چۆن نوێژ نارِوا فاتحەش نارِوا لەبەر ئەوەی پێغەمبەر نەکردوە (صلی الله علیه وسلم)سەیری بکە ئەم قورئانە چی لێهاتوە لەواقیعی ئێمەدا لەجیاتی حوکمرانی پێبکرێی لەجیاتی مال و مندال بەقسەی بکا لەجیاتی لەسەر رێنمایەکانی برۆین لەجیاتی بەقوربانی بین خۆمانی لەپێناودا بە سەر و مالەوە بەقوربان بکەین بەس واقیعەکە وانیە کە دەمانەویت بیفرشە و بەوەندە پێشوتر بەس پیاو ئەم کارەیان ئەکرد ئێستا ئافرەتانیش بون بەملا فلان و مەلا فلان قل لەفل جیاناکەنەوە دەنگە و دەنگ و هاوار هاواردەکەن بەس ئەوەندە دەنگەکەیان بلارێتەوە خێمەیەکی بۆ دائەنێن و ئەوەندەش پارەی پێ ئەدەن بە رەشاووی بێ حەرامە بە کۆدەنگی هەموو علما ئەوەی ئەیداتی گوناهبارە ئەویش وەکو زەهری ماری خواردبێ وایە ئەوە مەنزیلەی قورئانە لەلای ئێمە ! !

لەدوای ئەوەش هەرچی موشریك و گومرا و ضال مضل ملحد خوی داوەتە قورئان بەمە پارە پەیا ئەکا قورئانەکە لەعنەتی لێ ئەکا کاتێك قورئانەکە دەخوێنی لەعنەتی لێ دەکا قورئانەکە (ألا لَعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ)[٩٤] بۆخۆی ئەلێ لەعنەتم لێ بێ چونکە زالمە شیرك ئەکا هاواری غەیری الله ئەکا لەجیاتی بلێ بەس الله چاکم ئەکاتەوە ئەلێ پێغەمبەر چاکم ئەکاتەوە (صلی الله علیه وسلم) ئەلێ دەست بەرزمەکەوە بۆ الله تعالی برۆ بۆ رەوزەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم )! !چەندین موشریکی وامان هەیە ئەمرۆ مولودەکان و ئاهەنگ و کۆرەکانیان پێ رازاندۆتەوە جا ئەوانەش گوێیان لێ نیە سافیرە ئەبووی ئەرەق خۆر دەبووی هەرچی شتێك ئەبووی بەس گرینگ ئەوەیە پارەکە پەیا بکا و ئەچێتە هەموو شوێنێکەوە .

[٩٤] سورة هود اية :١٨

ئینسانی راستگۆ وانیە ئەو کەسەی زیکر و یادی الله بکا خۆی و ژن و مال و مندالی هەمووی پەیوەست دەکا بەپاراستنی ئەو دین و ئیمانە ئەلیٚ خۆتان بپارێزن وە بێتاقەت ئەبیٚ بەموخالەفەکردنی الله تعالی .ئینسانە درۆزنەکان و موشریکەکان گوێیان لیٚ نیە برۆ کام مەولود ئەیکەیت و قەرەبالغە کە ئافرەت و پیاو تێکەلاوە ئەوانە سەریان لەوێی دەرئەچیٚ نوێژیان بیر دەچیٚ کە بانگیش ئەدا هەر خەریکی گۆرانی وتنن ! !بەمانە هەلمەخەلەتێن زۆر کەس هەیە پێیان هەلدەخەلەتیٚ ، یاخود ئەلیٚ ژنم هێناوە با مەولودێك بکەم ژن هێنان و مەولود چۆن دەبیٚ ؟! کەی لەدینی ئیسلام هەبوو !؟ لە ژن هێناندا وەلیمەمان هەیە ئەچی حەیوانێك سەر ئەبری لەپێناوی الله تعالی دا گۆشتەکەی ئەکەی بە شیوو وئەیدەی بەم خەلکە بەبیٚ تێکەلاوی وەرن نان بخۆن کورەکەم ژنی هێناوە یاخود ئەو کەسەی کەوا ژن دەهێنی بۆ رۆژی دواتر ئەچی ئەو خەلکە دەعوەت ئەکا و تەواو ئەمە پیٚ دەوترێی وەلیمە ئەمە هیچ پەیوەندی بەمەولودەوە نیە ئەو دێی یەکسەر حەیوانەکە ئەکوژێتەوە ئەلیٚ بۆ مەولودی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە کۆدەنگی هەموو علما یان ئەم حەیوانە حەرام دەبیٚ چونکە (**إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**)[95] ئایەتەکە ناخوێنەوە بۆخۆتان نوسراوە لله ولرسوله ؟! نوسك یانی سەربراوەکانم هەموی بۆ الله یە ، کەچی ئەو دەلیٚ نا بۆ الله و بۆ پێغەمبەریشە یا الله تۆ نازانی دەبیٚ بەشی پێغەمبەریشی تێدابیٚ وای لێدی کردەوەیەکەیان ئی ئاخر پێغەمبەر بۆچیەتی ئەو بەندەیە بەندە ! (صلی الله علیه وسلم)ئەو خوا نیە تاوەکو عیبادەتی بۆ بکەی هەموو عیبادەتەکانی رۆژگاری ئێستای ئێمە وایە .

سەیرکە گۆرانی بەناوی ئیسلامیان بۆ هێناوین باسی گۆرانی بەرەلاکان ناکەم ئەمە دیارە و هیچ شوبهەی لەسەر نیە ئەوەی گۆرانیانە ئەلێن ئارەق خۆر و زیناکار وسەرسەریین ئەمانە هەرکەسێك تۆزێك عەقلی تەواو بیٚ ئەزانیٚ بای چەندن ئەمانە ئێمە ئەوە باس ناکەین کەچی ئەمرۆ باسی ئەوەش ئەکرێی کەوا حەلالە !! ئێمە باسی ئەوە ئەکەین کە بەناوی ئیسلامەوە ئەکرێی گۆرانی ئیسلامی مۆسیقای ئیسلامی رەقصی ئیسلامی وای لیٚ دیٚ زینای ئیسلامی مەسرەحی ئیسلامی هەموو شتێکی ئیسلامی !! ئیسلامی چی تۆ وەرە بزانە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەند کۆری دانا و ئەبو بەکر و عومەر چەند لەحنیان داناو ئەوهایان کرد ! بەم شێوەیان نەکرد ، یاخود ئەلیٚ صەحابە وای وت لەشەری فلاندا ! لەشەری چی دا پێم بلێن ؟! دەتۆ وەرە لەشەری کافراندا بزانم ئەوشتەی کە دەیلیٚ لەبەر خاتری الله دەیلێت و بەترسەوە دەیلیٚ یاخود لەبەرخاتری دلەکەیی خۆت ئەیلیٚ .

[95] سورة الأنعام اية :١٦٢

لەشەڕی خەندەقا پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)شەڕی ئەحزاب ١٠ هەزار کەس بوون کافرەکان هاتنە سەر مەدینە بەری ئیمانیش ٣ هەزار کەس بوون ١٠ هەزار لە هەموو کافران و موشریکان بێتە سەرت تۆ لەوێدا گۆرانی خۆشی ئەڵێ ! یاخود ئەوشتەی کەوتوتە یاخود کە دووکەلیمەی وتوە لەپێناوی ئەوەدا بووە کە هانی موسلمانان بدا  بۆ بەهەشتەکەی اللە و دیفاع لەدینەکەی اللە بکەن ، ئەمرۆ خەلك وا ئەڵێ! ! ! ئەمرۆ ئەچی سمێلی ئەتاشی و ریشی ئەتاشێ سەری وەکو ئەوروپا ئەتاشی ، نازانم ئەم سەرە وەکو شاخی شەیطان بۆ ئاوهای لێهات جاران هەلسایتایە لەخەو شەرمت ئەکرد کەسێك لەدەرگای بدایە بچیت نەوەك بەم شێوەیە بتبینی و ئەتوت با سەریك بنیم بەسەرمەوە بیهێنمەوە بۆ خوارەوە کەچی ئێستا هەموی بۆ ئەولا و ئەولا ئەڵێ شاخی  شەیطانە ئەمە بریتیە لە سەقافەت ! ئەمە سەقافەتە تخوا !؟ کورە مەلاکان شتی وا ئەکەن ئەبێ کورە غەیر مەلاکان چی بکەن! پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم ) بەم شێوەی نەئەکرد کابرای گۆرانی بێژ ئەچێ لەسەر قەبران وا ئەکا و هاوار ئەکا و گۆرانی ئەڵێ ! ئاخر قوربەسەر ئەچیتە ژێر ئەم گۆرە بەیانی  گۆرانی چی ئەڵێ !دین ئەوهای لێهاتوە ئەمە گریانی دەوێی لەلایەك پێکەنین بەحالی ئەم خەلکە لەلایەکیش گریانیش بەحالی ئەم خەلکە .

خۆشەویستی راستەقینە دەبێ قورئانی لەهەموو شتێك پێخۆشتر بێ . کەچی ئەو دەڵێ ناکاکە قورئانم بۆ لێمەدە فلان  و فلانم بۆ لێدە  هەرچیەك بڵێ ئەمانە قورئان قورئانم بۆ ئەڵێ لەسەر گۆرانی هەرچی و پەرچیەکان تۆ وەرە قورئانەکەم بۆ بخوینەرە و قورئان قورئانی جیەتە وەرە کاری پێ بکە وەرە بگری و بپارێوە خۆشی بەکەس ناگۆرێتەوە ! کەچی زۆر جار ئەلێم ئەو گۆرانیە لابە ئەڵێ کاکە ئەوە ئیسلامیە رەدم ئەداتەوە ئەڵێ ئیسلامیە ! !ئەلی بۆ ئەوە خراپە !؟ ئەی بۆ  قورئان لێ نادەی ئەگەر ئیسلامیە لە قورئان گەورەتر و رێك وپێکترو خۆشترو راستتر هەیە .

عبداللە کوری مسعود ئەفەرمووی( (قَالَ : قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : اقْرَأْ عَلَيَّ الْقُرْآنَ ")پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) داوی لێکردم کەوا قورئانم بۆ بخوێنەرەوە (بۆخۆی هاتۆتە خوارەوە قورئان و خۆی بەخەلکی وتوە کەچی بەصەحابەکەی ئەڵێ بۆم بخوێنەرەوە) (قَالَ : قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ الْقُرْآنُ)ئایە من بخوێنمەوە ئەی پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) کە بۆخۆت هاتۆتە خوارەوە !؟ (وەکو ئەوە وایە کەوا مامۆستایەك بەقوتابیەکەی بڵێ ئادەی ئەوشتەم پێ بڵێ ئەویش بڵێ خۆت فێرت کردووم من چیت پێ بلێم )( قَالَ: «إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي)وتی من حەز دەکەم لەغەیری خۆمەوە گوێم لێ بێ (ئەوەندەی پێ خۆشبوو بەوەندە رانەدەوەستا کەخۆی بیلی و

لەبەریشی بوو لەدلیبوو لەکەسانیترەوە حەزی دەکرد گوێی لێ بێ (فَقَرَأْتُ النِّسَاءَ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ:)سورەتی النسـاء م بۆخویندەوە هەتا گەیشتمە {فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاءِ شَهِيدًا} [سورة: النساء، آية رقم: ٤١] بزانە چەندە ئەم سورەتە لەسەرەتاوە تاوەکو ئایەتی ٤١ ئەم پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە گوێگرتوە ئەك گوێگرتنە بەم شێوەی خۆمان نیە بلێ ماشاء الله دەنگەکەت چەنێ خۆشە سەربادا بەلکو ماناکەی شی ئەکاتەوە کە گەیشت بەم ئایەتە دەستی کرد بەگریان چاوەکانی ئاوی لێ دەباری چونکە ماناکە زۆر قورسە ، ئەی محمد ئەبێ حالی خەلکی چۆن بێ لەرۆژی قیامەت کە هەموو ئومەتەکان بەپێغەمبەرەکانیانەوە بانگ ئەکەین و پێغەمبەرەکانیان شەهید و شاهیدن بەسەریانەوە تا چ رادەیەك ئەم دینەیان قبول کردوە کە ئەم هاتوە دینەکەی بلاو کردۆتەوە تۆ شایەدی بەسەر ئەم ئومەتەوە (وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاءِ شَهِيدًا)تۆ ئەهێنین و ئەت کەین بەشایەد بەسەر حالی ئەوانەوە بزانە وەریان گرتوە یاخود وەریان نەگرتوە ، ئەم پێغەمبەرە نازدارە دەستی کرد بە گریان (صلى الله عليه وسلم) بە عبدالله کوری مسعودی وت (امسك )عبدالله دەلی (رَفَعْتُ رَأْسِي، أَوْ غَمَزَنِي رَجُلٌ إِلَى جَنْبِي، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ دُمُوعَهُ تَسِيلُ) سەیرم کرد چاوەکانی دلۆپ دلۆپ فرمێسك لەچاوەکانی دەهاتە خوارەوە)[٩٦] . ئەمەیە گوێگرتن لە قورئان .

ئێستا ختمی قورئان زۆر زۆرە گوێی لێبگرن .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە ئەبو موسا دەفەرمووی کە ئەبو موسای ئەشعەری دەنگی زۆر خۆشبووەوە (لَوْ رَأَيْتَنِي وأنا أَسْتَمِعُ لقِرَاءَتِكَ البَارِحةَ)ئەلێ رۆژێك ئەبو موسا قورئانی دەخوێند پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) گوێی لێدەگرت و ئاگای لەخۆ نەبوو ئەبو موسا دواتر بۆ رۆژی دوای پێ وت دوێنی ئەگەر ئاگات لێبوو بێ گوێم لێگرتبوی کاتێك قورئانت دەخوێند (لَقَد أُوتيتَ مِزْمَاراً من مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ) بەراستی دەنگێکی خۆشت پێدرابوو چۆن بە ئالی داود درابوو بەشیك ئالەوەت پێدرابوو ئەبو موسا )[٩٧] پێغەمبەر داود و ئەهلەکەی الله تعالى دەنگێکی زۆر خۆشی پێدابوون کە زیرو ئەو ئایەتەی الله بۆیانی دابەزاندبوون دەیانخوێند ئەوەندە خۆش بوو تەیر و تار و هەمووشتێك لەدیاری دا رادەوەستا . ئەمەش دەلیلێکترە کەوا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)گویرایەل دەکرد بۆ قورئان .

لەغەیری خۆت گوێی لەقورئان بگرە چونکە گوێگرتن لە غەیری خۆت هەست بە هەلەکانی خۆت ئەکەی تییدا .

[٩٦]:صحيح البخاري
[٩٧]: أخرجه مسلم

وه بزانه بەدەنگ خۆشی نیه بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کەوا ئیمامەتی دەکەن بزانه موحیده یاخود موشریکه ئەو کەسەی بلێ (یارسول الله هاوار ) ئەو ئیمامەتیه دروست نیه با هەزار دەنگیشی خۆش بێ تۆ نوێژەکەت بەتاله خۆ الله سەیری دەنگ خۆشی ناکا لەپێش هەموو شتێکەو سەیری تەوحیدەکەت ئەکا بزانێ موحیدی مەرجی یەکەمه بەس تۆ بلێ (یا رسول الله هاوار،،، فلان وفلان ) رازی بی بەغەیری رێبازی الله تعالى ئینجا بچیت ئیمامەتم بۆ بکەی ئەو ئیمامەته بەتاله ئیتر با سەت دەنگیشی خۆش بێ .

## تەوبه کردن

(أن يكون منياً إلى الله خائفاً منه راغباً راهباً كما قال تعالى : هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ (٣٢) مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ (٣٣) ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ (٣٤) لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ)[٩٨] دەبێ ئەو بەندەیه تەوبەکار بێ بەبەردەوام منیب واتا کەسێکه بەبەردەوام کوناه ئەنجام ئەداو دەگەرێتەو وتەوبه دەکا له خوای خۆی ئەترسێ (خائفاً منه راغباً راهباً)لەنیشانەی خۆشەویستی تۆی بەنده بۆ الله ئەوەیه کەوا تۆ تەوبەکار بیت و بگەرێیتەوه بۆلای کاتێك سەرپێچی فەرمانەکانیت کرد چونکه ئێمه ئینسانین بەتەبیعەتی حال کەسمان نیه بێ تاوان بین کەسمان نیه مەلائیکه بین و هەمومان گوناه ئەکەین له نیشانەی خۆشەویستی الله لەلایەن تۆوه ئەوەیه کەوا زوو بگەرێتەوه بۆلای الله لەتاوانەکەت دان بنێی بەتاوانەکەتدا . سەیربکەن سەید الاستغفارمان هەیه له بەیانیان و ئیواران .

پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێ : باشترین کەلام ئینسان تێدا بگەرێتەو وتەوبەی پێ بکا الاستغفاری پێ بکه بەیانیان وئیواران ئەم کەلیمانەیه که سیدالاستغفاری پێ دەوترێ (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ)[٩٩] ئەلێ یاالله تۆ خوای منی تۆ منت دروست کردوه من تۆ ئەبێ بپەرستم عهد و وەعد واتا :

عهد : الله تعالى پەیمانی لەئێمه وەرگرتوه کەوا بیپەرستین .

[٩٨]:سورة ق اية :٣٢-٣٥
[٩٩]: صحيح البخاري

وعد: ئەوەیە کەوا الله تعالی وەعدی داوە ئەگەر ئێمە ئەومان پەرست بمانخاتە بەهەشتەکەیەوە.
جا تۆ ئەلێ یاالله من چاوم لەم دوو شتەیە یەکەم من بەلێنم داوە بەتۆ کەوا بەندایەتیت بۆ بکەم ئەوە بەجێ دەهێنم بەبێ سستی رجاشم وایە لەتۆ کە ئەو وەعدەی کەداوتە لەمندا تەحقیق بکەی کە بەهەشتەکەتە و بینینی خۆتە .( وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ)إئیعترافە بەکەموکوریەکانمان لێرەدا واتا چەندێکم توانا هەبێ ، وەدەبێ ئاگاداربن بابەتی توانا ئەوە نیە کە بلێت ناتوانم بە رۆژوو بم هیچ شتێکیش بونی نەبێ بیانویەکی شەرعی یاخود بلێ ناتوانم نوێژبکەم نەخێر ئەوە تەکالیفە ئەبێت بیکەی بابەتی نوێژکردن هەر هیچی تێدا نیە مادەم تۆ عقلت لەوجود دا هەبێ هەموو ئەندامی گیانت لەکار کەوتبێ نابێ نەیکەیت و ئەبێ بەچاوەکانت نوێژ بکەیت ئەبێ بەعقلت نوێژ بکەی نەکردن ئەمە تەمەبەلیە و نەترسانە لە تعالی ئەوە رەجا پێ نەبوونە بەالله تعالی بەبەهەشتەکەی کە چەندێك ئەجر و پاداشتی لەسەر نوێژ داناوە (أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ) واتا ئیعتراف دەکەم بەنیعمەتەکانی تۆ لەسەر من (وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي)ئەوە ئیعترافیش دەکەم بەتاوانەکانم ئەمەش خالە گرینگەکەیە کە لەم بابەتە دا دەمانەوێت .
کەتۆ هەلەیەك دەکەیت مەلی هەلە نیە و ئینکاری مەکە لەسەرهەلەکەت کە گوناهێکت هەیە مەلێ گوناه نیە و مەلێ من چاکەکارم مەلێ لەهەموو کەسێك باشترم بەلکو بلّی والله هەتابلێ کەمتەرخەم و گوناهبارم ئەوەشی ئەنجامی ئەدەم پریەتی لە تەقصیری و کەم و کوری .
کەسێك دەیوت والله خوا قەرزاری منە پێ دەلێن بۆ ؟وتویەتی : والله ئەو داوای فەرزەکانی لەمن کردوە من سونەتەکانیشی بۆ ئەگرم کەواتە ئەو قەرزاری منە ! ماشاء الله لەم کەسە نازانم ناوی بنێنم چی !! خوا قەرزای تۆیە !؟ یان تۆ قەرزاری خوایت ؟! بۆ خۆت ئەوەندە بەگەورە ئەزانی بۆئەوەندە تەکبور ئەکەی ئاخر ئەکەم گوناه کە هەموومانی تێوەگلاوین ئێستاکە گوناهی شەیطان بوو کەتەکبوری کرد سەجدە بەرە نایبات ئەلێ من لەئاگرم و ئەو لەقورە ئاخر بەتەکبور سەرمان چوو بەقوردا ئێستاش هەر بە تەکبور سەرمان ئەچێ بەقوردا پێ دەلێ لە الله بترسە (اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ ۚ)[100] لە الله بترسە و فەرمایشتی جێ بەجێ بکە گەورە و بچوکتان کەچی ئەلێ من لەهەموو کەسێك باشترم ئەلێ خوا بەرەحم و میهرەبانە و هەموومان دەخاتە بەهەشت ! ئاخر الله تعالی بەرنامەی داناوە بەالله جەهەنەمیشی داناوە وەکو چۆن بەهەشتەکەی داناوە هەمووتان ئەزانن دووشتی داناوە کەوا بەهەشت بۆ کێ یە و جەهەنەم بۆکێ یە ئێوە نەتان بیستوە کەوا لەقورئاندا زۆرترین کەس الله دەیخاتە ناو جەهەنەمەوە زۆربەی زۆری خەلکی لەجنۆکەکان و لەئینسانەکانەوە الله تعالی دەیانخاتە ناو جەهەنەمەوە .

[100]:سورة البقرة اية : ٢٠٦

که گوناهت کرد یەکسەر بگەڕێوە دوو رکات نوێژمان هەیە هی تەوبە کە گوناهت کرد یەکەسەر بەخۆتدا بچۆرەوە دوورکات نوێژی تەوبە بکە داتر دوعا بکە و بلێ یاالله لێم خۆشبە لەحەدیسدا وارید بووە کەوا الله تعالی ئەوەندە رجامان پێیەتی ئەوەندە خۆشحالمان ئەکا ئەم حەدیسە ئەمەش بۆ ئەوکەسەیە کەوا تێ بگات کەباسی فەزل و گەورەی الاستغفار دەکا کە دەفەرمووی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەگەر گوناه نەکەن الله تعالی قەومێك دەهێنی کە گوناه بکەن داوای لێبوردن بکەن لە الله تعالی لێیان خۆشبێ بۆ ئەوەی ناوی غفار و غفور دەربچێ لەبەرچی ناوی عفارو عفورە واتا ئەمە بێ هیوات ناکا الحمدلله الله تعالی بێ هیوات ناکا خۆ الله تعالی داوا لەتۆ ناکا مەلائیکەیەکی صەرفبی ! مەلائیکەی دروست کردوە هیچ گوناه ناکەن نە ئەخۆن و نەئەخۆنەوە نە ژن و ژنخوازی هیچیان نیە ئەوانە الله تعالی وای دروستی کردوون بەس ئێمەی وا دروست نەکردوە ئێمەی بەئارە زوو دروست کردوە ئێمەی بەخواردن دروست کردوە ئێمەی بەدونیا دروست کردوە ئێمەی بەگوناه دروست کردوە بەس پێت ئەلێ بگەڕێوە .

ئینجا ئەلێ (خائفاً منه راغباً راهباً)ئەبێ لێ بترسی

راغب: ئەو کەسەیە کەوا چاوی لەنیعمەتەکانی الله یە لەدونیا و لەقیامەت .

راهب: ئەوە کەسە کەوا لێ دەترسێ لە سزای دونیا و قیامەت .

ئەچینە ناو مانای ئایەتەکانی سورەتی ق کە لەسەرەوە هێنامانەوە (**هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ**)کە باسی بەهەشت دەکا دەفەرمووی ئەمە ئەوەیە کە وەعد دراوە بەهەرکەسێك أواب بێ واتا تەوبەکار بێ بگەڕێتەوە حفیظ ئاگادار بێ محافظ لەسەر دینی الله تعالی بکا محافظ لە الله تعالی بکا.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە إبن عباسی فەرموو (احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْكَ)[101] خوا بپارێزە ئێمە چۆن خوا دەپارێزین واتا حدود و سنورەکانی بپارێزین ئەویش تۆ ئەپارێزیی (احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ)ئەگەر تۆ الله بپارێزی و سنورەکانی بپارێزی دێت بەدەم داواکانتەوە دێت ئەمانەش ئەو کەسانەن (**مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ**) ئەوانن لە الله دەترسێن لەکاتێکدا الله نادیارە وە لە الله دەترسێ ئەگەر چاوی خەلکی لێ دیار نەبوو لەهەردوو حالەت رۆژی قیامەت هاتە لا الله تعالی بەدلێکی مونیبەوە واتا تەوبەکار واتا کەسێکی تەوبەکاربێ .پێیان ئەوترێی (ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ۖ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ)برۆنە ناو بەهەشت سەلامەت بن لەهەموو شتێك ناخۆشیەکان و مردن و هەمووشتێك لەنەبوونی و لەقسەی ناخۆش لەکۆتایی پێهنانی ئەم خۆشیە شتی وا نیە هەرچی ناخۆش هەیە لەناو بەهەشتدا نیە کەلامەی سەلام ئەوەیە هەتا هەتایە ئەژین و نامرن (لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ)هەرچیتان ئەوێت

[101]: رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح

تێدایەتی مەزیدەکەش بریتیەلەوەی بینینی الله تعالی وەکو علما  یانی تەفسیر باسی لێوە دەکەن کە الله تعالی دەبینی بەچاوی خۆت کە لەهەموو خۆشیەك خۆشترە ئەمە وەصفی الله تعالی یە بۆ تەوبەکار .

تەوبەکاریش : ئەوکەسەیە کەوا گوناهی کردوە ئینجا ئەگەڕێتەوە .

(إذا المحب يخاف من زوال مطلوبه وحصول مرغوبه ، فلايكون عبدالله ومحبه إلا خوف ورجاء)[١٠٢] ئینسان ئەبێ بترسێ لەوەی ئەو دەست کەواتانەی لەدەست دەربچێ خۆشەویستی خۆشەویستەکەی لەدەست دەربچێ ، وە هەریەك لەئێوە ئەگەر خۆشەویستیەکی هەبێ ئەیپارێزی لەوەی خۆشەویستەکەی لەبن دەستی دەربچێ . بۆنمونە ئەگەر کەسێکی خۆشەویستت هەبێ ئەگەر سەلامت لێ نەکا بێ تاقەت ئەبی ئەڵێ نازانم دەبێ چی بێت بۆ سەلامی نەکرد ! ! رادەکەی بەدوای ڕەزابوویندا ، لەسەرووی هەموویانەوە الله تعالی یە ئەبێ هەول بدەی کەوا لەدەستی نەدەیی .

جا بەندە نابێت بەخۆشەویستی الله إلا ئەبێ لە الله بترسێ وە ئەبێ هیواشی پێ هەبێ هیوا و ترس !

ئەمرۆ ئەگەر سەیری هیوا و ترسەکان بکەین چۆنە لەواقیعی ئێمەدا :

هیوامان بەبەندە هەیە ترسیش مان هەر لەبەندەیە .!ئەی الله ی بەندە ! ؟ زۆر بەکەمی ئەمرۆ وای لێهاتوە ئەمەش دەبێتە دووبەش :

زیندوان و مردووان .!

زۆر کەس هەیە هەتاوەکو ئێستاش ئەڵێ ئەترسم عبدالقادری گەیلانی چاوم کوێر بکا ئەگەر هاواری بۆ نەکەم !ئەگەر نەلێم مدد یا عبدالقادری گەیلانی !ئەترسێ ! دەی ئەگەر کەسێك ئاوا بکا ئەوە موشریك و کافرە ، الله تعالی رقی لێ هەلدەستێ ئەڵێ ئەبێ لەمن بترسی نابێ لەبەندەکەم بترسی .

یاخود هیوای پێیەتی و ئەڵێ هیوام بەوە دەڵێ یا رسول الله یا عبدالقادر یا فلان ئێستا ئەبنین خۆمان گوێمان لێ یەتی لەگۆرانی بێژەکان کە وادەلێن کەکاتێك هاوار دەکەنە پێغەمبەر و پیاوچاکان ئەمانە هیوای بە الله نیە و هیوای بەبەندەیە الله تعالی ش دەفەرمووی والله ی پێتی نادەم برۆ  با محمد پێتی بدا (صلی الله علیه وسلم) با عبدالقادر پێتی بدا بزانم کەس دەسەلاتی هەیە !

(وقد أخبر تعالي عن خاص عباد الذين كانوا المشركون انهم يزعمون تقربوان  الي الله أنهم كانوا راجين وخائفين منهم) الله تعالی خەبەری داوە لەقورئانەکەیدا سەبارەت بەو کەسانەی کەوا بەندەیەکی زۆر مخلیص و تایبەت مەند بوون بە الله وە کە مەلائیکە و پێغەمبەران و پیاوچاکان بوون ، ئەڵێ موشریکەکان

[١٠٢]: مجموع فتاوى شيخ الإسلام أحمد بن تيمية - ج ١٠ - علم السلوك ، ص٢١٥-٢١٦

داوایان لیٚ ئەکردن بەلام خودی ئەوان خۆیان پێغەمبەرەکان و پیاوچاکەکان کە موشریکەکان داوایان لیٚ ئەکردن ئەیان وت ئەوە وەسیلەی ئێمەیە .

وەسیلەی چیە : بریتیە لەمنافسە کردن بۆ ئەوەی بە عیبادەتەکانت لە الله تعالی زیاتر و زۆرتر نزیك ببیتەوە هەروەکو الله تعالی دەفەرمووی (وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ)[١٠٣] منافەسەیان لەنێواندا هەبوە وە عیبادەتەکەیان کردۆتە وەسیلە لەنێوان خۆیاندا بۆ نزیك بوونەوەی زیاتر لە الله تعالی .

ئەمرۆ مانای وەسیلەیان تێکداوە وایان لێکداوەتەوە لەلای صۆفی و دەروێشان و لەلای تروقی صۆفی ئەلیٚ تۆ پێغەمبەرەکەت بکە بەوەسیلە تۆ پیاو چاکان بکە بەوەسیلە و لیٚ نزیك ببەوە لە الله بلی یا رسول الله هاوارم بۆ بکە ! من رووم نایی من رووم رەشە با ئەوان داوام بۆ بکەن ئەمە خودی شیرکی موشریکینە !.ئابەمە تۆ کافر ئەبیت و قەت چاوت بەبەهەشت ناکەوێی الله تعالی لەقورئاندا وا دەفەرموێت جل وعلا ئەبیٚ تەنها داوا لە الله بکەین .

الله تعالی دەفەرمووی (**قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا**)[١٠٤] الله تعالی دەفەرمووی ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) تۆ پێیان بلیٚ (**ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ**) داوا بکەن لەوکەسانەی غەیری الله هەموو شتێك دەگرێتەوە لە مخلوقات باسمان کرد وتمان الله هەبوە هیچ نەبوە دواتر الله تعالی مخلوقاتی دروست کرد پێغەمبەریش یەکێکە لەمخلوقاتەکان هەلەیە بلێت پێغەمبەر نوری الله یە نوری الله نیە بەندەی الله یە ، نوری الله ئەوە الله خۆیەتی جل وعلا خۆ الله تعالی لەخۆیدا کەسی دروست نەکردوە الله تعالی مخلوقی دروست کردوە مخلوق مەلخوقە و خالقیش خالقە . الله جیاوازە لەگەل خەلکەکەی هەموو پیاو چاکان و پێغەمبەران و بوونەوەر مانگ و خۆر و فەلك و کائینات هەموی مخلوقی الله تعالی یە هەمووی ئەبێت زەلیل بێت بۆ الله تعالی هیچی الله نیە و شایستەی پەرستن نیە هەموو مخلوقاتیش بەوەی عقلی هەیە و بەوەشی نیەتی بەوەی ئەجولێت و بەوەشی ناجولێت الله تعالی چەندین جار وتویەتی (**يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ**)[١٠٥] هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی هەیە سبحان الله دەکەن ! ئەلێت الله پاکە لەشەریك ئەبی الله بەتاك وتەنهایی بپەرسترێی کەچی ئێمەی ئینسان نەخێر بەلکو دەبیٚ داوا لەفلان و فلانیش بکەین و وەرێبازی فلان و فلانیش جیٚ بەجیٚ بکەین .!

جا دواتر ئەلیٚ (**فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا**)کەسیان ناتوانن زەرەرێك لەئێوە لابەن یاخود تەحویلی بکەن لەئێوە بۆ یەکێکی تر هیچ مەلائیکەیەك و پێغەمبەرێك و پیاو چاکێك دەسەلاتی

[١٠٣]:سورة المطففين اية :٢٦
[١٠٤]:سورة الإسراء اية :٥٦
[١٠٥]:سورة الجمعة اية :١

ئەمەی نیە ناتوانیٚ چ لەدونیا وچ لەقیامەت زەرەر لەئیٚوە دووربخەنەوە یاخود بەوە لەسەر تۆیی لابەن و بیبەن بۆلایەکیتر .

ئەمرۆ خەلك وا دەلیٚ ! لەتەکیە و خانەقاکاندا وادەلیٚ ! یاخود هاواری پیٚغەمبەران و پیاوچاکان و یاسا دەستکردەکان دەکریٚ . تۆ بۆ نالیٚت الله پیٚغەمبەران بەهانام وەرە الله پیاوچاکان بەهانام وەرە ئاخۆ تۆ ئەگەر هاواری الله نەکەی بەمە کافر ئەبی و هەمو کارو کردەوەشت بەتال ئەبیٚتەوە الله تعالی دەفەرمووی (وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا)[١٠٦] هەرچی عەمەل و کارو کردەوەیەك بکەی لەسەر ئەم ئەساسە ئەبیٚت بەتۆزی بادراو هیچی نامیٚنیٚتەوە چنگیٚك خۆل بەدەستەوە بگرە و بیدە بەبادا بزانە چی دەمیٚنیٚتەوە ! بە الله هەموو نویٚژ و رۆژووەکەت وای لیٚ دیٚت . جا دەفەرموی (أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ )[١٠٧] ئەوکەسانەی ئەوان داوای لیٚ دەکەن ئەوان بۆخۆیان غەم و پەژارەیان هەر هەموو ئەوەیە تاعەتی الله بکەن ومنافەسە بکەن (يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ)پیٚشبرکیٚ دەکەن کیٚ زیاتر لە الله تعالی نزیك دەبیٚتەوە بە عیبادەتەکانی لەبەر ئەمە پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لەهەموو کەسیٚك زیاتر تاعەتی الله تعالی دەکرد حەدیسیٚك هەیە بلیٚ رۆژیٚك نویٚژیٚکی نەکردوە !؟ لەمال دانیشتبیٚ و قاچی خستبیٚتە سەر قاچی و وەلا با ئەمرۆ نایکەم یاخود من نایکەم ئەوە الله تعالی لیٚم خۆشبووە تەواو ؟! لەکاتیٚکیشدا کەوا موژدەی لیٚ خۆشبوونیشی دراوەتیٚ ئینجا شەو لەهەموو کەسیٚك زیاتر ئەمایەوە بۆعیبادەتی الله تعالی ئەوە عیبادەتی پیٚغەمبەرە و موناقەسە دەکا (صلى الله عليه وسلم).

یاخود تۆ سەیری مەلائیکەتەکان بکە (يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ)[١٠٨] شەو و رۆژ تەسبیحات دەکەن ئەمانە هیچی بیٚ تاقەت نابن ئەمەیە عیبادەت (إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ)سەیری ئەم دووخالە بکە :

یەکەم: (وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ)هیوایان بە رەحمەتی الله زۆرە .

دووەم : (وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ)زۆریش لە عەزابەکەی ئەترسن .

واتا پیٚغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەپیٚش هەمووکەسیٚکەوە زیاتر لە الله تعالی دەترسا .سەری حالی بکەن کەوا هاتووە لەسونەتدا ،ئەلیٚ ئەگەر بایەك هەلبکردایە یەکەسەر ئەترسا ئەوت بایەکەی عادم بیر ئەکەویٚتەوە کە چۆن ئەو قەومەی لەناو برد یا الله ئەم بایە نەکەی بەم بایە لەناومان نەبەی یا الله ،

[١٠٦]:سورة الفرقان اية :٢٣

[١٠٧]سورة الإسراء اية :٥٧

[١٠٨]:سورة الأنبياء اية :٢٠

ئیستاش با هەلدەکا یاخود شتێك روودەدا ئەلیٚ کاکە ئەوە شتێکی سروشتیە کە وادەلی الله نیە !کاری الله یان ناوە سروشتی ،ئەی کیٚ ئەم بایە ئەهێنی وئەیبات ئەی ئەم بارانە نابینین بۆخۆتان ئەم بارانە دەباری ئەم هەموو لافاوە هەلدەکا لەولاتان و ئەم هەمو خەلکە لەناو ئەبات الله رەحمی کردوە بەئێمە لەولاتی ئێمە کەم ئەوشتانە روودەدا ئەی نابینین بەچاوی خۆتان ئەگەر بارانێکی هەلکرد و شارەکەتی برد و هیچی نەمایەوە چی ئەکەی تۆ !؟ ئاو چوە ناو مالت و چوە سەرسەقفەکەوە ! نابیٚ بترسین ، یاخود خۆر ئەگیر و مانگ ئەگیرێی رائەکەن سەیری ئەکەن چەند جوانە و رەسمی دەگرن !؟ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دەفەرمووی الله نیشان ئەدا و ئەترسێنی . ئەوە نیشانە و ئایەتی الله تعالی یە ئەگەر ئەم شتانە دەرکەوتایە زۆر ئەترسا پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) یاخود ئەگەر نیعمەتێك هەبوایە زۆر سوپاسی الله ی دەکرد هەمووی لەالله دەبینیەوە.

(**وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا**)[109] پێویستە عەزابی الله هەموومان لیٚ بترسین ئەبیٚ بترسی لە سزایەکەی کەس نیە وەکو الله سزا بدا (**لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ (٢٥) وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ**)[110] بت بەستێتەوە بەکۆت و زنجیر کەس وەك ئەو نات بەستێتەوە سزاشت بدا کەس وەك ئەو سزات نادا ئەبیٚ ئێمە لەو سزایە بترسێن کەچی ئەمرۆ ئەلیٚ سجن ئەکرێی و وات لیٚ ئەکرێی وات لیٚ ئەدەن رۆحت ئەچیٚ و ئەتۆقێنن چونکە یەقینت وایە شتەکە هەیە بەس ئەگەر یەقینت بەهی الله هەبیٚ لەو زیاتر لەهی خەلکی ئەترسی مانای ئەوەیە کەوا تۆ دەرەجەی یەقینت کەمە ئیمانمان لاوازە ئەوە کێشەی ئێمەیە خۆشەویستیمان بۆ الله لاوازە ترسانمان لە الله تعالی لاوازە .

خەلکی لەکاتێکدا داوایان لە پیاو چاکان و پێغەمبەران دەکرد لەکاتیکدا ئەوان پاك بوون رێگری لێیان کرا کەچی ئەمرۆ خەلك داوا لەکیٚ دەکا ! (هؤلاء الذين تدعونهم من دون وهم عباد تقربون اليه بتاعة) ئەمانە بەندەی منن ئێوە سەیریان بکەن لەژیانی خۆیاندا منافەسەیان کردوە لەسەر عیبادەتی الله لە الله ترساون (**وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ**)[111] (فلماذا تدعونه من دونه) الله تعالی دەفەرمووی بۆ داوایان لیٚ دەکەن لەغەیری من وەرن داوا لەمن بکەن ئەمەش لەروانگەی عیبادەتەوە ، نمونەیەك دەهێنینەوە : کەستان نوێژ دەکەن بۆ عبدالقادری گەیلانی بلێن ئەوە خوایە و ئێمەی دەیپەرستین ، ئی دوعاش هەر عیبادەتە خۆی لە زمانی عەرەبی الصلاة واتا الدعا .

[109]:سورة الإسراء اية :٥٧
[110]:سورة الفجر اية :٢٥-٢٦
[111]: سورة الإسراء اية :٥٧

له شەرعدا : واتا ئەو کردارو وتانەی کە بە الله أکبر دەست پیّ دەکا بەسەلام کۆتایی دێی هەمووی دوعایە !تۆ سەیری فاتحە بکە هەمووی دوعایە (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ)[112] داوای لیّ دەکەی یا الله هیدایەتم بدە سبحان الله کان کاتێك دەکەی واتا یا الله تۆ شەریکت نیە تۆ بمخەرە بەهەشت وە تەحیات دەخوێنی هەرهەمووی بریتیە لە دوعا سەلام لە پێغەمبەر دەکەی (صلی الله علیه وسلم) سەلام ئەکەی لە پیاوچاکان شایەتوومان دەهێنی و سلاوات ئەدەی سلاواتیش هەمووی دوعایە یانی یاالله مەنزیلەی پێغەمبەر بەرزبکەرەوە واتا نوێژەکەی تۆ هەمووی دوعایە بۆ کی ؟ دەکەی هەر بۆ الله تعالی ئەی ڕۆژووەکەت بۆ الله تعالی ئەی زەکاتەکەت بۆ الله تعالی حەجەکەشت بۆ الله تعالی یە کەچی کە پیّ دەلیّ ئەی دووعاکەت ئەلیّ بۆ الله و بۆ عبدالقادریش!! کێشەکە لێرە دروست بوو هەموو نوێژ و ڕۆژوو وزەکاتەکەت بەتال بوویەوە لەبەر ئەوەی یەك عیبادەت لەعیبادەت بۆ خوا صەرف بکەی الله تعالی ئەوانیتریش بەتال ئەکاتەوە ئەلیّ نامەوێی لە حەدیسیکی قودسیدا پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم دەفەرمووی : الله تعالی فەرموویەتی (أنا أغنی شرکا عن الشرك من عمل عملا أشرك فيه معي غيري ترکته وشرکه)[113] هەکەسێك هەر ئیشێك بکا بەشێکی کەم بۆ غەیری من سەرف بکا هەموو کارو کردەوەکانی بەتال ئەکەمەوە . وە الله تعالی ئەمەی بە پێغەمبەر وتوە (صلی الله علیه وسلم ) (لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ)[114] ئەی محمد شەیرك پەیا بکەی هەموو نوێژو ڕۆژوو وجیهاد و عیبادەتەکانت هەرچی دەعوە هەیە کردوتە لەدوای بیست و سیّ سالی پێغەمبەرایەتی بەتالی ئەکەمەوە نەکەی شەریك بکەی بۆ الله تعالی ! بەهەموو پێغەمبەرانیشی واوتوە جا ئاگاداربن گەورەترین عیبادەت مەحەبەتە ئەبیّ هەموو عیباداتت بۆ الله تعالی صەرف بکەی چەنێکمان لەمزگەوتەکان گوێی لیّ ئەبیّ بەتایبەتی پیرەمێردەکان ئەلێن یارسول الله هاوار بە الله هەموو نوێژەکەت بەتال بوو بەقەدەر یەك زەرە ئیمانت نەما کەوا ئەلی تۆ ! جا کەس نێت بەمن بلیّ ئاخر تۆ ئەم قسانە لەکوێی ئەکەیت ئاخر ئەمە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر هەیە بۆیە وا دەکا نەخێر ئەوە رق لێبوونی الله تعالی یە چونکە الله تعالی رقی لەوشتەیە شیرك بە الله تعالی گەورەترین گوناهە زینا بکە شیرك مەکە دزی بکە شیرك مەکە لەلای الله تعالی باشترێکە چونکە دزی و زینا پاك بوونەوەی هەیە بەلام شیرك نیەتی إلا بەتەوبە نەبیّ هەتا دزی و زینا ئەگەر تەوبەشی لیّ نەکەی بەنەصی قورئان الله تعالی دەفەرموی (إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا

[112]:سورة الفاتحە اية :٦
[113]: رواه مسلم ،
[114]:سورة الزمر اية :٦٥

**دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ**)[١١٥] الله تعالى لەشيرك خۆش نابێ بەلام لەغەيرى شيرك خۆش دەبێ ئەگەر مەشيئەت و ويستى لەسەر بێ .

ئەوانەى كەوا دەلێن الله خوامانە و شوێنى دەكەوێن زۆر بەى زۆرى موشريكن چ جاى ئەوانەى كەوا جوێن بە الله دەدەن و جوێن بە پێغەمبەر ئەدەن (صلى الله عليه وسلم) و گالتە و گەمە بەدينى ئيسلام ئەكەن الله تعالى دەفەرمووى (**وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلا وَهُمْ مُشْرِكُونَ**)[١١٦] زۆربەى برواداران موشريكن ، بڕواى بە الله هەيە بەلام لەگەل ئەوەشدا شەريكى بۆ الله بريار داوە سەيركەن لە سەيارەكاندا نوسراوە يا الله يامحمد ! لەچەند مال وا نوسراو و هەلواسراوە يا الله يا محمد ! ئەوە شەيركە ،يا يانى هاوارى بۆ دەكەى نابێت هاوارى بۆ بكەيت هاوار تەنها بۆ الله ئەكەرێى و بۆ كەسيتر ناكرێى .

ئەلێت ئەو بەندانەى من ئەوانە هەموويان پێش دەستى و پێشبكرێيان دەكرت لەعيبادەتدا لەترسى من الله تعالى وا دەفەرموێى ئێوە ئێستا ئەچن داوايان ئەكەن !

الله تعالى لەم ئايەتەدا باسى ئەوانى كردوە بە سێ خال :

١-بەخۆشەويستيان بۆ الله تعالى .

٢-بە لێ ترسانيان لە اللهتعالى .

٣-بەهيوا پێ بوون بە الله تعالى .

الله تعالى دەفەرمووى بەندەكانى من ئەوانەن ، ئێوەش هەمان شت دووبارە بكەنەوە منتان خۆش بوێت و هيواتان بە من بێ و لەمن بترسن لەكەسيتر مەترسن .

ئێستا ئەوەتا شيعەى رافيزە ئەلێ عەلى كورى ئەبى طالب لەسەر پردى سيرات وەستاوە كەس ناچێتە بەهەشت هەتا ئەو نەيخات عەلى يان كرد بە شەريكى الله ، كەچى لاى ئێمەش ئەلێ الله و پێغەمبەر لەسەر كورسى راوەستاون و خەلك مەحكەمە دەكەن ئەمەش شيركە بەس الله يە كەسيتر نيە بە الله پێغەمبەر كەس محاسەبە ناكا لە قيامەت وە لەخۆشى ئەترسى لەو رۆژەدا يەك ئايەت و حەديسمان نيە بلێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) محاسەبەى خەلكى دەكا ! هەمووى داواى نەفسى خۆى دەكا هەمووى لەم رۆژەدا دەلێت (**فَلا تَسْمَعُ إِلا هَمْسًا**)[١١٧] پێغەمبەران و مەلائيكە و پياوچاكان هەمووى زەليل بووە لەبەردەمى الله تعالى هەتا ناوێرن يەك كەليمە بەدەنگى بەرز بلێن ! كەسێك حالى وابێت لەكوێى موحاسەبەى خەلكى دەكا ! ئەمە بەندايەتيە .

[115] سورة النساء اية : ٤٣

[١١٦] سورة يوسف اية :١٠٦

[١١٧] سورة طه اية :١٠٨

ئینجا بەپێ ئەم خۆشەویستیە تۆ ترس و هیواکەت بە الله دەبێ هەرکەسێك چەندێك خۆشەویستی الله تعالی لەدلیدا هەبێ ئەوەندە لە الله تعالی ئەترسێ و ئەوەندەش هیوای بە الله یە ، وە چەندێك خۆشەویستیەکت کەم بوو ئەوەندە ترسەکە و هیواپێ بوونەکەت کەم دەبێ لە الله تعالی . دە الله تان زۆر زۆر خۆش بوێی زۆریشی لێ بترسن و زۆریشتان هیوا ورجاتان پێ هەبێ .

(فَمَا حَفِظَتْ حُدُودَ اللَّهِ وَمَحَارِمَهُ ، وَوَصَلَ الْوَاصِلُونَ إلَيْهِ : بِمِثْلِ خَوْفِهِ وَرَجَائِهِ وَمَحَبَّتِهِ)[118] هیچ کاتێك سنورەکانی الله نەپارێزراوە حەرامەکانی الله نەپارێزراوە وەکەس نەگەیشتوە بە الله تبارك وتعالی بەوینەی ئەوەی کە یەکێك الله زۆر زۆر خۆشبوێی وە زۆری لێ بترسێ وە زۆریش هیوای پێ بێ ئەم سێ خالە کە هەرسێکی کردەوەی دلە لەناو دلدایە وە ئەمە رەنگ ئەداتەوە لەسەر قسە کردن و کارەکانت وە قسە کردن و کارەکانت بەپێ ئەوەی ناودلتە چەنێك الله ت خۆشبوێی ئاواش لەدەرەوە وایت بۆیی .

ابن القیم دەفەرمووی (هَذِهِ الثَّلَاثَةُ : الْحُبُّ وَالْخَوْفُ وَالرَّجَاءُ ، هِيَ الَّتِي تَبْعَثُ عَلَى عِمَارَةِ الْوَقْتِ بِمَا هُوَ الْأَوْلَى لِصَاحِبِهِ وَالْأَنْفَعُ لَهُ ، وَهِيَ أَسَاسُ السُّلُوكِ ، وَالسَّيْرِ إلَى اللَّهِ)[119] ئەمە ئەساسی رۆیشتنە بۆلای الله تعالی ئەگەر ئەتەوێی بۆلای الله تعالی برۆی ئا بەم سێ شێوە بۆی برۆ خۆشەویستی ترسانبوون لە الله هیوا بوون بە الله (وَهَذِهِ الثَّلَاثَةُ هِيَ قُطْبُ رَحَى الْعُبُودِيَّةِ)[120] قُطْبُ رَحَى واتا پێشوتر دەستار هەبوو کاتی خۆی مالان هەیانبوو ساواریان پێ ئەکرد و گەنمیان پێ دەهاری جا بەردەکەی خوارەوەی پێ دەوتری ئەگەر بەردەکەی خوارەوە نەبێ بەدەکە هەر بخولێنیتەوە هیچ دەبێ !؟دوو پارەجەیە ئەم دەستارە ئەوەی خوارەوە بە عەربی پێ دوترێی قُطْبُ رَحَى کاتێك کە گەنمەکەی تێ دەکەی دەیهاری ئەگەر خوارەوە نەبێ سەرەوەی هەزار جاریش بیهاری سودی نیە ،ئەوەش کارەکانتە ئەوەی خوارەوە خۆشەویستی و ترس و هیوابوونە بە الله تعالی ئەگەر ئەوەت نەبوو هیچ قیمەتی نیە کارەکانت هەمووی ئەروا.

(مَتَى خَلَا الْقَلْبُ مِنْ هَذِهِ الثَّلَاثِ : فَسَدَ فَسَادًا لَا يُرْجَى صَلَاحُهُ أَبَدًا)[121] هەرکاتێك دلی ئیسنان لەم سێ شتە بەتال بوو لەخۆشەویستی الله و ترسان لە الله لە هیوا بوون بە الله تەواو چارەسەری نیە بۆی مەگەری ئەم دل و کەسە چارەسەری نیە ئەگەر هاتوو لاواز بوو بەپێ ئەوەش ئیمانەکەت لاواز ئەبێ.

[118]: مجموع الفتاوى" (١٩/١٥-٢١. (

[119]: مدارج السالكين " (٣/ ١٢٨.(

[120]: مدارج السالكين " (٣/ ١٢٨.(

[121]: مجموع الفتاوى" (١٩/١٥-٢١. (

ابن القيم دەفەرمووی : (القلب في سيره إلى الله عز وجل بمنزلة الطائر) دلی ئینسان كە ئەچێ بۆ لای الله وەك تەیرێك وایە (فالمحبة رأسه) خۆشەویستی الله وەك سەری تەیرەكە وایە (والخوف ، والرجاء جناحاه) ترسان و هیوا پێ بوون دووباڵەكەیەتی تەبعەن تەیر بەسەرو بە دوو باڵەكەی دەروا ئەگەر سەری نەبێ تەواو كۆتایی پێ هات واتا ئەگەر خۆشەویستی الله تعالى لەدلتدا نەبوو تەواو كە سەری نەما (ومتى قطع الرأس مات الطائر) دەمری تەیرەكە (ومتى فقد الجناحان فهو عرضة لكل صائد وكاسر) ئەگەر دوو باڵی نەبێ سەیری بكەن كاتێك تەیر دوو باڵكەی پەكی دەكەوێی ئەكەوێتە خوارەوە نامێریت بەڵام درندە پەلاماری ئەدا و ئەیخوات كەواتە دووجاری ئەوە بیتەوە كەوا شەیطان پەلامارت بدات و بتخوا )[١٢٢] .

## خەم خواردن بە لەدەست دانی یادی الله تعالى

(ان يتأسف على ما يفوت من ذكر الله تعالى) هەریەك لەئێمە بەشێكی هەیە لە ویردەكان لەخۆیی لەبەیانیان وئێواران و لەشەوان كە شەو نوێژ دەكا لەبەیانیان و ئیواران كاتێك كە زیكر و یادی الله دەكا یاخود لەزیكری دوای نوێژەكان ئەم نەصیبە و جزئە لەدەست خۆت مەدە هەر كاتێك لەدەستت دا زۆر خەم بخۆی پێ ئەمەش نیشانەی خۆشەویستی الله تعالى یە چونكە یادێك لەیادەكانی الله ت لەدەست دا واتا تۆ بیكە بەعیبادەت نەوەكو عادەت بەبەردەوام یادی الله تعالى بكە .

[١٢٢]: مدارج السالكين (١/٥١٧)

نوێژکردن یادی الله یه و قورئانیش هەر یادی الله یه زیکرەکانی دوای نوێژ زیکری بەیانیان و ئیواران هەرچی زیکرێکیتر کە بەصەحیحی هاتووە بۆمان ئەگەر بێتوو یەکێك لەوانەی لەدەست دەربچێ زۆر پێ غەمبار ئەبێ و پێ ناخۆشە کەسێك کە الله تعالی خۆش بوێی ئەلێت ویردەکەم لەدەست دەرچوو ئاخ !! بۆ نمونە : تۆ بەبەردەوام کردۆتە ویردی خۆت کە رۆژانە جزئێك قورئان بخوێنیتەوە ئەگەر رۆژێك نەیخوێنیتەوە زۆر نارەحەت ئەبی ئەوە بەلگەی تۆیە بۆ خۆشەویستی الله تعالی ئەگەر گوێت پێ نەدا ئەی فەوتێنی .

(فترا اشدا الشياء علي ضياء شيء من وقت) ناخۆشترین شت ئەوەیە کە کاتەکەی بروا یادەکانی الله نەکا لەکاتی خۆیدا .

وە یادکردنەوەی الله تەنها بەدەم نیە بەلکو بەدلیشە . بۆنمونە : نوێژەکەمان کرد دوای نوێژ زیکری دوای نوێژ هەیە لەکتێبەکانی سونەدا هاتووە کە پێغەمبەری چی وتوە (صلی الله علیه وسلم) یەکەم جار وتویەتی (أستغفر الله سێ جار )واتا داوای لێبوردنت لێ دەکەم یا الله ئەم نوێژەی ئێستا بەمنت وت بیکە من کردم کەم و کوری تێدا بوو داوای لێبوردنت لێ دەکەم .خۆی بەکەم زانیوە دواتر دەستی کردوە بە باقی زیکرەکان .

کەچی ئێستا من سەرنج ئەدەم لەبەشێکیان بەداخەوە لەگەل نوێژە فەرزەکەی دەکا هەلدەسیتێت سونەتەکەی بەدوایدا دەکات ئەمە هەلەیە ئەبێ تۆ جارێی زیرکە بکەیت .

یەك لەنیشانەکانی لەناو چوونی یەهود ئەوەبوو نوێژی فەرز و سونەتیان یەکسەر لەدوایی یەکەوە دەکرد .

لەوانەیە ئێستا پرسیار بکەن بلێن من عیبادەت بکەم دەبێتە هۆی سزا ؟! ئەلێن کاکە پێغەمبەر وای وتوە (صلی الله علیه وسلم) زیکر بکە دوای نوێژەکانت ، ئەوەتا دەفەرمووی هەرکەسێك دوای نوێژەکان ئەم ئایەتە بخوێنی (اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۖ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ)[١٢٣] دەچێتە بەهەشتەوە . زیکرەکانی تر بکە ئینجا دواتر هەلسە نوێژە سونەتەکەت بکە وە بشزانە سونەت لەمزگەوت خێری کەمە بەیەك دەرەجە ئەچێ کەچی لەمالەوە بە ٢٧ دەرەجە دەچێ نوێژە سونەتەکانت لەمالەوە بکە ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تورە دەبوو دەیوت نوێژی سونەت

[١٢٣]:سورة البقرة اية :٢٥٦

ببەنەوە بۆ ماڵەوە ماڵەکانتان مەکەن بەسەر قەبران ، کەچی زیکرەکەی ناخوێنی و مخالەفەی پێغەمبەری خوا دەکا (صلى الله عليه وسلم) و نوێژەکە دەکا .

یاخود زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران لەنێوان نوێژی بەیانی و رۆژ دەرکەوتن وە هی عصریش لەنێوان نوێژی عصرو خۆر ئاوابووندایە .

(إذا فات ورده وجد لفواته ألماً)ئەگەر یەکێك لەو زیکرانەی لەدەست بچیٚ ئەلیٚ زیکرەکەم لەدەست دەرچوو ،ئینجا ئاگاداربە زیکریش لەخۆتەوە دای مەهێنە پیرەمێردان و پیرەژنان تەسبیحی سەت و چەندی دنکی پیٚ یە هەر دەکا بەوەندە .ئەوانە محددەدە تەنها ئەوەندە بکە بەلام بەپەنجەکانت دواتر چەندی دەکەی بکە (اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا (٤١) وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا)[١٢٤] پێویست ناکا بیژمێرێت الله بۆی ژماردوی ، علما یان دەیان فەرموو : چاکەکەت لەسەر الله مەژمێرە گوناهەکەت بە تەسبیح بژمێرە ، ئەوەی حەدیسی لەسەر نەهاتوە کە حەددەدەی دیاری کراوبیٚ گوناهەکانت بژمێرە بزانە چەندە و تەوبەی لەسەریان بکە چاکەکانت بە تەئکیدی الله تعالى بۆت ئەنوسیٚ ئەگەر بەتەقوا وە بیکەیت .

چەندێك ماڵ و منداڵیان لەدەست دەرچووبایە ئەوەندە پێیان ناخۆش دەبوو کەوا زیکرێکیان لەدەست دەرچووبایە ئەمە نیشانەی خۆشەویستیان بوو بۆ الله تعالى ئەگەر لەدەستیشی دەرچووبایە ئەی گەراندەوە و نەیدەهێشت لەدەستی دەر بچیٚ .

دایکمان عائیشە دەگێرتەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ )( كَانَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ إِذَا عَمِلَ عَمَلًا أَثْبَتَهُ)ئەگەر عەمەلێکی بکردایە یاخود چاکەیەك یان زیکرێك بەردەوام ئەیکرد (وَكَانَ إِذَا نَامَ مِنْ اللّيْلِ أَوْ مَرِضَ صَلّى مِنْ النّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً)ئەگەر شەوێك وا رێك بکەوتایە نەخۆش بکەوتایە نەیتوانیایە نوێژە سونەتەکانی بکا یا زیکرەکە یا قورئانەکە کەداینابوو بخوێنێتەوە لەشەودا نەی ئەتوانی لەبەر نەخۆشی بەیانیەکەی ئەیکردەوە لەشەودا ١١ رکاتی دەکرد بەرۆژ ١٢ی ئەکرد چونکە لەرۆژدا وتری تێدا نیە )[١٢٥]

ئەگر بێتوو بەندە بەم شێوەیە بکات خۆشەویستیەکەی بۆ الله تعالى زیاد دەبیت ئەگەر وانەکا .( وإذا تسهل في القضاء سهل عليه تضع في وقت).

[١٢٤]:سورة الأحزاب اية :٤١-٤٢
[١٢٥]:رواه مسلم (٧٤٦)

## بەرەحم بوون لەگەل موسلمانان و توند و تیژ لەگەل کافراندا

(أن يكون شفق علي جمع العبادة لله رحما بهم شديدا علي اعداء: أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ)[١٢٦] الله تعالى کەوەصفی ئەوانە دەکا کە لەگەل پێغەمبەردان (صلى الله عليه وسلم) باسی سیفاتیان دەکا ئەگەر ئەتەوێت لەگەل پێغەمبەردا بیت (صلى الله عليه وسلم) ئەبێ ئەم سیفەتەت تێدا بێت .

الله تعالى دەفەرموویێ : (مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ)[١٢٧] الله تعالى شایەتی ئەدا کەوا محمد پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) هەمووتان تەئەکیدبن هیچ گومانتان نەبێ محمد (صلى الله عليه وسلم) کەسێك نەبوە وەکو کافر و ملحیدەکان ئەلێن خوای چی و

[١٢٦]:سورة الفتح اية :٢٩
[١٢٧]:سورة الفتح اية :٢٩

پێغەمبەری چی کابرایەك بوو لە جزیرەی عەرەبی ویستی ئاغایەتی پەیدا بکا ئەوە بوو لەمەککەدا نەیتوانی لەگەل بولغا و فصحای قوریشدا دەرچێت چوو مەدینە کەوتە پیاو کوشتن و تیرۆرستی ئەوە وەصفی پێغەمبەرە لەلایەن ئاوەهای باس دەکەن ئەو کافرانە ، بەلام الله تعالی واناڵێت الله تعالی دەفەرمووی (مّحمَدٌ رَّسُولُ اللَّهِ) محمد رسولی الله یە هەمووتان تەئەکیدبن لەوە وە ئەوەی ئەو ئیمانە نەهێنی هەزار جاریش ئیمانی بە الله بێ کافرە خوای دەکرد چاوەکانم دەبوو .

کەچی ئێستا باسی ئەوەمان لەگەل دەکەن دەلێن یەهود و نەصارا کافر نین الله تعالی لەقورئاندا کافری نەکردوون ، کە لەکاتێکدا الله تعالی دەفەرموویێ (لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ)[١٢٨] بە تەحقیق کافرە ئەوەی بلێت الله سێیانە ئەی ئەمان نالێن خوا سێیانە !؟ با ئەم کافرانە ئیمانیان بە الله هەبێ دێن دەلێن ئیمانی بە الله هەیە تۆ پێ مەلێ کافر ئی خۆ شطانیش ئیمانی بە الله هەبوو بەس ئەم نالێت (مّحمَدٌ رَّسُولُ اللَّهِ)ئەلێ درۆ دەکا ئەگەر بیشیلێت ئیقراری پێ ناکا نایەتە سەر مەنهەج و ریسالەکەی چاك الله و پێغەمبەرەکەی بناسی (صلی الله علیه وسلم) بەهەشت و جەهەنەم بناسی کەلەسەر بەرنامەکەی نەرۆیشتی الله تعالی تۆیی ناوێت ئەبێ خالیص بیت بۆ الله تعالی .

(مّحمَدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ)ئەوانەی کەوا لەگەل ئەم پێغەمبەرەدان (صلی الله علیه وسلم) کەصەحابەکانی بوون کە ئەوانەشی دێن دەبێت هەتا رۆژی دوای ئەم سیفەتانەیان تێدا بێ دەفەرمووی (أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ)[١٢٩] یەکەمین جار باسی شەدیدی کرد کەوا شەدید و بەهێزن رق ئەستوورن بەرامبەر بەکافرەکان ،بەلام زۆر نەرمو نیان و رەحیمن و شەفیقن بەرامبەر بەیەکتری و لەنێوان خۆیاندا .

ئێستا تخوا بەپێچەوانەوە نیە !؟ خوا خوامانە سەری یەکیتری بخۆین بەلام کافرێك دەخەینە سەرسەرمان هەزار جوێن بە موسلمان ئەدەین بەلام کافر ئەخەینە سەر کەشکەلانی بەرزی ئەوهامان لێهاتوە ئەمەش هەلەیە . ئەوە خۆشەویستی الله نیە لەدەلەکەتدا ئەوە ئیمانەکەی تێدا نەماوە بەمە ئیمانت هەمووی هەلدەوەشێتەوە .

یەك لەوشتانەی کەوا ئیمانی پێ هەلدەوەشێتەوە ئەوەیە کە حەزبکەیت کافر سەربکەوێت بەسەر موسلماندا والله ئیمانت هەمووی هەلدەوەشێتەوە ئەوە ئیجماعی علما یە لەکیتابی شەرعدا هاتووە لەبابی ریدە ئێوە دەبێ ئەم بابە بخوێنن کێ کیتابی فقهە وشەریعە دەخوێنێتەوە إلا ئەو کەسانە نەبێ کەوا تایبەت مەندن بەدیراسەکردنی کیتابەکە کە مامۆستا و قوتابیەکانی کولیە و پەیماناگاکانن هەر ئەوەندەیە

[١٢٨]:سورة المائدة اية :٧٣
[١٢٩]:سورة الفتح اية :٢٩

خەلك كوا كیتابی شەرع ئەزانیٚ كەچی ئەوانیش جیٚ بەجیٚ ناكەن كاتێك ئەوانیش دەیلێنەوە هەر مەرەكەبی سەر وەقەكەیە جیٚ بەجیٚ ناكەن لەكیتابی ریدە زیاتر لە ٤٠٠ خال و باس دەكا كەوا ئیمانەكەت هەلدەوەشێتەوە ئەگەر یەكێك لەمانەت تێدا بیٚ جا هەندێكیان پەیوەستن بەدلەوە وە هەندێكیتریان پەیوەستن بەزمانەوە وەهەندێكیتر پەیوەستن بەكردەوەكانتەوە. ئەمە زۆر ترسناكە ئەبیٚ بیزانیت و دیراسەی بكەیت .

لەبەر ئەوە پێخۆشبوون بەوەی كافر بەسەر موسلماندا زال بیٚ ئەبێتە هۆی هەلوەشاندنەوەی دین ئاگاداری خۆتبە .ئایەتەكە پێمان دەلیٚ (**أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ**) زۆر توندن لەسەر كافرەكان زۆر رق ئەستوورن لەسەر كافرەكان دواتریش دەفەرمووێی (رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ)رەحم ئەكەن بەیەكتری یەكتریان خۆش دەوێی .

(ولا تأخذ في لله لوم تولائم ولايصرف عن الغضب له صارف) بەهیچ شێوەیەك لەلۆمەی لۆمەكاران ناترسی لەبەر خاتری الله . كەچی ئەمرۆ ئەگەر لەگەل موسلمانێكدا هاتوو چۆ بكەی ئەلیٚ ناوێرم زۆر لەگەلت هاتوو چۆ بكەم زۆر جار لەگەل مندا برادەران هاتوون خۆیان شاردۆتەوە ئەترسیٚ لەبەر ئەوەی تۆ ریشت هەیە دواتر ئیتهام دەكرێم . من بەتۆ دەلێم ریش دینە یاخود دین نیە !؟ ئی خۆ ئەمە شیطان نەیووتوە ئەمە الله وتویەتی الله تعالی دەفەرمووی (**يَا ابْنَ أُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِي**)[١٣٠]باسی ریشی نەكردوە قورئان دەی تۆ قورئانت خۆش ناوێی ! دە تۆ نالێت بەقوربانی قورئان بم بەخوا درۆیە كە دەلیٚ بەقوربانی بم بەم شێوەیە كەلیٚ ئەترسی ئاخر تۆ چۆن لەقورئان ئەترسی حەزدەكەی پێتەوە نەبیٚ بەلام نیشانەكانی كوفر و كافرین هیچ هەزار لاعیب بەخۆتەوە وەبكە كە جەریمەی زینا و كوفر و ئەرەق خواردنەوە دەكا بەسینگی مندالەكەیەتی ناوەكەی یاخود رەسمەكەی هەمووشتێكی هەلواسیوە بە سینگ و بەپشتیدا ئێستا سەیری زۆربەی فانیلەكان بكە ناوی كافرەكانی پێوەیە خۆمن نالێم ناوی الله و پێغەمبەر هەلواسە ئەوەش باش نیە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) لەدلیدا بوو بە كرداری جیٚ بەجیٚ دەكرد . زۆر شت هەیە لەلای ئێمە بوە بەشكلی ئێستا لەوانەیە لەرەدی ئەم قسەیە والله دەچم سەیارەكەم لا اله الا الله محمد رسول الله دەنوسم نەخێر واش مەكە الله تعالی وای پیٚ نەوتووی وە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هیچی پێوە نەنوسرابوو بۆیە دەبیٚ ئێمەش هیچ هەلنەواسین كەچی ئێستا لەمزگەوتەكان ئەنواع و ئەشكال شتی پێدا هەلواسراوە بەلام دلەكان هەمووی دووژمنی

[١٣٠]:سورة طه اية :٩٤

یەکترییە کاتێکیش دەچێتە دەرەوە دژایەتی ئەم لا اله الا الله یە دەکا دژایەتی محمد رسول الله دەکا (صلى الله عليه وسلم) ئایەتێك دەنوسرێتەوە دە برۆ جێ بەجێ بکە لەدلتدا دای بنێ و لەکردارت دا بێ لەوتەکانت دا بێت .

ئەبێ ئەمە بزانین دینی ئیسلام دینێکە بریتیە لە ئیعتقاد و قول و عەمەل لە شکلیات نیە ناوەرۆکەکەمان هیچی تێدا نەبێ دل و کارو کردەوەکەمان هیچی تێدا نەبێ دووژمنایەتیشی بکا !! .

سەیری فیرعەون بکەن ئەوانەی کەوا قورئان خوێنن ئەم ئایەتەتان خوێندۆتەوە (إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ)[131] علماء یان ئەلێن یەك لە سیاسەتەکانی فیرعەون ئەوە بوو خەلکی پەرت پەرت دەکرد تەبعەن ئەوکەسانەی لەژێر دەسەلاتی ئەودا ئەژیان قبطیەکان بوون لەگەل بەنی ئیسرائیلیەکان کاتی خۆی کە کاتی خۆیی زوو زەمانی پێغەمبەر یوسفدا هاتبوون بۆ ئەوێی سیاسەتی خەلك پەرت کردنی بەکار دەهێنا چونکە ئەگەر وابێ ئەو خەلکە یەك ناگرێت زولمی فیرعەون لەناو بەرێت هەمووی بەخۆیەوە مەشغول دەبێ دائیمەن ئەوە عادەتی طاغوت و فیرعەونەکانە نایلێن بەهیچ شێوازێك خەلك لەسەر ئەم دینە راستەقینەی الله تعالی بمێنێتەوە بەش بەشیان دەکەن کە بەش بەش بووی بەخۆتەوە مەشغول دەبی ئیتر هیچت پێ ناکرێی پشتت ئەشکێ جا بۆیە یەك لە نیشانەکانی خۆشەویستی الله ئەوەیە ئەبێ یەك بین ئەگەر یەك نەبی و بەش بەش بیت هەموو هێز وقوەتت ئەروا الله تعالی دەفەرمووێی (وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ)[132] ئەگەر باسی مەسەلە ئیمانیەکەی لێ نەکەی بێنە سەر واقیعی ئێستا ئەگەر تۆ ئەتەوێت ببیت بەشتێك ئەبێ تۆ یەك دەست بی ئێمەی موسلمان یەك دەست نین هەتا ئەوانەی لەدەرەوەی خانەی ئیمانن ئەوانیش یەك دەست نین کێشەکە ئەوەیە یەك دەست نین ئێمە بەخۆمانەوە ئەنالێنین سالە های سالە لەکۆنیشدا ئەو لاینگری فلانی کردوە ئەو لەویدایە هیچیان بەهیچ نەکردوە ئەگەر ئەتەوێت بۆ دونیا شتێك بەدەست بهێنی یەك بە ئەتەوێت بۆ قیامەت یەك بە ، بەلام ئەوەی دونیا هەزار جار یەکیش بی کە مردی هەمووی ئەروا هیچی نامێنی هیچ سودی نیە هەموو دونیات هەبێ مولکی دونیات هەبێ و پاشای هەموو دونیا بیت وەکو فیرعەون قارون و هامان فلان وفلان مردن و رۆیشتن بینیتان چۆن قەزاف مرد و رۆیشت چ زولم و کوفرێکی هەبوو رۆیشتوو هیچی نەما ، باشە ئەو مەلا و زانایانەی کەوا کاتێك وەسفی قەزافیان دەکرد بەقوربانی دەبوون ئێستا هەمووی ماوەتەوە بۆ لای الله

[131]:سورة القصص اية :٤
[132]:سورة الأنفال اية :٤٦

تعالی و موحاسەبەیان بکا ئێستا تۆ قێزت دێت باسی قەزاف بکەیت بەلام کاتی خۆی شعریان بەسەردا ئەوتوە لەترسی ئەودا .
یان صدام حسێن چەند ساڵ حوکمی کرد کێ پیاو بوو قسە بکا ئەو هەموو مەلایە لەسەر مینبەر دەیانوت بە جۆرەها وشە وەسفیان دەکرد والله هەمووی تۆمارکراوە بۆ رۆژی قیامەت ئەبێ ئەوە لەبەر دەمی الله دا بلێت ! تخوا ئینسان بمرێت باشترێکە لەپێناوی الله دا یاخود ئەو قسەیە بکا خۆ هەمووشی مرد زۆربەی ئەوکەسانەی لەم زەمانەدا بوون مردن بەمەلا و غەیری مەلا مردن کێ سەربەرز بوو کێش سەرنزم بوو ئەوەی لەگەل حەق بوو سەربەرزبوو ئەوەی لەگەل بائەوەی لەگەل حەق بوو سەربەرزبوو ئەوەی لەگەل باطلبوو سەرنزم بوو ئێستاش وایە و تارۆژی قیامەتیش هەروا ئەروا لەبەر ئەوە مەرۆ دووژمنایەتی براکەت بکەی ! مەرۆ درۆی لەسەربنوسی و تەقریری لەسەر بنوسی بۆ ئەبێ دووژمنی یەکتر بین بۆ ئەبێت رقمان لەیەکتر بێ زۆر کەس هەیە لەمەجلیسدا تەقریر ئەنووسی و ئەڵێ (کامەران) وای وت ئاخر لە الله ناترسی ! ئاخر من چیتان پێ دەلێم پێتان دەلێم بەس الله راستە دەست پاکی و داوێن پاکی زینا حەرامە عەرقە حەرامە قورمارکردن حەرامە خێزانەکەت با بەرەلا نەبێ خۆت و مندالەکانت رووبکەنە الله با لەناو گۆرەکەتدا سەلامەت بن با رۆژی قیامەت بچنە بەهەشت لەمە زیاترتان پێ وتراوە لەمە زیاترم پێ نەوتوون بۆ دووژمنی یەکتر بین با بێن و هەمومان برای یەك بین و لەسەر ئیسلامەتی و یەکخوا پەرستی بژین بەدل بلێ سەلامی خوات لێ بێ براکەم یارەبی نەچیتە جەهەنەمەوە یارەبی ژن و مالت سەلامەت بێ ئێستا ئەلێ السلام علیك لەدلەخۆیدا دەلێ یارەبی خوا لەناوت با لەبەر ئەوەی رقت لێ یەتی چونکە لەسەر پێری تۆنیە ئەمە حەقیقەتە . علما دەفەرموون : قەت دلت خۆش نەبێ بەزۆری خەلکی ناو مزگەوتەکان و زۆر تەواف کەرەکان چونکە ئەوە نین کە الله دەیلێ لەدلدا ئەوە نین ئەوە حەقیقەتە هەرکەسێك دەیەوێت بە دلی ئەو قسە بکەیت ئاخر وانیە ئەبێ بەشەریعەتی الله قسە بکەین شەریعەتی الله دەمان کاتەوە بەیەك بەس هەرکەس بە دل و کەیفی خۆیی بوو ئەوکاتە پرە لەدەردی بێ دەرمان .

هەر لەو کاتەی شەیطان هاتۆتە سەر زەوی لەگەل باوك و دایکمان ئادەم و حەوا پێ خۆش نیە بەهیچ شێوەیەك لەگەل یەکدا لەسەر دین بمێنەوە بەبرایەتی و بەخۆشەویستی خوا خوای ئەوەیەتی لە هەم و دەقە و کاتێك و ساتێکدا بمانکات بە دووژمنی یەکتری چونکە لەسەر ئێمە وای لێکراوە ئێمە دووژمنێکمان هەیە دووژمنێکی زۆر زۆر گەورە و نادیاریشە یانی ئەگەر دووژمن دیاربوو ئەوە هیچ دەزانی کێ یە وچی دەکا بەلام ئەگەر نادیار بوو بۆنمونە بەم زەویەدا برۆ بلێ قومبەلەیەکی لێ یە بۆتۆ دانراوە وبەس تۆش نازانی لەکوێدایە هەموو ژیان ئەبێت بەخەتەر خۆ لەیەك شوێنیش دایە کەچی هەر هەنگاوێك ئەنی ئەلێ

نەكا پێمدا بتەقێتەوە ئاوا خۆتی لێ دەپارێزی شەیطان ئاوەهایە لەهەر شوێنك و جیگایەك و كاتێكدا هەتا رۆژی قیامەت بەلایە بۆ ئێمە .

شەیطان ئەولیاكانی خۆیی ئەوانەی كەوا لێی نزیكن فێریان ئەكا وەحی یان بۆ ئەكا چۆن الله تعالی وەحی دەكا بۆ پێغەمبەرەكانی كە بەپیاو چاكان بلێ چاكە بكەن و خراپە نەكەن ئەویش وەحی بۆ ئەولیاكانی خۆیی ئەكا كە هەرچی خراپە هەیە لەگەل ئێمەدا بیكەن نەك تەنها بە ئینسانەكان بەلكو بە جن و بەئینسەوە تۆ بزانە دووژمنەكانمان چەند زۆرە ! هەرچی جنۆكەیەكی شەیطان هەیە هەرچی ئینسانێكی شەیطانی هەیە هەمووی دووژمنی تۆیە .

ئینجا سەرنجیش بدەن بەبەردەوام ئەو خراپەكارانە لە سەرووی دەسەلاتەوە بوون ئەو دووژمنانە ئێوە بەدرێژایی مێژوو سەیر بكەن بۆ پێغەمبەران و پیاوچاكان و هەتا ئێستاش زۆر بەی كاتەكان ئەوەی دەسەلاتی گرتوە بەسەر ئەم خەلكەدا ئەوانەی كەوا دووژمنی ئێمەن ئەوانەی كەوا دووژمنی قورئان و ئیسلام و ئەودینانەن كەوا الله تعالی ناردوویەتی لەبەر ئەوە لەهەموو كاتێك و شوێنكدا تۆ موعەرەزیی بۆ ئەوەی لێت بدرێی نایەلن بەهیچ شێوەیەك تۆ یەك دەست بی ئومەتی ئیسلام یەك دەست بی پارەچە پارچەیان دەوێی حزب دروست دەكەن و بەخۆتەوە مەشغولت دەكەن وات لێ دەكەن هەمووی رقی لەیەكتر بێ تەنانەت لەمزگەوتەكدا لەتەنیشتەوە نوێژ ئەكا رقت لێ یەتی خوا خواتە زوو بچیتە دەرەوە سەلامی لێ نەكەی چونكە پێری تۆ نیە لەسەر ریزی تۆ نیە لەسەر جەماعەتی تۆ نیە چونكە یەك دل نین ئەمە واقیعی ئێمەیە !.

زۆر زەحمەتە هێنانەوە ئومەتێك بۆیەك دەست بۆ یەك ریز ئا بەم شێوەیە بێ ئەم هەموو دووژمنەشمان هەبێ لەناو خۆشماندا پاك نەبین

## بەكەم زانینی كارەكانت

(أن يستقل في حق محبوبه جميع أعماله أحوالة وأقوال فلا يرها قط الا بعين نقس وأزران عليها)لەحەقی خۆشەویستەكەتدا كە الله تعالی یە هەموو كارێكی خۆت بەكەم بزانی هەموو كارێكی خۆت بەكەم بزانە ! بزانی كەوا كەمتەر خەمیت كردوە لەبەرامبەر حەقی الله دا تەكبور لێ نەدەی عجب نەتگرێی .

**دوو جۆرە كەس باس دەكەین :**

کەسێکیان قورئانی هەموو لەبەرە شەو نوێژ ئەکا صەدەقاتی زۆر بەلام لەدلیدا عجبێك هەیە ئەلێ من چەند باشم و ئەوخەلکەش هیچ ناکا ! یاخود واناکەن وەکو من . !

کەسێکیشمان هەیە خوا ئەناسی و موحید و یەکخوا پەرستە الحمدلله بەلام گوناهی هەیە بەبەردەوام ئەکوزێتەوە بەسەر گوناهەکانیدا زەلیلی گوناهەکانی وای لێکردوە هەردەم ئەگریی . !

ئینجا علما دەلێن کەسی دووەمیان باشترە لەهی یەکەمیان لەبەر ئەوەی زەلیلە و سەر بەرزناکاتەوە .

سەیری دوو کەس بکەن ئەگەر کەسێك کیبری هەبێ با کێشەشی لەگەل تۆدا نەبێ هیچ کاتێکیش نەت ناسیبێ کاتێك جارێك بینیت تەکبورێکی تێدا هەیە لەخۆتەوە حەزی پێ ناکەی خوای ئەکرد باشترین کەس دەبوو .

لەبەر ئەوە ئەم سیفەتە تەنها لە الله تعالی دا جوانە تەنها بۆخۆیی هەلیگرتووە (المتکبر) الله تعالی کە گەورەیە بەسەر هەموو مخلوقەکانیدا ئەو شایستەی ئەو سیفەتەیە تۆ نیت و تۆ بەندەی ئەویت تۆ بەندەی چۆن تەکبور ئەکەی شەیطان تەکبوری کرد ملی خۆیی شکاند دە تۆش ئەم رێگەیە مەگرە (**لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ**)[١٣٣] .

بەکەمی بزانە کارەکانت بەکەم بزانە لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی کە ئەگریی و ئەپارێتەوە یا الله گوناهم کرد تخوا لێم خۆشبە یا الله ئەزانم ئێستا بمگریت بە عەزاب بەرم نادەی الله تعالی ئەم جۆرە کوزانەوەی پێ خۆشە هەتا لەحەدیس هاتووە دەلێت دەبرۆ چی دەکەی بیکە من لێت خۆشبووم مەبەستی لە گوناهەکانە نەوەکوفر چونکە الله تعالی جارو بار بە گوناه سیفەتی زەلیلی و ئینکساری ئیمانەکەی ئەوەندە گەورەیە و تەوحیدەکەی ئەوەندە گەورەیە ئەوکەسە ئەصلن گوناهەکانی وەزنی نیە لەئاستیدا حەدیسی بطاقتان نەبیستوە ؟! حەدیسێکی زۆر گەورەیە ئەلێت : پیاوێك ئەهێنن لەرۆژی قیامەتدا بۆمحاسەبە کردن ٩٩ سجل گوناهی هەیە هەر سجلێکی بەقەدرایی بینایی چاو پان و درێژە پریەتی لەگوناه کە سجلەکانی ئەکێشن ئەلێ تازە قورکرا بەسەرماو لەناو چووم چەندێك قورسە ئەمانە ! دواتر الله تعالی دەفەرمووی : من زولم ناکەم ئەمرۆ زولم نیە لێرە لەلای الله تعالی یان عدلە یاخود فضلە یان بەعدالەت لەگەلت ئەکا والله موستەحەقی ئاگر نەبی ناتخاتە ناو ئاگرەوە بەلام بۆ بەهەشت وانیە والله موستەحەقی بەهەشت نیت دەتخاتە بەهەشتەوە ئەلێ بەفضلەی خۆمە ئەلێ نا تۆ ئەمرۆ شتێکت هەیە لەلای ئێمە تەوحیدەکەت و ئیمانەکەت و ئنکسارەکەی تۆ ئادەی برۆن لە لە سجلێکدا لا اله الا الله کەی بۆ بهێنین و بیکێشن کە

[١٣٣]:سورة النور اية :٢١

ئەیخەنە سەری سجلەکانیدی ئەخات بە ئاسماندا ئەوەندە قورسە سجلەکەی ، تەوحیدتان بەقوەت بکەن یەکخوا پەرستیتان بەهێز بکەن ، عەمەل ئەساسە ئاگاداربە بەلام کەمێك عەمەل باشترە لە زۆر عەمەل کە تۆ عقیدە و ئیمانەکەت دۆراندبێ. جا بەکەمی بزانە کارەکانت کە بەکەمت زانی ئەبیت بەم کەسە بگری و بپارێوە گریان بێت بەچاوەکانتدا و لەکارەکانی خۆت رازی مەبە عجب وکیبر نەت گرێی .

(ویري شئا محبوب أعظم)بلی یا الله تۆ زۆر لەمن گەورەتری منێکی بەندەیەکی رەزیل ئەوشتە کەمانەی کە من بۆتۆی دەکەم پیێ رازیبم و پێیان بنازم .

تۆ بیربکەوە کێ هیدایەتی دایت ئەم نوێژە بکەیت ! الله جل وعلی . کەواتە بەخششی الله یە کە بەتۆی بەخشیوە نوێژەکەت و تاعەتەکەت و ئیمانەکەت هی الله یە هی خۆت نیە ، ئەبێت بلێ یا الله من ئەوەی کە دەیکەم هی تۆیە ئینجا خۆشت فەزلم ئەدەیی وەکو ئەوەیە وایە کە کەسێك پارەیەکت ئەداتێ ئەلێ برۆ ئەم پارەیە بکە بەخێر ! کاتێك کەتۆ ئەیکەت ئەلێ دەستت خۆشبێ و کارێکی باشت کرد کەچی تۆ دەلێت ئاخر کاکە ئەوە هی خۆتە ! تۆش دەبێ بەم شێوەیە بیت یا الله ئەمە هەمووی هی خۆتە زۆر سوپاست دەکەم ، بەلام گوناهەکەنم هی خۆمە هی تۆ نیە کە ئەشلێن هی تۆ نیە مەبەستمان ئەوە نیە کەوا بەبێ قەدەری الله روبدا نەخێر بەلکو هەموو شتێك بەقەدەری الله دا روودەدا لە خێروچاکە (**يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ**)[١٣٤] بەلام تۆ مەسئولی لە گوناهەکەت مەسئولی لەو گوناهانەی کەوا ئەیکەیت چاکەکانت ئەبێ بلێت یا الله هی خۆتە هەرچی خێرێك لەمندا هەیە هی تۆیە وە هەرچی شەرێك لەمندا هەیە هی خۆمە و خۆم کردومە و خۆم بەرپرسیارم لێ ئەبێ بەم شێوەیە بیت لەگەل الله تعالی دا .

(وقدرؤا أعلی من أن یضا نفسه والاعمال له) قەدری الله ئەبێ زۆر لەوە گەورەتر بێ کە تۆ رازی بی لەنەفس و لە ئەعمالی خۆت قەد رازی مەبن لەخۆتان (فهو أشد شیئا إحتقارا له وإزران علیها)زۆر زۆر ئەبێ خۆت بە کەم بزانی ئەبێ خۆت بەکەمتەر خەم بزانی .

(وإذا غفل عن مراد محبوبه)ئەگەر تۆ بێ ئاگا بووی لەوەی کە الله لێ داوا کردووی (ولم یوفِّ حق)ئەگەر حەقی الله ت نەدا (تاب الیه من تابة الاهل کبائر) ئینسانێك کە الله خۆشی بوێی کەلەحەقی الله تعالی دا کەمتەر خەمی دەکا ئەبێ تەوبەیەك بکا چۆن کەسێك زینا ئەکا و قەتل دەکا پیێ ناخۆشە و دەپارێتەوە کەوا الله لێ خۆشبێ ئەبێ تۆ ئەم کەمتەر خەمیەت ئاوا بەلاوە قورس بێ .( فتوبة تفارقه ابدا)قەت ئەم

[١٣٤]:سورة المدثر اية : ٣١

کەسە واز لە تەوبە ناهێنی بەبەردەوامی تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای الله تعالی ئەلێ یا الله من تاوانبارم و من حەقی تۆم نەدا .

نمونەیەکی زۆر ئاسان دەهێنینەوە کە کەم کەس هەیە بیری لێ بکاتەوە :

هەمووتان بیستوتانە کەچووی بۆ سەرئاو کە هاتیە دەرەوە دەلێت (غفرانك)[135]

غفرانك : واتا یا الله ئا ئەو دانیشتنەم کرد ئێستا لەسەر ئاو کاتێکم کوشت و یادی تۆم تێدا نەکرد تۆ لێم خۆشبە یا الله تخوا ! چەند دەقەیەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وای فێرکردووین کە داوای لێخۆشبوون بکەین کەچی ئێمەش سەعات و رۆژ و مانگ و سال دەفەوتێنین داوای لێخۆشبوون ناکەین چونکە نازانین ئەوە مانای چیە ! کەلیمەکە بەس بەدەم ئەوترێی ، تۆ دێتە دەرەوە لەسەر ئاو دەلێ یا الله من داوای لێبوردن دەکەم زۆرم خواردبوو ئەوەندە دانیشتم یا الله کاتم رۆیشت لێم ببورە بۆیە هاتووە دەلێ لەوکاتەدا تۆ قسە مەکە زیکر مەکە شوێنی ئەمە نیە تۆش دەلێ یا الله لێرە تووشی ئەوە بووم بۆیە یادم نەکردی یا الله داوای لێبوردنت لێ دەکەم ، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆیی ئەیفەرموو :ئەگەر ئینسان چەند پاروێك بخوا بەس پشتی راست بێتەوە ، نەك بە پشت دا بکەوێت و هەلنەستێتەوە دواتر چەندەها وەقتی لەسەر ئاو ببات بەرێوە ! (بحسب ابن آدم أكلات يقمن صلبه)[136] تەبعەن ئەزانن کە ئەگەر یەکێك برسی بێت چی بەسەر دێت دەست ئەگرێت بەسکی و ئەنوشتێتەوە بەس کە تێر دەخوات بەرزدەبێتەوە کە برسیتی نامێنی ،بەلام کە تێر تێر دەخوا ئەکەوێت بە پشتا ! ئیتر خەوی دێت و سەر ئاوی بۆ دێی .

جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فێری کردووی بلێ یا الله داوای لێبوردن دەکەم لەم ماوەیەی یادی تۆم نەکرد ،ئینجا تۆ بیربکەرەوە چەند کاتمان رۆیشتووە جا ئەم جۆرە کەسی ئاوەهان (التوبة لون والتوبة غير لون) تەوبەی ئەمە رەنگێکە تەوبەی خەلکیتر رەنگێکیترە جیاوازێکی زۆر لەنێوان تەوبەکاندا هەیە ئەگەر سەیریان بکەین (وكل مزدادت حب إزدادت معرفة بحق) چەنێك تۆ الله ت خۆش بوێی ئەوەدە ئەزانیێ کە حەقی ئەو الله یە چیە و ئەیپارێزی (وشهود لتقصيره)وە شایەتی ئەدا بەوەی مقصیر و کەمتەر خەمە لەبەرامبەر الله تعالی دا (فأعظم بذلك توبة) تەوبەکەی ئەبێت بە تەوبەیەکی قورس واتا تەوبە جۆری زۆری هەیە الله تعالی دەفەرمووی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا)[137] تەوبەی نەصوحیش ئەمەیە کە باسمان کرد (ولذلك كان خوفه أشد وإزراه على نفسه أعظم) ترسەکەی زۆر زۆر

[135]: الكتب » سنن الترمذي «كتاب الطهارة عن رسول الله صلى الله عليه وسلم «باب ما يقول إذا خرج من الخلاء

[136]: الكتب » جامع العلوم والحكم «الحديث السابع والأربعون ما ملأ آدمي وعاء شرا من بطن

[137]:سورة التحريم اية :٨

ئەبیٚ وە کەمتەر خەمی خۆی بەلایەوە زۆر قورس ئەبیٚ ئەوکاتە (توبة المحب صادق عارف بربە وبحقە هی توبة وسواه محجوب عنها ) ئەمەی تەوبە ئەوانیتر هەر سەیریان ناکریٚی تەوبە هەیە ئەبیٚ تەوبەی لیٚ بکەی بۆنمونە کابرا هەر بەدەم ئەلیٚ تەوبە خوایە کەچی لەکاتی تەوبەکەدا گوناهەکە دەکا ئەوە تەوبە نیە ئەبیٚ تەوبە لەو تەوبەیە بکەیت .

ئەمانە نیشانەکانی خۆشەویستی الله تعالى بون توانیمان ١٣ نیشانە باس بکەین ئەوەی هەمووی کۆبکاتەوە بەیەکەوە ئەوە بەراستی خۆشەویستی الله تعالى کردوە داوا ئەکەم ئیٚمەش و ئیٚوەش لەموسلمانان ئا لەوانەدا بین بەراستیەکەی من یەکەمجار خەمی خۆمە ئینجا خەمی ئیٚوەمە ئەبیٚ هەموو کەسیٚك وابیٚ یەکەمجار خەمی خۆیی بیٚ ئەم شتانەی کەوا باسمان کرد تەنها بۆ پاراستنی گۆرەکەمان و قیامەتەکەماندایە چونکە دونیا ئەروات چەندین سال بژی هەر دەبیٚت بەجیٚ بهیٚلیت چەندەها مالت هەبیٚ ئەبیٚ بەجیٚ بهیٚلیت چەندەها کەرامەت و ناوبانگت لەدونیا دا هەبیٚ ئەبیٚ بەجیٚ بهیٚلی جا بەحەق هەتبیٚ یاخود بەناحەق لە هەمووشی پرسیارت لیٚ دەکریٚتەوە ئینجا بۆ ئەم رۆژە هەولبدەن کۆتایەکەشمان بەم حەدیسە دەهیٚنم :

پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جاریٚك لەدوورەوە بینی کۆمەلیٚك صەحابە لەدەوری گۆریٚکدا راوەستاوون بە خیٚرایی چوە لای گۆرەکە دەستی کرد بەگریان ئەوەندە گریا ئەلیٚ ئاو دلۆپ دلۆپ لەچاوی ئەکەوتە سەر زەویەکە دواتر فەرمووی (يا إخواني لمثل هذا فأعدوا)[١٣٨] براکانم بۆ ئەم رۆژە خۆتان ئامادە بکەن ، دەبیر بکەوە کە چویتە ئەوێی کیٚ لەگەلت دیٚت لەگەلت دەبیٚت کیٚ یامەرتیت ئەدات و کیٚ وەلامت بۆ ئەداتەوە ! إسقات صەلات والله بەتالە هەی بەزەهرە ماری بیٚ ئەو مەلایەی إسقات سەلات دەخوا ئاخر

[١٣٨]: رواه ابن ماجه

چۆن الله تعالى دەفەرمووى (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي)[139] ئەلىٚ يا الله من ئەوەم لابرد بەپارە لاى دەبەم لەسەرى ! کەس بەفریات ناکەوێت  ئەبێ نوێژەکەی خۆت بکەیت عیبادەتەکەی خۆت بکە بیر لەوە مەکەوە کەوا کەسێك لەداهاتوودا فلان ئەوەم بۆ دەکات و ئەوەم بۆ دەکا جارى خۆت بۆخۆت هەولبدە ئینجا ئەگەر شتێکیان بۆکردی لەداویدا بە شەرعی ئەوە خوا لێیان قبول بکات و خوا خێریان بنوسی لەدوعا و صەدەقات و لەحەج بەس لەوشتانەی کەوا ناچێت بیشی کەن هیچ سودی نیە .

## هۆکارەکانی خۆش ویستنی الله تعالى بۆ دلەکان .

ئەو هۆکارانەی کەوا دەبێتە هۆکاری ئەوەی کەوا خۆشەویستنی الله بۆ دلەکان بێت وە ئەو هۆکارانە چین تاوەکو ئینسان لەخۆیدا فەراهەمی بکات و وای لیٚ بکا کەوا الله تبارك وتعالى خۆش بویێ چەند خالێك باس دەکەین کە دێنە پێشمان ان شاء الله .

**یەکەم :**

یەکێك لەوانە (قراءةُ القرآن بالتدبر والتفهّم لمعانيه وما أُريدَ به)واتا خویندنەوەی قورئان بەتیارامان بەورد بوونەوە و بەلێك تێگەیشتن نەك هەر بە بەس بخوێنینەوە و نەزانین ماناکەی چیە لەو سەرەوە بۆ ئەو سەر لیٚ تیٚ نەگەین کاتێك خەتمێك ئەکەین نەزانین چیمان خوێندوە وە نەزانین ئایەتەکان باس لەچی دەکەن . نابیٚ بەم شێوەیە چونکە ئێستا هەندێك لەئایەتەکانی قورئان باس دەکەین کەوا داوای ئەوەمان لیٚ دەکا  کە دەبێت لە ئایەتەکان رابمێنین و پێمان دەلیٚ لەئایەتەکان رابمێنین سەیری بکەین و وردد ببینەوە. هەمووتان لاتان زانراوە ئەگەر کەسێك نامەیەك بۆ کەسێك بنێری تەنها ناخوێنیتەوە بلیٚ تەواو خوێندمەوە بەلکو دەلێت بزانم چی تێدایە ئەم نامەیە بزانم چی داوا کردوە ئەم کەسە هەتا ئەگەر خۆشی خوێندەوار نەبیٚ بە خوێندەوارێك ئەلیٚ ئادەی کاکە بخوێنەرەوەبزانم چی دەلیٚ ئەم نامەیە ئەلی بابزانم

[139]:سورة طه اية : ١٤

چی دەلیّ یانی ئەوەندە کافی نیە بەس گوێی لێبی و بەلای گوێدا بروا و تەواو بلیّ نامەکە بخەرە ئەولاوە و گوێمان لیّ گرت فرێی دەو و تەواو نەخێر بەلکو دەیەوێت بزانیّ چیّ دەلیّ .

(والتفهّم لمعانيه وما أُريدَ به)فەهمی ماناکانی بکەی و تێبگەیت واتاکانی لێك بدەیتەوە ، تۆ بزانە الله تعالی چی لیّ داوا کردووی ،

باسی ئەوەمان کرد کەوا کاتێك پێغەمبەران هاتوون چۆن دەرهەقیان قسەی کردوە و چۆن خەلکەکە دووژمنایەتیان کردوە با بزانین قورئانیش چۆن دژایەتی کراوە لەکاتی خۆیی هاتوەکو ئێستا وەهەتا رۆژی قیامەتیش .

الله تعالی لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووی : موشریکەکان دەیان وت(لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ)[140] گوێی مەگرن لەم قورئانە هەر لەگەل باسکرا و قورئان لێدرا ئێوە بیکەن بەلەغوە و گارە گار و غەلبە غەلب و هاوار هاوار و چەپلە لێدان و ئەو بابەتانە .

ئینجا ئەمە هەر ئێستا نیە بەلکو ئەمە لەقوریشەوە هاتووە تاوەکو ئێستا هەر تۆ قورئان باس بکەی ئەلیّ کاکە لایبە !

بزانە چەندەها هۆکار هاتووە بۆ چی ! الله تعالی هۆکارێکی ناردوە کە قورئانە بۆ ئەویە دلەکەت پیّ ئۆقەربگری و خۆش بیّ ، کەچی موشریك و کافرە و دووژمنانی قورئان چەندەها هۆکار ئەهێنن بۆ ئەوەی لەقورئانەکە دوور بکەویتەوە و دلت خۆشەویستی شەیطانی بیچێت.

کەواتە دوو خۆشەویستیمان هەیە (محبة الله ومحبة الشيطان)ئەوانەی مەحبەتی الله لەدلیاندا هەیە حەز لە قسەکەی الله تعالی دەکەن وە ئەلێن ئەوانەی کەوا هۆکارن بۆ خۆشەویستی شەیطان دووری خەنەوە ، ئەوەتا ئێمە هەر پێتان ئەلێن خۆتان لەوشتانە دوورخەنەوە بەئاشکرا ئەلێن خۆتان لەقسەی هیچ و پوچ دوورخەنەوە لە گۆرانی وموسیقا و گارە گار و هەرا و هۆریا و وە لە لەغوە الله تعالی دەفەرمووی (وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ)[141] إعرا ض بکەن و پشت بکەنە لەغوو[142] ، ئێوە سەیر بکەن ئەو قسەی کە ئێوە ئەیکەن یان ئەو کارەی ئێوە ئەیکەن ئەچێتە دووخانەوە :

یان ئەچێتە دەرەجاتی رۆژی قیامەت بۆ بەهەشت و لەمیزانی حەسەناتت ئەنوسرێی ،یان دەروات بۆ دەرەکاتی جەهەنەم الله تعالی پەنامان بدا .

[140] :سورة فصلت اية : ٢٦
[141] :سورة المؤمنون اية : ٣
[142] : واتا قسەیەك كە هیچ سودی نیە

تخوا هیچ کاتێك بیستوتانه لەقورئان لەحەدیسدا قەشمەریات و گالەگال و موسیقا و گۆرانی به عیبادەت نوسرابیّ پیّ بەرزبیتەوە بۆلای الله تعالی هیچ کاتێك شتی واتان بیستووە ! ئیتر مەلای لابەلا بۆ لیّمان تیّك ئەدا ئەوە حەلالە و ئەوە حەلالە گۆرانی ئیسلامی و مۆسیقای ئیسلامی (لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ)[١٤٣] ئەو لەغوە ئەوەیە .هەتا گۆرانی و مۆسیقا و رەشبەلك و هەلپەرکیّ و بەزم و رەزم هەبیّ قورئان لەکویّی ئەکریّتەوە ئاخر ، معقولە کەسەکە هەلسیّ رەشبەلك بگریّی وقورئانەکە بەدەستیەوە بیّ بخویّنیّتەوە نەخیّر شتی وا نیه کەوتت گۆرانی و مۆسیقا و رەشبەلك واتا الله و پیّغەمبەر فریّیدە ، کەس لەکاتی رەشبەلك و دەست لەناو دەستی ئافرەتدا الله لەبیرە ! شتی وا هەیە ! باشە ئەم کارە بۆ کویّی دەچیّ بۆکویّت کۆکردەوە بۆ جەهەنەمەکەت ئیتر پیّویست ناکا هەزار مەلای لابەلا لەولاوە بیّ سەرچۆپیەکەم بۆ بگریّی نەتان بیینوە والله مەلام بەجوبەوە بینیوە سەرچۆپی لەگەل پانتۆل لەپیّی ئافرەتان گرتوە بەئاشکراش ئەوە بەلایە مەلا نیە .

جا لەکۆنەوە تاوەکو رۆژی قیامەتیش بەریّزەکانم سەیربکەن (لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ)ئەوەی کەوای پیّی وتی بزانە ئەوە کیّ یە ئەوە دووژمنی الله یە دووژمنی رۆژی قیامەت و دووژمنی گۆرەکەتە .

الله تعالی دەفەرمووی : (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)[١٤٤] سەیری ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەن الله تعالی دەفەرمووی : بۆ ئەم قورئانە لیّك نادەنەوە بۆ ماناکەی لیّك نادەنەوە و بۆ لیّ رانامیّنن ! ؟ بۆ ناچن بزانن ماناکانی چیە بۆمن ناردومەتە خوارەوە بۆ ئیّوە لیّ ورد نابنەوە (أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)یان دلەکانتان قفلی لیّدراوە ، سەیری قفلی دل بکەن زانایان دەفەرموون (رحمەتی الله یان لیّ بیّ ):دل وەك درەگا وایە بۆ تیّگەیشتنی ئەم ئینسانە ، زۆر جار ئەوتریّی کاکە دەرگای دلتم بۆ بکەرەوە با من قسەت بۆ بکەم ،واتا بیّ خەبەر مەبە لیّم واتا کەر مەبە لەئاستم .

دەرگای دل ،دل دەرگایی هەیە ئەو دەرگایەش قفلی لیّدراوە پەنا ئەگرین بەالله (أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)أقفالها جەمعی قفلە ، الله تعالی دەفەرمووی : ئەم قورئانە بۆ ئەوە نیّردراوە تۆ سەیری بکەیت و لیّ تیّبگەیت و لیّی تەدبور بکەی بەلاّم ئەوانە دلیان قفلی لیّدراوە لەکویّی تیّدەگەن ، هەتاوەکو ئیّوارە قسەیان بۆ بکەی سودی نیە .

دلی کراوە ئەو دلەیە معدل خۆشحالە بەبیستنی قسەی الله دەلیّت دەی زیدنی دەی کاکە زیاترم بەدەریّی حەز دەکەم زیاتر تیّبگەم حەزدەکەم زیاتر خۆشەویستی الله بچیّتە دلمەوە ، بەلام ئەمرۆ قسەی لەگەل دا دەکەی ئەلیّ بەسە بەسە هەر تۆ موسلمانی ئیّمەش موسلمانین ! ئیّ کاکە الحمدلله کە موسلمانی بەس

[١٤٣] :سورة فصلت اية : ٢٦
[١٤٤] :سورة محمد اية : ٢٤

والله ئەوە دەلالەتی ئیسلامەتی تۆ نیە ئیسلام واتا تەسلیم بوون نەك واتای ئاشتی و بەكەیفی خۆمان لەگەل ئەبو جەهلدا نان و كەباب بخۆین ،! ئیسلام واتا تەسلیم ،
تەسلیم واتا : نمومە كەسێك خۆی تەسلیمی كەسێك دەكا ئەوە ئاشتەواییە !یان ئەوەیە من هیچ قوەت و قودرەتم نەما چیم لێ دەكەی لێم بكە كەواتە تۆ تەسلیم بەالله بووی یا الله تۆ چی دەلێ بەسەر چاو ئەوە تەسلیم بوونە ئەوە ناوی دینەكەتە كە ئیسلامە .
(الاستسلام لله بالتوحيد والانقياد بالطاعة والبراءة من الشرك وأهله)ئەوە پێناسەی دینەكەتە بزانە دینەكەت ناوی ئیسلامە یانی من تەسلیم بەالله بوم تەنها الله خوای منە وە من بەقسەی ئەكەم وە من پشت ئەكەمە هەموو موشریك و كافرێك وە رقیشم لێیان دەبێت ،
باشە ئەگەر الله رقی لەكافربێ تۆ ئەبێت دۆستی كافر بی ئەها الله تعالی دەفەرمووی : (فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ)[١٤٥] هەرچی كافر هەیە الله تعالی دووژمنیەتی معقولە من و تۆ دۆستی بین ،باشە ئەگەر تۆ ئێستاهاوریەكت هەبێ دۆستایەتی دووژمنەكەت بكا تخوا پێت خۆشە ! تۆ سەلامی لێ دەكەیت كێ پێ خۆشە هاورێكەی سەلام بكا لەدووژمنەكەی ! ئێ الله تعالی كافری بەدژوومنی خۆیی داناوە (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)[١٤٦]ئەگەر تۆ بەرە و قورئان رۆیشتی وە تێگەیشتیی و فەهمت كرد وە ئیشت پێی كرد ئەوكاتە نزیك ئەبیتەوە لەالله تعالی الله تعالی تۆیی خۆش دەوێی.

دووژمنانی ئەم دینە بەتایبەتی لەم عەصرە تازەیەدا ئەزانن ناتوانن ئەم قورئانە لەمزگەوتەكان ببەنە دەرەوە وە ئەزانن ناتوانن ئەم قورئانە لەدەستی تۆ بسێنن ، والله ئێستا تەحدا دەكەم ئەگەر قوتێك هەبێ بلێ هەرچی قورئان هەیە بیسوتێنن دونیا هەلدەستێ وە لەو كاریشی پێ ناكەین بەس غیرەتێكت بۆی ئەجولێ ئەو كافرە نایەت قورئانەكەت لێ بەسێنی ئەلێ بیخوێنەرەوە بەس تێ مەگە یانی ئێستا ئەو قورئانەمان لەناودایە بەلایەوە كێشە نیە دووژمنانی دین لەبەر ئەوەی ئێمە ئیشی پێ ناكەین بەس ئیشی پێ بكە دووژمنیەتی تەواو وەرە ئیشی پێ بكە لەدائیرەیەكدا دەست پاك و چاو پاك بە ئەلێن ئەوە بەكەلك نایەت ئەبێت گەندەل بیت ئەبێت پارە بدزیت ئەبیت بیخۆیت ئینجا پیاو چاكیت هەرپیاو چاكێكت بینی ئەوە دەر ئەكرێی وەكو پێغەمبەر لوط ئەیوت :خەلكە هەمووی لیواطی ئەكرد ئەویش لیواطی نەئەكرد كەچی ئەیانوت دەری كەن ئەوە خۆیی بە پاك دا ئەنێ ئەوە خۆیی پاك ئەكاتەوە ئێستاش بەم شێوەیە گالتەمان پێ دەكەن . جا دووژمنانی دین نایەن قورئانەكە لەمزگەوتەكان و چاپخانەكان چاپ

[١٤٥] :سورة البقرة اية : ٩٨
[١٤٦] :سورة محمد اية : ٢٤

نەكرێی ورێگری لیٚ بكەن جارێك ئەمە روویدا لە شۆرشی شوعی لە روسیا ١٩١٧كە شوعیەت هاتە ناو ئیتحادی سۆڤیەتی ئەوەی یەك قورئانی بەدەست بگیرابا یەك سال حوكم ئەدرا بەسجن بەلام ئەوان رۆیشتن و قورئانیش هەر مایەوە بۆیە تێگەیشتوون كە قورئان ناروا چونكە الله تعالی فەرموویەتی من دەیپارێزم ،

ئەی قوربەسەر ئەو كەسەی شەر لەگەل الله دا دەكا الله تعالی وەعدی داوە ئەم قورئانە بپارێزی بەس وەعدی نەداوە ئێمە هەرهەموومان دلەكەمان بچێتە سەر قورئانەكە ئەو وەعدەی نەداوە ئەلیٚ بۆخۆت برۆ سەر قورئانەكە (أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)ئەلیٚ دلت قفلی لێدراوە دەرگایی دلت بۆ ناكەیتەوە بۆ ئەم قورئانە .

الله تعالی دەفەرمووی : (كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ)[١٤٧] یانی ئەم قورئانە كیتابێكە (أَنزَلْنَاهُ)واتا قسەی ئینسان نیە یانی ناردمانە خوارەوە هی الله یە بەجوبرائیل ناردویەتەخوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)وە ئەمە قەولی الله یە (مُبَارَكٌ)هەمووی بەرەكەتە و پرە لەبەرەكەت وە هەموو قورئان بەرەكەتە ،بەرەكەت یانی زیادەی خێر هەر كەسێك شوێنی بكەوێت الله تعالی خێری بۆزیاد دەكا لەدونیا و لەقیامەت (لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ)بۆ ئەوەی لەئایەتەكانی رابمێنی و تێبگەیت و ورد بننەوە ، چەندم پیٚ خۆشە ئەوها دابنیشن بلێن ئەو ئایەتە واتای چی دەی كاكە با تەفسیری ئەم ئایەتە بكەین ،

وەكو تێبنیەك سەیری بكەن : مەداریسی دینی لە دیرزەمان لەكوردستان هەتاوكو ئێستا ئەگەر ئێوە سەرنجی بدەن لەلای فەقێیان ئیهتمام نیە بەتەفیسیری قورئان وە ئیهتمام نیە بە حەدیسی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)كیٚ فەقیٚ یەتی كردوە پێم بلیٚ كیٚ لەحوجرەكاندا تەفیسیری قورئان یاخود شەرحی بوخاری و موسلیم كرا بیٚ !ئەوەندەم پیٚ بلێن بەحوجەی ئەوەی ئەلێن قورئان و حەدیس نابیٚ دەستكاری بكەی وازی لیٚ بێنە ئەوە هی ئێمە نیە بەس بۆ بەركەت بیخوێنەرەوە یانی داخوازی زانستی شەرعی بی بلیٚ نابیٚ دیراسەی بكەی كەچی الله تعالی لێرەدا داوای دیراسەكەمان لیٚ دەكا ئاگاتان لەوەیە بۆیە ئێمە هیچمان نابیٚ بەهیچ سالەهای سالە ئێمە مەدرایس و حوجرەمان برۆن بپرسن لێیان بلێن چەند تەفسیر خوێنراوە وە چەند شەرحی بوخاری و موسلیم وئەوانیتر خوێنراوە لە ناو حوجرەكاندا نیمان بیلیٚ خوێندوومانە .ئەلێن دوانزە عیلم ئەزانن دوانزە عیلم یانی چی یانی عیلمی (تەفسیر و حەدیس )ی تێدا نیە بەلكو (نەحوە و صەرفە و بەلاغەیە بەهەرسیٚ عیلمەكەیەوە ،،،،اه)هەمووی كۆبكەرەوە پیٚ دەوترێی علومی ئالە .

[١٤٧]:سورة ص اية : ٢٩

علیم دەبێت بە دووبەشەوە :

عیلمێك عیلمی غایەیە ، عیلمێك عیلمی ئالەیە :واتا هۆكار .

عیلمی غایە :بریتیە لەقورئان و حەدیس وعقیدە و فقهە ئەمە عیلمە ئەساسیەكانن ئەبێت ئەمە بخوێنرێی . بەلام ئەم علیمانەیتر ئەخوێنرێی بۆ خزمەتی ئەم عیلمانەیە تۆ نەحو و صەرف ئەخوێنی لەبەر ئەوە ئەیخوێنی تاوەكو لەقورئان هەلە نەكەی بەمانای ئەوەی لەقسە كردن هەلە نەكەی كاتێك دەیخوێنیتەوە خۆتۆ لە سەرەتاوە تاوەكو رۆحت دەردەچیٚ نەحو وصەرف بخوێنی چوار ئایەتی قورئان نەخوێنی لەقورئان ناگەیت وەكو وایە عەرەبێكی زۆر زۆر لێزان وەك ئەبو جەهل كە قورئانی نەخوێند چ سودێكی لیٚ كرد ! وە ئەوانەی شارەزان باسی بەوەیسی یەكێكە لەعالمەكانی عەرەبی باهەر یەكێكی تر بیٚ كەتۆ رووت نەكردە قورئان چ سودێك لەم قورئانە ئەكەیی كەواتە زانینی عەرەبی هۆكارە بۆ تێگەیشتن لەقورئان هۆكارە غایە نیە ئەو ئەچیٚ شەو و رۆژ ئەخاتە سەر یەك و عەرەبی فێر دەبێت نایەت ئایەتێك و حەدیسێك بخوێنێتەوە و بزانێت ماناكەی چیە و عەمەلی پی بكا . ئیستا لەكولیەكاندا مامۆستایە لەعەرەبیدا هەتا بلیت بلیمەتە بەلام نوێژێك ناكات ئەو وئەبو جهل چ سودیان لیٚ بینی چ جیاوازێكیان هەیە مامۆستا ودكتۆرە لەجامیعەدا عەرەبیەكەی زۆر بەقوەتە بەس نایەت ئایەتێك و حەدیسێكی پیٚ بخوێنێتەوە ئیٚ من ئەو عەرەبیەم بۆ چیە ئەوە هەر نەمویست .

كەواتە لەناو مەداریسەكان عیلمی غایە ناخوێنرێی بەتایبەتی قورئان و حەدیس بەحوجەی ئەوەی بۆمان نیە دەستكاری بكەین ئەی خوای گەورە بۆچی ناردۆتە خوارەوە.

پاشان دەفەرمووی : (وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ)بۆئەوەی پەند و ئامۆژگاری لیٚ وەرگرێی ئەوكەسەی خاوەنی عەقلە یانی ئەو كەسەی پەند و ئامۆژگاری لیٚ وەرنەگرت بیٚ عەقلە با بەخۆشی بلێت بلیمەت وزیرەك هیچ سودی نیە .

وەكو وتمان جیاوازی لەنێوان عاقل و زیرەك ئەوەیە :

زیرەك ئەوەیە شت ئەزانی لەدونیا (يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ)[١٤٨]لەدونیا فولە و چاكیش ئەزانیٚ لەهەموو شتەكان لەتەكنەلۆجیا ئەلێت و لەصناعات ئەلیٚ لەزراعات ئەلیٚ لەتیجارات ئەلیٚ بەس لەدینەكەی سفرە ئەو كەسە عاقل نیە ئەگەر عاقل بوایە بەعەقلەكەی خۆیی خۆی ئەبەستەوە بەقورئان و بەسونەتەوە ئەرۆیشت بۆ قیامەتەكەی .

[١٤٨] :سورة الروم اية : ٧

(هذا هو المقصود الاعظم والمطلوب الأهم )ئەمە گەورەترین مەبەستە تێگەیشتن لەقورئان وە کارکردن بەقورئان (وذلك بأن يشغل قلبه بالتفكير في معنى ما يقرأ)دلی خۆت مەشغول بکە بەوەی بەو مانایەی کە دەیخوێنیت هەتا ئێستا باس دەکەین ئەلێ : کەسێك ئەگەر خەتمی قورئان بکا لەم سەر تا ئەو سەر بەس تێ رانەمێنی مانای لێ ورد نەبێتەوە یەکێکیش یەك ئایەت بخوێنێتەوە بەبەردەوام بەس بزانی مانای چیە ئەم باشترە لەو لەو روانگەیەوە ماناکەی بزانە .(ويتجاوب مع كل اية بمشاعره وعواطفه دعاء واستعفارا ، ورحمة وعذابا)لەگەل هەموو ئایەتێکدا وەلام باتەوە ئینجسامی هەبێت و وە تێکەل ببێ لەگەل ئایەتەکاندا بەمەشاعیرو بە عواطفی خۆی ئەگەر ئایەتی دوعا هات دوعا بکە نمونە سورەتی فاتیحە ئەخوێنی کە ئەلێ (*اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ*)[149] لەسەری رابوەستە ئەزانی چەند گەورەیە ئەم دوعایە خوایە رێنوماییم بکە بۆ رێگە راستەکەی خۆت لەرێچکە هیچ و پوچەکانم دوورخەرەوە خوایە ئینجا دلی بەرێی ئینجا لەرۆژگاری خۆشدا جێ بەجێ بکە بەس کاتێك تۆ دەلێ خوایە رێنماییم بکە بۆ رێگەی پێغەمبەر محمد (صلی الله علیه وسلم)کاتێك لەنوێژەکە بوویتەوە چویتە سەر رێنمایی ئەبو جەهل چ سودێکت لێ کرد تۆ یانی تۆ بەس بەزمان وتت بەدل و بەعەمەل وات نەوت وەدلت داخراوە ئەوەلەزمانەوە نەچوە ناو دلەوە بەس لەزمان هاتە دەرەوە تەنها لەناو دەمدایە ئایەتەکە الله تعالی ئەمەی ناوێ .

یاخود بەلای ئیستغفاردا ئەروا (*رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا* )[150] یەکسەر داوا بکە الله تعالی دەفەرموویێ : (**إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ (١) وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا (٢) فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ ۚ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا (٣)**)[151]ئایەتەکە پێت دەلێ فسبح یانی سبحان الله بکا (**وَاسْتَغْفِرْهُ**)داوای لێخۆشبوون بکە کەچی تۆ نە سبحان الله ئەکەیت وە نەداوای لێخۆشبوون ئەکەیت ! ئەدەب وایە لەم کاتەدا بلێت (سبحانك اللهمّ وبحمدك، اللهمّ اغفر لي)بیلێوە وابزانە لەم رۆژەدا لەبەردەمی الله تعالی دای لەرۆژی محاسەبەدایی ئەتخاتە جەهەنەم و لەوێدا شین ورۆرۆ دەکەی ئەلێ یا الله مەخەرەناو جەهەنەمەوە یا الله بمخەرە ناو بەهەشتەکەی خۆتەوە دەست پێ بکە ئاوا تجاوب بکە لەگەل ئایەتەکەی الله دا .

بۆیە دایکمان عائیشە (رەزای الله لێ بێ ) دەیفەرموو : کاتێك ئەم سورەتەی بۆ هاتە خوارەوە (كان يتأول القران)لەناو رکوع و سوجدەکاندا ئەوەی ئەوت لەجیاتی سبحان ربی الاعظيم و الأعلى ئەمەی ئەخوێند (سبحانك اللهمّ وبحمدك، اللهمّ اغفر لي)پاکی بۆتۆ یا لله لەشەریك لەعەیب یاالله سوپاست ئەکەم یا الله لێم خۆش بە ، ئەوە پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم) ئەی ئەبێت ئێمە چی بکەین .

[149] :سورة الفاتحة اية : ٦
[150] :سورة الحشر اية : ١٠
[151] :سورة النصر اية :١-٣

(ورحمة وعذابا)کاتێکیش کە ئایەتی رەحمەت دێی داوای رەحمەتەکەی بکە کەبەهەشتەکەیەتی وە کە بینینی الله تعالی یە کاتێك ئایەتی عەزاب دێت دەست بکە بەگریان فرمێسك بباریێنە بەلای ئایەتی جەهەنەمدا ئەرۆیی گیانت با موچرکەی پیادا بیێ ئاوا لەگەل قورئاندا ببە .

لە حوذیفەوە حەدیسێك ئەگێرینەوە (عن حذیفة– رضی الله تعالی عنه– قال: «صلیت مع النبی صلّی الله علیه وسلم ذات لیلة )شەوێك لەگەل پێغەمبەربوو ئەم صەحابە بەرێزە (صلی الله علیه وسلم ) شەو نوێژیان ئەکرد بەتەنها بوون لەگەل پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەبعەن شەو نوێژ کردن لەرەمەزانانددا سونەتە بەجەماعەت بیکەن لەغەیری رەمەزان هەرکەس بۆخۆیی بێت جارو بارێکیش ئەتوانرێی دوو کەسێك بەجەماعەتێك بیکا لەگەل خێزندا یاخود لەگەل هاورێکەت دا ئەوەتا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)لەگەل حوذیفەدا بەجەماعەت شەونوێژ ئەکا جا بزانین ئەم شەو نوێژەی چۆن بووە ئەلیّ(فافتتح البقرة فقرأها )پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دەستی کردبە شەو نوێژ کردن ئەویش لەتەنیشتەوەیەتی تەبعەن ئەگەر دوو کەس بوون لەلای راسیتەوە رادەوەستیّ بەبیّ تەئخیر و تەقدیم بوون بە سیّ دووانەکە بچێتە دواوە ئیمامەکە لەپێشەوە بیّ لەتەنیشتیەوە بووە ئەم صەحابەیە ئەلیّ بەقەری دەست پیّ کرد و خوێندی (فقلت: یرکع عند المئة)یانی ئەم صەحابەیە خۆیی ئامادە کردوە ١٠٠ ئایەتی سورەتی البقرە بخوێنی ماشاء الله کێمان ئێستا ئامادەی تێدایە بلیّ با ئیمامەکە ١٠٠ ئایەت بخوێنی لەیەك رکاعەتدا ئەلیّ وتم لە ١٠٠ ئایەتی یەکەمدا ئەچیت بۆ رکوع (ثم مضی) ئەلیّ رۆیی بەردەوام بوو (فقلت: یصلي بها في رکعة)وتم نەخێر لەوانەیە بەقەرەکە هەمووی تەواو بکا لە رەکاعەتەکەدا یانی خۆیی ئامادە کردوە درێژترین سورەت لەناو ئەم نوێژەدا تەواو بکا کەسورەتی بەقەرەیە ٢٨٦ئایەتە ئەلیّ وتم تەواو ئەکا ئینجا ئەچێت بۆ روکوع (فمضی)وتم ئەوە بەقەرەشی تەواو کرد ئێستا روکوع دەبا (ثم افتتح النساء فقرأها)جا لێرەدا فقهێك هەیە ئاگاداربن بەقەرە بچیّ بۆ نیساء واتا سورەتی ال عمرانی پاز دا ئەمەدەلیل لەسەر ئەوەی ئەگەر بە تەرتیبی مصحفیش نەخوێنی ئەبیّ ئەلیّ نیسائیشی هەموو تەواو کرد (ثم افتتح آل عمران فقرأها)دوای ئەگەرایەوە بۆ ال عمران ئەویشی تەواو کرد ، کیّ هەیە بتوانیّ ئێستا لەئێمە لەو مەجلیسەدا لەمنەوە هەتا ئێوە لەهەموو مەجلیسەکاندا سیّ سورەت لەیەك روکاعەتدا بخوێنی ئەوە پێغەمبەری خۆشەویست بوو (صلی الله علیه وسلم)بەلام چۆن خوێندنەوەیەك سەریع و لەدوایەك و نا بەلکو ئەلیّ (یقرأ مترسلا)هێواش هێواش ، تۆ وەرە هێواش هێواش ئەم سیّ سورەتە لەقورئاندا بخوێنە هەرئەوەندەش نا بەلکو (إذا مر بآیة فیها تسبیح سبح)هەر ئایەتێك سبحان الله تێدابوویّ سبحان الله ئەکرد (وإذا مر بسؤال سأل)ئەگەر داوای تێدا بووایە یەکسەر داوای ئەکرد یانی قیرائەتەکەی رائەگرت و داوای

دەکرد لە اللە تعالی (وإذا مر بتعوذ تعوذ)ئەگەر پەنا گرتنی تێدا بووایە پەنای ئەگرت بە اللە تعالی ،ئەوە چەندێك ئەخایەنێت بەم شێوازە .[١٥٢] ئەمە خوێندنەوەی پێغەمبەر بوو (صلی اللە علیە وسلم) تجاوب لەگەل نوێژەکەشدا فقهێکی ترتێدایە لەنوێژی سونەت ئەتوانی کاتێك کە ئیمامەکە ئەخوێنی یاخود خۆت ئەخوێنی ئەو ئایەتانە هات یەکەسەر داوای لیخۆشبوون لە اللە تعالی بکەی یانی تۆ بۆخۆت بەدەم بیلێتەوە بلێ یا اللە لێم خۆشبە ئەگەر عەرەبی ئەزانی بەعەرەبی بیلێ هەتا بەشێك لەزانایان ئەلێن ئەگەر عەرەبی نازانی مادەم هەر نازانی و فێر نابێ ئەتوانی بەکوردیش بیلێ .

إبن عەباس (رەزای اللە تعالی لێ بێ )دەلێ : ئەگەر پێغەمبەری اللە (صلی اللە علیە وسلم)سورەتی (سبح باسم ربك الاعلی)بخوێندبایە (أن ابن عباس ، كان إذا قرأ ( سبح اسم ربك الأعلى ) يقول : سبحان ربي الأعلى)هەر کاتێك ئەم سورەتی بخوێندبایە لەسەرەتاکەیدا چونکە ئەمری پێ دەکا تۆ سبحان اللە بکە ناوی پەروەردگاری خۆت بەگەورە رابگرە وبەپاکی رابگرە بەبێ شەریك ئەیفەرموو(سبحان ربي الأعلى)ئینجا ئەچوە سەر باقی قیرائەتەکەی بۆیە سونەتە لەنوێژدا بووی لەفەرزدا بووی یان سونەت ئەو سورەتەت خوێند (سبح باسم ربك الاعلی)بەتایبەتی لەجومعەکاندا بلێن (سبحان ربي الأعلى)یان لەجەژنەکاندا چونکە بەبەردەوام پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) ئەم سورەتانەی ئەخوێند .

هەندێك کەس دەیانوت باشە بۆ لەجومعەعەدا هەر ئەم سورەتانە ئەخوێنی ئاخر پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) وای کردوە خۆ ئێمە لە پێغەمبەر زیرەکتر نین وە شارەزاتر و بەتەقوا تر نین ،

إبن القيم دەفەرمووی :(فلا شيء أنفع للقلب من قراءة القرآن بالتدبر والتفكر)هیچ شتێك بۆ دل ئەوەندە بەسود نیە وەکو قورئان خوێندن بەلام لە لێوردبوونەوە کەلامی اللە کەتە وەکەلامەکەی بریتیە لەپەیوەندی نێوان ئەو و ئێمە (فإنه جامع لجميع منازل السائرين وأحوال العاملين ومقامات العارفين)بەراستی هەموو شتێك کۆدەکاتەوە قورئان رێگەکان بۆ بەهەشتەکەی اللە تعالی وە بۆ گەیشتن بە اللە تعالی (وهو الذي يورث المحبة والشوق والخوف والرجاء)ئەم قورئانەیە ئەبێتە هۆی دروست بوونی خۆشەویستی اللە و ترس لێبوونی و روجا بوون بە اللە (والإنابة والتوكل والرضا والتفويض والشكر والصبر، وسائر الأحوال التي بها حياة القلب وكماله)هەموو ئەعمالەکانی دل بەوەوە پابەندە بەم قورئانەوە پاشان تۆ قورئان بخوێنەوە وادەکا (يزجر عن جميع الصفات والأفعال المذمومة التي بها فساد القلب وهلاكه.)[١٥٣] ئەم قورئانە بخوێنیتەوە ئینجا ئەزانی اللە تعالی رقی لەچیە و تۆ دوور ئەکەویتەوە لەوشتانە

[١٥٢]: رواه مسلم
[١٥٣]: الموسوعة العقدية ـ الدرر السنية:جزء٦لا٥٧

وەچی پێ خۆشە نزیکی ئەکەویتەوە وەچی پێ ناخۆشە لێ دوور ئەکەویتەوە ،چونکە تاوەکو قورئان نەخوێنیتەوە نازانی .

هەر إبن القیم دەفەرمووی : (فلو علم الناس ما في قراءة القرآن بالتدبر لاشتغلوا بها عن کل ما سواها)ئەگەر بەس خەلك بیزانیایە بەورد بوونەوە و تێرامان لەقورئان چەند تۆ ئیستفادەی لێ دەکەی لەلایەنی دلەوە وازت لەهەموو شتێکیتر دەهێنالەقورئان خەریکی هیچیتر نەدەبووی (فإذا قرأه یتفکر حتی مر بآیة وهو محتاج إلیها في شفاء قلبه کررها ولو مائة مرة، ولو لیلة)ئایەتێك ئەخوێنیتەوە لەوکاتەدا تۆ هەست دەکەی پێویستیت بەم ئایەتە و بەومانایە هەیە ، ئازیزانم ئەمرۆکە خەلك زۆر پێویستی بە لایەنە رۆحیەکە هەیە ئەمرۆ خەلك لەمادەدا ئەژیت هەموو دونیای مادە و خواردنە وەرس بووە یانی ئەهلی ئیمان زۆربەیان وەرس بوون لەدوای بیستنی دوو نەصیحتە و دوو ئایەتە بەس کاتێك پێیان ئەلێن بەساغ و سەلامەتی پێیان بلێن رێگە راستەکەیان نیشان بدەن بۆیان خوار نەکەنەوە خەلك ئەمرۆ پێویستی بەمەیە تاوەکو دلەکەی ئیسراحەت بکا ، کەی دل ئەمرۆ ئیسراحەتە ! ئەوانەی پارە و مال و دونیایان هەیە دلیان ئیسراحەتە !؟ بەخوا ئیسراحەت نیە ، برادەرێك زۆر دەولەمەند بوو ئەیوت والله ئیسراحەتم نیە بەشەو و بەرۆژ بەشەو ئەبێ حەراسەتی مالەکەم بکەم بەرۆژیش بزانم چۆنی پەیا ئەکەم هەر لەوە ئەسورێمەوە بەبەردەوام هەر لەخەم و پەژارەدام ئەلێم خوایە پارەکەم و سەیارەکەم و مالەکەم خوایە کەم نەکا و خوایە چۆن زیاد ئەکا یانی بابەتەکەی هەر دونیایە دلی ئیسراحەتی نیە .

سەیری ئەم حەدیسە بکەن ئەلێ ئەبو ذەر (رەزای الله لێ بێت)فەرمووی : پێغەمبەری الله شەوێکیان (صلی الله علیه وسلم)هەتاوەکو بەیانی یەك ئایەتی خوێندەوە لەنوێژکەیدا هەر رکوع وسجودی ئەبرد هەر نوێژی ئەکرد و هەرفاتیحە و ئەم ئایەتەی ئەخوێند (إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)[١٥٤] ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە واتا : خوایە ئەگەر عەزابیان بەدەی ئەوانە بەندە و عەبدی خۆتن ، ئەگەر لێیان خۆشبی تۆ بەدەسەلات و حەکیمی .

با جاری مانای ئایەتەکە بکەین بزانین مانای چی چونکە کەم کەس لەئایەتەکە تێدەگا هەتاوەکو دەگەرێتەوە بۆلای ئەهلی تەفسیر تێت ئەگەیەنن ،ئەلی : خوایە ئەگەر تۆ ئەمانە عەزاب بدەی عەبدی خۆتن یانی الله تعالی ئەم بەندەی خۆی دروست کردوە بۆئەوەی دروست کردوە کەوا یەکخوا پەرست بێ کە شیرك ئەکا کە شەریك بۆ الله پەیا ئەکا موستەحەقی گەورەترین عەزابە لەلایەن الله تعالی وە ، بۆیە ئەلێ یا الله ئەگەر تۆ عەزابیان بدەی ئەوانە موستحەقن و بەندەی خۆتن ئەوانە سەرکەشیان کردوە ئەوانە

[١٥٤] :سورة المائدة اية : ١١٨

عصیانیان کردوه ئەوانە شیرك و کوفریان کردوە لایان داوە لەبەرنامەی تۆ عەزابیان بدە تۆ خاوەنی دەسەلاتی الله تعالی نەئەبوایە ئەو بەندانە وایان بکردایە نەئەبوایە شەریکیان پەیا کردبایە ((إِن تُعَذِّبْهُمْ)ئەگەرتۆ عەزابیان بدەی ئەمە بەرامبەر بەو بەندانەی کە شەریك بۆ الله تعالی قەرار ئەدەن (فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ)بەندەی خۆتن و خۆت دروستت کردوون پێت وتوە من بپەرستە تۆ ناپەرستی عەزابی بدە ! یانی ئەمە لەوپەری سولتان و دەسەلات و قودرەتی الله تعالیدایە ئەم ئایەتە ، (وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ)خۆ ئەگەر لێشیان خۆشبیت (فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)خۆ لەوە نیە تۆ لێیان ئەترسی تا لێیان خۆشبی ، ئێستا لەدونیادا جاری وایە لەکەسێك ئەبوریی لەبەر ئەوە نیە کە لەناختەوە لێی ئەبوری بەلکو لەبەر بێ دەسەلاتیتە و دەسەلاتت نیە ئەلێ کاکە وازی لێ بێنە بۆ ؟ دەسەلاتم نیە.

بەس الله تعالی وانیە بلێ وازی لێ دەهێنم دەسەلاتم نیە لەبەر ئەوە ئایەتەکە لەدوایدا ئەلێ نالێ (وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الغفور الرحيم)وانا لێ ئایەتەکە بەلکو دەلێ (فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) عەزیز دەسەلاتە یانی لەواکاتەی کە تۆ لێیان خۆش دەبێ خۆ ئەتوانی لێیان خۆش نەبی خۆ لێیان ناترسی ، لەئایەتێکیتر پێمان دەلێ الله تعالی : (وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا)[155] الله عەزاب ئەدا و لەدواکەشی ناترسی ،ئێستا هەر دەولەتێك بێت شەرێك بنێتەوە شەرێك بکا ئەترسی لەجاسوسەکان لەهێزەکەیتر بێتەوە سەری کێ هەیە نەترسی ؟! بەس الله تعالی ناترسی دونیات بۆ کاول ئەکا و ناشترسێ چونکە خاوەنی دەسەلاتە چونکە کەس نیە بەسەر ئەودا دەسەلاتی هەبێ ئەم ئایەتە ئاوەها پێغەمبەر لێ تێئەگەیشت (صلى الله عليه وسلم)ئەگریا و هەتاوەکو بەیانی ئەم ئایەتەی لەناو نوێژەکەیدا ئەخوێندەوە .

ئەلێ لەئیمام ئەحمەدەوە هاتووە لەریوایەتێکدا ئەلێ : بەپێغەمبەرم وت (صلى الله عليه وسلم) تا بەیانی لەنوێژەکەیدا هەر ئەم ئایەتەت ئەخوێندەوە ! ئەلێ من داوام کرد لە الله تعالی کەوا شەفاعەتی من بۆ ئەو کەسە بێ لە ئومەتەکەم کە شەریك پەیا ناکا بۆ الله ،الله تعالی پێدام ، الحمد لله سوپاس بۆ الله ، لەبەر ئەوەی شەریك پەیا کردن گەورەترین گوناهە و بەهیچ شێوەیەك لێخۆشبوونی نیە لەلای الله تعالی .

ئەمە ئایەتەکەیە (إِن تُعَذِّبْهُمْ)باسی عەزابی کردوە الله تعالی ، زۆر کەس تەنها باسی رەحمەتی الله دەکا باسی عەزابەکەی ناکا ، ئێمە پێمان خۆشە خەلك بچنە بەر رەحمەتی الله و بەهەشتەکەی بەس الله داویناوە ئەفەرموویێ :عەزابیان ئەدەم ئەو عەزابەش بۆ موشریکین ئەبەد لاناچێ ئەگەر تەوبە نەکەن ، لەبەر ئەوە لەحەدیسەکە فەرمووی : من داوام کرد لە الله تعالی شەفاعەت و تکا و پارانەوەی من بۆ ئومەتەکەم بۆ ئەو کەسانە بێ کەشەریك پەیا ناکەن کوفر ناکەن بەس ئەگەر شەریك و کوفریان کرد والله شەفاعەتی من بۆ ئەو نیە ،الله تعالی رێگەی نەداوە بەمە ، یانی ئێستا کەسێك ئیستهاۋ و گالتە بە الله بکا بلێ والله

[155] : سورة الشمس اية : ١٥

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)شەفاعەت دەكا رۆژی قیامەت رزگارمان ئەكا ! ئەو كەسە والله تۆ نایبینی بەچاوت ئەم شەفاعەتە چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەسەلاتی ئەو شەفاعەتی هەر نیە ، چونكە داوای كرد وتی یا الله شەفاعەتەم بەرێی، فەرمووی الله تعالی : بۆ كەسێكە كە شەریك پەیا نەكا ،ئیتر گوناهە ئەكا ئەكەوێتە ناو زینا و قەتەلەوە یاخود ئەكەوێتە ناو عەرق خواردنەوە هەیە بەزۆری خەلك هەیە تێ دەكەوێت تەوبە ئەكات و ئەگەرێتەوە هەتاوەكو ئەگەر تەوبەش نەكا محتەمەلە الله تعالى بەهۆی چاكەیترەوە وەكو لەسورەتی النسا بۆم باسكردن الله تعالى لێ خۆش بێ (**وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ**)[١٥٦] بەس ئەبێت ئەو كەسە بترسێ كێ ئەلێت الله تعالى لێ خۆش ئەبێ .

(**لِمَن يَشَاءُ**)یانی بۆكەسێك الله تعالى بیەوێی ، كێ ئەلێ لەحەقی تۆدا الله تعالى دەیەوێی ، خۆ الله تعالى زەحتی لێ ناكرێی ! بلێ ئەبێ لەوە خۆشبی !ئەگەر ویستی ئا ئەگەر نەشی ویست نا بەلام ئەمە بۆ شیرك نیە ، رجاتان لێ ئەكەم خۆتان لەشیرك بپارێزن تەوحید و یەكخوا پەرستی هەموو هەناسە و خوێن و گۆشتان بێ بەبێ ئەوە رزگارتان نابێ لەدوینا و لەقیامەت .

ئیمامی حەسەنی بصری دەفەرمووی : (نَزَلَ الْقُرْآنُ لِيُتَدَبَّرَ وَيُعْمَلَ بِهِ. فَاتَّخِذُوا تِلَاوَتَهُ عَمَلًا)قورئان بۆ ئەوە هاتووە كە كاری پێبكرێی كاتێك ئەیخوێننەوە خوێندنەوەكەشتان كارەكانتان بێ ،یانی كاری پێبكەن و ئەنجامی بدەن لەوتە و لەوكارانەی كە فەرمانتان پێدەكرێی كە قورئانی پیرۆزە یانی تەنها بەس بۆ خوێندنەوە بەكاری مەهێنن ، بۆیە ئەفەرموویی : (فالقرأة القران بالتفكرەی أصل صلاح القلب)تۆ ئەتەوێت بناغە و بنچینەی چاكسازی بزانی لەدلی خۆت لەكوێی وە دەست پێدەكا لەخوێندنەوەی قورئان بەتەفكور و بەتدبور بەورد بوونەوە لەواتاكانی و بەئیش پێكردنی ئالەو كاتەدا ئەم دلەی تۆ بەرە و باشترین دل ئەروا وە دلێكی زیندوو ئەبێ وە الله تعالى ئەم كەسەی خۆش دەوێی و ئەیكا بەئەهلی خۆیی .

(ولهذا كان أهل القرآن هم العاملون به)ئەهلی قورئان كێ یە ؟ كەلیمەی ئەهل لەزمانی عەرەبیدا ئەوكەسەیە كە پەیوەست و تایبەت مەندە بەكەسێك ، ئێستا تۆ ئەلێ ئەهل و بەیتەكەی خۆم ! نزیكترین كەسەكان لەتۆوە ، جابا بزانین نزیكیتر كەس لەقورئانەوە كێ یە ؟ ئەهلی قورئانیان پێ ئەوترێی ئەمە ئەلی : (هم العاملون به)ئەوانەن شارەزان بەقورئان (العاملون بمافیه)ئەوانەن كاری پێ ئەكەن ئینجا سەیری كە (وإن لم يحفظوه عن ظهر قلب)با لەبریشیان نەبێت یانی با هەموو قورئانیشیان لەبەر نەبێ ، لەوانەیە هەموو كەس نەتوانی هەموو قورئان لەبەر بكا بەتەئەكید وایە چەند سورەتێكت پێ لەبەر كراوە

[١٥٦] :سورة النساء اية : ٤٨

لێرە زانایان دەفەرموون : واجب تۆ کەلەبەرت بی !؟ بەس فاتیحەیە .لەبەر ئەوەی نوێژەکەت بەفاتیحە نەبێت ناروا ، کەواتە لەسەر گەورە و بچووکمان پێویستە ئەوانەی کەبالغ بوون کچ بێ کوربێ و ژن بێ یان پیاو پیرە میرد و پیرە ژن بێ ئەبێ فاتیحەی لەبەر بێ خۆ ئەگەر نەیتوانی نەیتوانی لەبەری بکا (سبحان الله والحمدلله ولا اله الا الله والله أكبر)ئەلێ ئەبێت ئەمە بلێت لەجیاتی . بەلام مەبەستەکەمان واجبە روکنە لەنوێژدا.

کەواتە لەقورئان هەر هەمووی ئەوەی لەسەر تۆ واجبە لەبەرت بێت فاتیحەیە باقی سورەتەکانیتر هەمووی موستحەبە لەبەرت بێ .

ئەلێ با لەبەریشی نەبێ کاری پێکرد ئەوە ئەهلی قورئانە ،با هەموو قورئانی لەبەر بێ کە کاری پێ نەکرد ئەوە ئەهلی قورئان نیە (وأما من حفظه ولم يفهمه )هەیە لەبەری دەکا بەس هیچی تێناگا (ولم يعمل بما فيه)کاری پێ ناکا (فليس من أهله، وإن أقام حروفه إقامة السهم.)[157] با تەجویدەکەی فول بێ باتەجوید و قیرائەکەتەکەی چاکترین قیرائەت بێ کە کاری پێ نەکرد هیچ سود و ئیستفادی نیە بۆی ، وەکو باسمان کرد نامەیەکت بۆ دێی بەجوانی دەیخوێنیتەوە داوات لێکراوە ئەلێ وازی لێ بێنە ئینجا با بەجوانی بیخوێنیتەوە هیچ سودی نیە با دەنگ خۆشترین کەس بی با باشترین کەس بی لەقیرائەت و تەجوید . بەداخەوە ئێوە سەیری ئەهلی قیرائەت و تەجوید بکەن لەگەل رێزم بۆ ئەهلی ئیمان بە بۆینباغێك و بەسەرێکێ ئەورووپیانەوە بەچاکتە و پانتۆلێکەوە بەریشێکی تراشاوەوە بەسمێلێکی تراشاوەوە دێت قیرائەتم بۆ دەکا ، کاکە مەیکە وەرە رووکەشەکەت با لەسەر سونەتی پێغەمبەری الله بێ (صلى الله عليه وسلم) (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ)[158] ئایەت ئەخوێنیتەوە (فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)[159] جاری لەپێش هەموو شتێکەوە ئەوانەی کە قیرائەتیان لەبەرە لەمیصر و شوێنەکانیتر ئەهلی شیرکن باش بزانە ئەلێ بەدەوی هاوار! کەچی هەموو قورئانیشی لەبەرە ئێ قورت کرد بەسەر خۆتدا بەدەوی یارمەتیت بدا !

جا ئەمە زۆر گرینگە ئەبێت ئاگاداربن هەلمەخەلتێن بەمانە ، من بەراستی حەزناکەم هەندێك مەجالیس هەیە رێز و حورمەت بدرێی بەو کەسانەی کەوا نرخی قورئانەکە نازانن کە عەمەلی پێ ناکا بەس ئەلێ وەرە کاکە با تەجویدت پێ بلێمەوە والله کاکە من تەجوید لای تۆ ناخوێنم قیرائەت لای تۆ ناخوێنم لای کەسێك دەخوێنم بەتەقوا و بەئیمان ئەو قورئانە بکا بە عەمەل بیکا بە ظاهیر بیکا ناخی خۆیی و

[157] : زاد المعاد
[158] :سورة النساء اية : ٥٩
[159] :سورة النور اية : ٦٣

دەرەوەی خۆیی ئەوە ئەهلی قورئانە ، بەس ئەگەر رێگەمان دا ئێستا هەندێك پەیا بوون قیرائەت قیرائەت ریش تراشاو و ئەوروپیانە عەمەل بەقورئان نەکردوو گۆرانی و مۆسیقای لەگەلدا ئەلیٚ.

تۆ سەیری بکە بۆ نمونە بۆتان ئەهێنمەوە : ئەبنین بۆخۆتان لە کەنالەکان کەسەکە هەموو قورئانی لەبەرە لەگەل کچێکدا گۆرانی ئەلیٚ ئی تخوا تۆ رێزی ئەم قورئانەت هێنایە خوارەوە بۆ گۆرانی وتن !

ئێستا باسیان ئەکەین بزانین ئەهلی قورئان وئەهلی خاصەی الله کێن ئەو کەسانە خۆ بابەتەکە هەر ئەوەندە نیە بزانی تەجویدەکەت و قیرائەتەکەت تەواوە یان نا ! وەرە بزانە عەمەلەکەم تەواو ! والله هەتا تەجویدەکەشت تەواو نەبیٚ من نالێم با تەواو نەبیٚ با تەواو بیٚ بەس (والذي يتعته فيه أجران)ئەوکەسەی بەنارەحەتی ئەگەر هەلەشی تێدا بکا بەلام کاری پێبکا دوو ئەجری هەیە ، ئینجا وا تیٚ مەگەن بلێن کاکە تەجوید و قیرائەت فێر مەبن نەخێر بەلکو فێری بە و عەمەلی پیٚ بکە ئەوەیە مەبەستەکەم ، ئەما ئەگەر عەمەلی پیٚ نەکەی با فێریشی بی هیچ سودی نیە ئەوەیە کە ئەلیٚ (اللهم اجعل القرآن الكريم حجة لنا لا علينا)یا الله قورئان بکەی بە بەلگەمان بۆ سەرفرازی رۆژی قیامەت نەك بیکەی بە بەلگە بەسەرمانەوە بۆ چونە ناو جەهەنەم ، یا الله پەنامان بدەی .

لەئەنەسەوە (رەزای الله لیٚ بێت)ئەفەرمووی : (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنْ النَّاسِ ))أهلين ، جەمعی أهله یانی الله ئەهلی خۆیی هەیە ، ئەها هەرکەسێك ئەهلی خۆمانمان هەیە الله تعالی ش ئەهلی خۆیی هەیە جا بابزانین ئەهلی الله تعالی کیٚ یە ؟ (قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، مَنْ هُمْ ؟)کێن ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم)؟ کەس و کارەکەی الله و تایبەت مەندانی الله ؟لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە الله تعالی کور و کچ و ئەوشتانەی هەبیٚ والعياذبالله ئەوانەی تایبەت مەندن بە الله تعالی وە .

(قال : هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ ، أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ ))[١٦٠] فەرمووی : ئەوە ئەهلی قورئانن ئەوە ئەوانەن کەوا هاودەمی قورئانن دائیمەن لەگەل قورئاندان ئەوانە تایبەت مەندن بە الله تعالی وە الله تعالی خۆی ئەیان پارێزی نزیکترین کەسن لە الله تعالی .

ئەلیٚ ئەهلی قورئان ئەوکەسانەن کەوا ئەیخوێنەوە و لەبەری دەکەن و کاری پێدەکەن لەشەو و رۆژدا ئەوانە ئەولیایی الله ن ئەوانە تایبەت مەندن، چۆن کەسانێك تایبەت مەندی تۆیە لەژن و مال و مندالی خۆت ئەیان پارێزی خەم و پەژارەت بۆ ئەوانە پارێزگاریت بۆ ئەوانە چۆن ئەوان تایبەت مەندن بەتۆوە

[١٦٠] : صحيح إبن ماجه:رقم ٢١٥

والله مثل الاعلى ئەهلی قورئان و قورئان خوێنان و ئەوانەی کاری پێ دەکەن ئەوهان بەم شێوەیە ، ئینجا کێ خۆیی ئەکا بە ئەهلی الله تعالى با خۆی بکا بە ئەهلی قورئان با لەقورئان نزیکببێتەوە .

لەبابی تذکیرە و وعضا ئەم شیعرانەی هێناوە ئەیکەین بە کوردی :

(أهل القرآن أئمة بهم اهتدى
،،،،،، أهل السلوك إلى رضا الجبار
لكن عليهم أن يقوموا بالذي
،،،،،، فيه من المشروع للأبـــرار
صدق وإخلاص وحسن عبادة
،،،،،، وقيام ليل مع صيام نهـــار
وتورع وتزهد وتعفــــــــف
،،،،،، وتشبه بخلائق الأخيـــــار
وديانة وصيـــــانة وأمانـــــة
،،،،،، وتجنب لخلائق الأشـــرار
وأداء فرض واجتناب محـــــــارم
،،،،، وإدامة الأوراد والأذكـــــار
يا حامل القرآن إن تك هكـــــذا
،،،،،، فلك الهناء بفوز عقب الدار
ومت أضعت حدوده لم تنتفـــــع
،،،،،، بحروفه وسكنت دار بـــوار)

ئەمە شیعرێکی زۆر خۆشە لەباری ئامۆژگاری کردنی کەسانێکەوە کە ئەهلی قورئان دەبێ چۆن بن .

ئەلێ ئەی ئەو کەسەی کەوا ئەهلی قورئانی و قورئان خوێنی ئەی قورئان خوێنان کەسانێك کەوا رێگەی الله یان گرتوە بەتۆ ئیقتدایان کردوە تۆ قورئانیان بۆ باس دەکەیت و بۆیان شەرح دەکەی لەرێگەی دەمی تۆوە دێن رێگەی الله دەگرنە بەر ، کەواتە تۆ قدوەی ، بەلاَم ئەم جۆرە کەسانە ئەبێت ئاگایان لێ بێ ئەبێ هەستن بەوەی بۆیان دانراوە لەناو ئەم قورئانەدا چ شتێکیان بۆ دانراوە کە ئەنجامی بدەن ئەبێ ئەوها برۆن ، لەوانە بریتیە لە : لەراستگۆیی و لە ئیخلاص ، راستگۆیی چیە و ئیخلاص چیە .

صدق و الأخلاص  زانایان لێکی دەدەنەوە بە شوێن کەوتنی عیبادەتی راستەقینەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ئیخلاص بۆ الله کردنە ئەمە هەر دوو مەرجی وەرگرتنی عەمەلە یانی هەر عەمەلێك تۆ بیکەیت ئەگەر وەك پێغەمبەر نەبێ (صلی الله علیه وسلم) کە کردویەتی  وە بۆ الله شی نەکەی ئەوە قبول نیە ئیتر باش ئاگاداربە ئەبێ ئەهلی قورئان بەم شێوەیە بێ ، بەداخەوە ئەمرۆ ئەهلی قورئانەکانی ئێمە هیچ شتێکیان لەپێغەمبەر ناچی (صلی الله علیه وسلم) زۆربەیان نە رووخساریان نە نوێژەکەیان نە عیبادەتەکەیان هەتاوەکو نە حەج و عومەرەکەیان تۆ سەیری بکە پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : (صلوا کما رأیتمونی أصلی)[١٦١] برۆ بزانە وەك ئەو نوێژ دەکەن ! نە بە الله یان دەفەرمووی : (خذوا عني مناسککم)[١٦٢] حەجەکەتان وەك من بێ ، دەبرۆن لەگەل قافلە چیەکاندا بزانە وەك ئەو حەج دەکەن نە بە الله ! باوەرت هەبێ ئەوەی کە عیلمی هەبێ ئەزانی وایە بەس ئەوەی عیلمی نەبێ ئەلێ چوم بۆ عومەرە زۆر خۆش بوو لێ ئەپرسین چیت کرد و چیت نەکرد سەیر دەکەی لە زۆربەی شتەکانیدا هەلە بووە ، بۆیە ئەبێ وریابین و وەك پێغەمبەر بین (صلی الله علیه وسلم)بۆ ئەمە دەبێ برۆیت کیتابی حەدیس بخوێنیتەوە بزانی چۆن حەجی کردوە حەدیسی جابر لە صەحیحی موسلیم کەس خوێندویەتەوە لەوەی حەج و عومری کردوە رۆژێك لەرۆژان صەحیحی موسلیمتان کردەوە بزانن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆن حەج و عەمرەکەی کردوە خۆ زۆر بەشتان خوێندەوارن هەر دەلێ گوێی مەدەریی و پارەی بدەریی و برۆ بۆ حەج دوای کێ ئەوەکەویت کەسێك دوو کەلیمە تەق تەق ئەزانی و بەدوایی ئەکەویی نابێ وابیت پاشان ئەبێ بۆ الله ی بکەیت هاتمەوە حەجم کرد شتێك بەخۆیەوە ئەبستێ بۆ ئەوەی خەلك بزانی و بلێ حاجی فلان ئاخر بۆ ئاوا ! تخوا هەتا ئێستا بیستوتانە بلێن حاجی ئەبو بکر و عومەر و عەلی و حاجی عوسمان ؟تێبگەن خۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) حەجی لەپێش هەموویانەوە کرد حەجە و عیبادەتە بۆ الله تعالی دەکەیت پێویست ناکا بلێن حاجی فلان و حاجی فلان کاك فلان و تەواو بۆ الله بکە .

(وحسن عبادە،،،، وقیام لیل مع صیام نهـــار)ئەبێت عیبادەتێکی جوان ئەنجام بدەی .

ئەو ئیخلاصە بۆ ئەوەیە کە تۆ شەریك بۆ الله بریار نەدەی بەهیچ شێوەیەك ئەگینا لێت وەرناگیری ، ئەها کابرای قورئان خوێن هەموو قورئانی لەبەر بوو عالمیش بوو کەچی الله تعالی یەکەم کەس خستیە ناو ئاگری جەهەنەمەوە الله تعالی وتی : درۆ ئەکەی بۆمنت نەکردوە بۆ خەلکت کرد بلێن دەنگ خۆشە و عالمە و زانایە ودانایە خەلکە وتی ؟ بەلی ،دەبرۆ لەخەلك ئیشەکەی خۆت وەرگرەوە جەزاکەت لەخەلك وەرگرەوە بۆ الله بکە .

[١٦١] :صحيح البخاري
[١٦٢] : رواه البيهقي في السنن الكبرى

پاشان ئەلێ شەو نوێژی لەگەلدا بکەی وە رۆژوو بگریی (وتورع وتزهد وتعفـــــــف)ئەمە چیە ئەمانە ؟
ورع : ئەوەیە خۆت ئەپارێزی لەحەرامەکان .
زهد : ئەوەیە کەوا دونیات ناوێی .
تعفف: ئەوەیە کەخۆت ئەپارێزی و خۆت بەخاوێنی رائەگریی لەشتە پیس و ناشرینەکان.

(وتشبه بخلائق الأخيـــــار)خۆت ئەنوێنی بەو کەسانەی کەوا چاکەکارن بەئەخلاق و رەوشتی چاکەکاران بەکۆمەلەی چاکەکاران (وديانة وصيـــــانة وأمانـــة)خاوەنی دین و خاوەنی ئەمانەت و پاراستن و دەست پاکی و چاو پاکی ، ئەمرۆ زۆر بەی قورئان خوێنەکان ئەلێ بێنە پارە زهود و وەرعی چی ١٠ بۆ ٢٠ وەرەقە (وتجنب لخلائق الأشـــرار)خۆت دوور خەیتەوە لەکۆمەلەی خراپکاران لەئەخلاق و رەوشتی خراپکاران ،( وأداو فرچ واجتناب محـــــــارم)فەرزەکان جێ بەجێ بکەی بزانە الله تعالى لەقورئانی پیرۆزدا چەند فەرزی بۆ داناویی نزیکەی ٧٠ جار الله تعالى دەفەرمووی: (يا يها الذين امنوا )نەتان بیستوە ئەم ئایەتە یانی ئەی ئیمانداران ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە الله و بە پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم)کاری چاکە دەکەن ئەوها بکەن و ئەوها بکەن بەتایبەتی لە سورەتی الجحرات هەمووی (يا يها الذين امنوا )ە .

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ)[١٦٣] ئەی ئیمانداران شتێك مەلێن لەبەردەمی الله و پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی ئەوەیە کە الله و پێغەمبەرەکەی(صلى الله عليه وسلم) شتێکی وت تۆ مەلێ منیش ئاوا دەلێم ، تەشبیە نەبێ ولله مثل الأعلى باوك و کورێك یان مامۆستا و قوتابیەك لەجیگایەکدا بن قوتابیەکە یان کورەکە قسە بکا پێ ئەلێن عەیبە ئەوە مامۆستاکەت لێرەیە یان دەلێن عەیبە ئەوە باوکت لێرەیە قسە مەکە ، ئێمە مخلوقین الله خالقە لەبەر دەمی الله قسە مەکە بلێ هەرچی فەرمووی بەسەرچاوم پێغەمبەرمان هەیە (صلى الله عليه وسلم)هەرچی فەرموو بلێ بەسەر چاوم . ئەمرۆ پێ ئەلێ الله وپێغەمبەر وا دەلێ (صلى الله عليه وسلم) ئەلێ ئاخر من رەئیم وانیە تۆ هەی تاوەکو رەئیت هەبێ ! تۆ چیت لەبەردەمی الله و پێغەمبەرەکەی تاوەکو رەئیت هەبێ جالێرەدا الله تعالى بیرمان ئەخاتەوە ئەلێ تۆم لەئاوێکی بێقیمەت دروست نەکرد یەکسەر ئەتگێرێتەوە بۆ ئەوێی ئەوەی تەکبور بکا وای پێ ئەوترێی ئاخر تۆ چیت (وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا)[١٦٤] ئەفەرمووێی تۆم لە سکی دایکت دەرهێنا هیچت نەئەزانی ئێستا بۆ لێم بوویت بەشت !؟قسە لەئاستی الله وپێغەمبەرەکەی دەکەی (صلى الله عليه وسلم)تۆ چیت هەتاوەکو لەئاستی الله وپێغەمبەرەکەی قسە

[١٦٣] :سورة الحجرات اية : ١
[١٦٤] :سورة النحل اية : ٧٨

بکەیت ئەوەشی دەیکا قوری بەسەر بۆ رۆژی دوایی خۆ زۆرن ئەوانە ، ئەمرۆ پیِ دەلیّ زەکات وا دەبیّ ئەلیّ ناکاکە وا باشترێکە ئەلێم پێغەمبەر وایی وتوە ئەلی نا ئێستا واباشترە ، وەکو ئەوە وابیّ پێغەمبەر نەیزانیوە و ئەم دینە بۆ هەتا هەتایە نەهاتبیّ الله و پێغەمبەرکەی (صلی الله علیه وسلم) نەیانزانیوە کەوا ئەم دینە هەتا ئاخیری زەمان دەروا ئەم خەلکە لەوەختە جیاجیاکانی ئەم سەردەمە چیان پێویستە چیان پێویست نیە ئەدەبت هەبیّ لەگەل الله و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم).

(وأداء فرض واجتناب محـــــــــارم،،، وإدامة الأوراد والأذكـــــــار)فەرزەکان بکە و حەرامەکان مەکە بەردەوام بە لەویردەکانت ئەی خاوەنی قورئان ئەی ئەو کەسەی قورئان خوێنی(یا حامل القرآن إن تك هکـــــــذا) ئەی خاوەنی قورئان ئەگەر ئەمە بیّ ئەخلاق و رەوشتت (فلك الهناء بفوز عقب الدار)و الله إن شاء الله خۆشترین پاشەرۆژ چاوەریت ئەکا ،ان شاء الله مەنزیلەت ئاخیر ئایەت ئەبیّ کە ئەیخوێنیتەوە وە بەرزترین شوێنی بەهەشت جێگەت ئەبیّ ان شاء الله ،ئەی ئەگەر وانەبیّ (ومت أجعت حدودہ لم تنتفـــــع،،،،،، بحروفە وسکنت دار بـــوار)ئەگەر سنورەکانی قورئانت نەپاراست والله حەرفەکانی سودتت پیّ ناگەیەنێت ئەچیتە ناو جەهەنەم شوێنی هەلاك و لەناو چوو ،داوا ئەکەم لە الله تعالی لەوانە نەبی هەریەکێك لەئێمە و لەموسلمانان بگەرێنێتەوە بۆ ئەم قورئانە .

چەند حەدیسێك باس ئەکەین بزانین حالی صەحابە و تابعین کە پێیان ئەوترێی سەلەف [١٦٥] چۆن بووە :

.لەوانە إبن مسعود هەلدەبژێریی ئەلیّ : باسی صەحابەمان بۆ دەکا بزانین چۆن بوون لەگەل قورئاندا ئەفەرمووی : (كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا إِذَا تَعَلَّمَ عَشْرَ آيَاتٍ)هەریەك لەئێمە ئەگەر ١٠ ئایەت فێربووبایە (لَمْ يُجَاوِزْهُنَّ حَتَّى يَعْرِفَ مَعَانِيَهُنَّ وَالْعَمَلَ بِهِنَّ)[١٦٦] ١٠ ئایەتەکە تجاوزی نەئەکرد بیکاتە بە ١١ و ١٢هەتا ماناکەی ئەزانی وە تا کاریشی پیّ ئەکرد .( كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا)یانی لەئێمە موسلمان لەئێمە و پیاو و ئافرەت لەئێمە لەبەرئەمە هەموو قورئان فێربووین وئیشیمان بەهەموو قورئان کرد .

[١٦٥] :تیبینی : کە ئەوتریی سەلەڤ و سەلەف لەزمانی عەربیدا واتای چی : زانایان باسی دەکەن و دەفەرموون سەلەڤ ئەو کەسەیە کە ئاکار و ئەخلاقی وەك پێغەمبەر و صەحابەیە (صلی الله علیه وسلم)نابیّ هەمومان وابین یانی موسلمانێکی راستەقینە کە لەسەر رێبازی پێغەمبەر و صەحابە بروا(صلی الله علیه وسلم)سەلەف یانی پێشینەکانمان .

پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) بەفاطیمەئەلی: جارێك لەمەجلیسێك دانیشتبوو فاطیمە هات پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شتێکی چرپاند بەگوێدا دەستی کرد بەگریان لەناو خێزانەکانیدا بوو ئەویش هات دوای شتێکیتری چرپاند بەگوێدا ئەویش پیّ کەنی (تەبعەن چرپاندن دروست نیە ئەگەر سیّ کەس بن بەس ئەوان سیّ کەس نەبوون زیاتر بوون)ئینجا دوای چرپەی دووەم دەستی کرد بە پیّ کەنین .

لێیان پرسی ئەوە چی بوو: وتی والله سری پێغەمبەرئاشکرا ناکەم (صلی الله علیه وسلم)کە پێغەمبەر وەفاتی کرد و باسی کرد وتی : لەم مەجلیسەدا پیّ وتم وتی : ئەی فاطیمە ئەوە من مردنم نزیك بوویتەوە ماوەیەکی تر من ئەمرم دەستم کرد بە گریان دواتر وتی نزیکترین کەسم لەمنەوە دوای مردنم تۆی بەمن ئەگەیتەوە شەش مانگی نەبرد فاطیمەش وەفاتی کرد جا ئەلیّ :پێغەمبەر پیّ فەرموو (نعم السلف وأنا لكی )فەرمووی باشترین پێشین بۆتۆ منم شوێن قسە و وتار و ئاکارەکان و دینەکەم بکەوە ئەوەیە سەلفی ئومەت جا سەلەڤ ئەم ئومەتە کە بریتین لەپێغەمبەر و صەحابە کە باشترینن کە قورئانیان بەباشترین شێوەیە جیّ بەجیّ کردوە.

[١٦٦] : الكتب » جامع البيان عن تأويل آي القرآن» ذِكْرُ بَعْضِ الأَخْبَارِ الَّتِي رُوِيَتْ فِي الْحَضِّ ...رقم :٧٢

ئەمڕۆ هەموو قورئانی لەبەرە لەم سەرەوە تاوەکو ئەوسەریتر بەلام بەداخەوە عەمەلەکەی ئەم عەمەلە نیە .

عبدالله کوری عومەر بۆ مان دەگێرێتەوە ئەلێ : عومەری کوری خەتاب کە باوکیەتی (عن أبيه أن عمر بن الخطاب كان يصلي من الليل ما شاء الله)عومەری کوری خەتاب شەو هەل ئەستایەوە و شەو نوێژی ئەکرد (حتى إذا كان من آخر الليل أيقظ أهله للصلاة)[١٦٧]کە ئەگەیشتە کۆتایی شەو هێشتان ماوە بۆنوێژی بەیانی خێزان و مندالەکانی خەبەرئەکردەوە .کێ لەئێمە وادەکا (يقول لهم الصلاة الصلاة )پێانی دەوت نوێژ نوێژ مەبەستی شەو نوێژە هەلسن بۆ شەو نوێژ کەچی ئەمڕۆ بۆ نوێژی بەیانیش خەبەریان ناکاتەوە خۆشی و ژن و مندالەکەشی دوای نوێژی بەیانی هەلدەستی رەمەزانی لێ دەرچی ئەویش ئەبیت بەخەبەر بێ بەتایبەتی شەوەکانی کورتە ئیستا هەر ناخەون بەلام غەیری رەمەزان ئەوە هیچ ، دەی تخوا مندالەکەی خەبەر ناکاتەوە بۆ مەکتەب بەدار رۆژێکی ئەروا ئەی بۆ نوێژەکە گوناحە با بخەوێ ! ئەی مەکتەبەکەی نا بەدار دەبێ هەلسێ مەکتەبەکەش بۆ دنیا و درهەمەکەیە بۆ تعین بونە گەر تعین بوون نەبێ کەس نایخاتە مەکتەبەکەوە ، کەواتە تۆ الله ت گۆریەوە بۆپارە کورەکەم هەلسە پارە پەیا بکە واز لە الله بێنە و نوێژ مەکە ! ئەوە حالی زۆربەمانە بگرە بەیانی خەبەری ناکاتەوە ئەلێ سەرمای ئەبێ گوناهە زستانە گوناهە و خەوەکەی لێ ئەزریی ، کەچی بۆ مەکتەبەکە بەدار هەلسە بۆ مەکتەب یانی هەلسە بۆ پارەکە هەلسە بۆ سبەینی پارە پەیا بکە .

ئینجا بابزانین قورئان چی دەلێ لەم بارەیەوە دوای ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە عومەری کوری خەتاب : (وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ)[١٦٨]تخوا ئەمە پێچەوانەی واقیعی ئێمە نیە ئەم ئایەتە . الله تعالى دەفەرمووی : ئەمر بکە بە ئەهلەکەت بەژن و مندالەکانت هەلسن با نوێژ بکەن و صەبری لەسەر بگرە ئێمە رزق لەتۆ داواناکەین ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم)خۆت مەشغول مەکە ئەوەندە بەدونیاوە ئەوە لەسەر ئێمەیە (نَّحْنُ نَرْزُقُكَ)کێ بارانت بۆ ئەبارێنی کێ زەویت بۆشین ئەکا کێ ئەت ژیەنێ هەموو دونیا هەلسێ ئەتوانی شتێکت بداتێ تۆ نالێت لەدوای نوێژەکانت (اللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت)[١٦٩] هەمووتان لەبەرتانە ئەمە ماناکەی ئەزانن ؟

[١٦٧] : الكتب » موطأ مالك» كتاب صلاة الليل » باب ما جاء في صلاة الليل
[١٦٨] :سورة طه اية : ١٣٢
[١٦٩] :رواه مسلم

یانی (اللهم لا مانع لما أعطیت)یا الله كەس ناتوانی مەنعی شتێك لەمن بكا تۆ بمدەیتی (ولا معطي لما منعت)وە كەسیش ناتوانی شتێكم بداتیٚ تۆ مەنعت كردبیٚ ، كەواتە هەمووی الله دەیكا تۆخۆت وا دەڵیٚ كەچی ئعتراف بەخۆت ناكەی بروا و سیقەت بەخۆ نیە ئەڵیٚ نەخێر فلان كەس نەمداتی الله ش نامداتیٚ كەچی لەولاشەوە دەڵیٚ : (اللهم لا مانع لما أعطیت) ئەمە موخالفەی واقیعی خۆتە موخالفەی قسەكردنی خۆتە. هەتا ئەم كەلیمەیە ئەوەندە گەورەیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) لەشەو نوێژدا دەیەفەرموو : (أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ: اللهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ)[١٧٠] حەقترین كەلیمەیەك ئینسان بیڵیٚ ئائەوەیە بڵیٚ یا الله هەرچی تۆ نەمدەیتی كەس نامداتیٚ ئەوەشی تۆ لێم بگریتەوە كەس نامداتیٚ ،ئەڵیٚ ئەوە حەقترین كەلیمەیە ئینسان بیڵیٚ .

جا پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەم ئایەتەدا پی دەفەرمووی : (لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا)ئێمە داوای ئەوەت لیٚ ناكەین خۆت بەژیانەوە مەشغول بكەی وەرە خەریكی عیبادەتی الله بە ، ئەمەش مانای ئەوەی نیە دابنیشی و هیچ نەكەی نەخێر مەبەستی ئەوە نیە بەس پێمان ئەڵی خۆت مەكوژە بەدونیاوە ئەمرۆ شتەكان پێچەوانەن هەموو ژیانت بۆ دین تەرخان بكە لەدونیاكەت هەندێكت لەبیر نەچیٚ ئەمە ئەصلی دونیایە و ئەصلی دینەكەمانە ،بەس ئەمرۆ دەڵیٚ هەموو ژیانت بۆدونیا تۆزقاڵێكت بۆ دینەكەت بیٚ ئەمرۆ وای لێهاتووە واقیعەكە وایە ،ئادەی پێم بڵیٚ لەم ٢٤ سەعاتە چەندت بۆ دونیا دانا وە چەندیشت بۆ دین دانا ؟!ئی والله هەیە ئەتوانی بەنیو دان بروا خەڵك هەیە ئەتوانی لەرەمەزاندا هەر ئیش نەكا هەیە ئەتوانی لەكاتەكانیتریشدا غەیری رەمەزان شتێكی كەم پەیا بكا و قەناعەتی هەبیٚ بەس نا قەناعەت نیە دەفتەر و دوودەفتەر خانوەك و دوو خانوو سەیارەیەك و دووسەیارە فلان ئەوەندە و ئەوەندە باهەم بیٚ وا دەڵیٚ ئەڵی مالی سپی بۆ رۆژی رەش ئەوەی كردوە بەعاقیدەی ژیانی راستە ئەمە بەلام ئەی دینەكەت ئەی قیامەتەكەت .

ئەنەسی كوری مالك بۆمان ئەگێرێتەوە لە ئەبو طلحەوە ئەفەرموی : (كان أبو طلحةَ أكثرَ الأنصارِ بالمدينةِ مالًا من نخلٍ) ئەبو طلحە لەهەموو كەسێك زیاتر لەمەدینە مالی هەبوو لەنەخل نەخل یانی باخی خورما (وكان أحبَ أموالِه إليه)باشترین مال و باخە خورمایی ناوێكی هەبوو پی ئەوترا (بَيرُحاءُ)یاخو بیرحا تەبعەن ئەم كەلیمەیە وەكو هەندێك لە ئەهلی عیلم باسی ئەكەن بەغەلت خوێندویانەتەوە یان نوسیویانە بیرحا بەخۆی (بَيرُحاءُ)ناوی زەوییەكەیە یان ناوی باخە خورماكەیە (وكانت مُستَقبِلَةَ المسجدِ)بەرامبەر

[١٧٠]:صحيح المسلم

مزگەوتەکەی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم)یانی باخە خورمایەکی هەبوو زۆر عەجیب بوو (وكان رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم يَدخُلُها، ويَشرَبُ من ماءٍ فيها طيبٍ)پێغەمبەر ئەچووە ناو باخەکەیەوە (صلی الله علیه وسلم)ئاوێکی زۆر سازگار و خۆشی لێ ئەخواردەوە (قال أنسٌ : فلما أُنزِلَتْ هذه الآيةُ)کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (لَن تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ)[١٧١]یانی ئێوە گەورەترین پاداشتی الله تان دەست ناکەوێی هەتا لەخۆشەویسترین مالی خۆتان نەبەخشن ،هەیە دەبەخشێ بەس لەمالە خراپەکەی دەبەخشێ هابیل و قابیلتان لەبیرە هابیل لەباشترین مالی خۆیی بەخشی قابیل لەخراپترین مالی خۆیی بەخشی ئەلێ ئەوەی قابیل قبول نەکرا خۆ بەخشیشی بەس قبول نەکرا لەبەر ئەوەی مالێکی باشی هەلنەبژارد بۆ الله تعالی ، لەقوربانی بۆیە پێت دەلێ با کوێر نەبێ و شەل نەبێ نەخۆش نەبێ و لەر نەبێ کەسەکەش ئەچێ حیوانێکی شەر و کوێر ئەهێنی ماموستا ئەمە ئەبێ !! ئی کاکە تۆ بۆ الله دەکەی دەوەرە شتێکی جوان تقدیم بکە ، یانی ئێستا بلێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) میوانی مالەکەتە ئەچی شەل و کەرێکی بۆدەهێنی ؟!ئەی بۆ الله تعالی ؟! ولله مثل الأعلی خۆ الله تعالی نایخوا نەخوێنی نە گۆشتی هیچ شتێکی بەر ئەو ناکەوێی تەقوا کەی تۆیی بەر دەکەوێی .

ئەلێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پاداشتی خێرتان دەست ناکەوێی پاداشتێکی رێك و پێك و باش هەتا لەخۆشەویسترین مالەکەی خۆتان نەبێ نەبەخشن ئەوە تەقوایە بلێ ها شتە باشەکە بۆتۆ ،ئەی ئەبو طلحەش کە گوێی لە ئایەتەکە بوو . مەبەستمان لێرە ئەبو طلحەیەیە کە لەگەل ئەم ئایەتە چۆن تفاعولی کرد .( قام أبو طلحةَ إلى رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم فقال : يا رسولَ اللهِ، إن اللهَ تَبارَك وتعالى يقول : لَن تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ)وتی : ئەی پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) من ئەم ئایەتەم گوێی لێ بوو کە الله تعالی وا دەلێ ، فەرمووی : وتویەتی والله پاداشتی تەواوتان دەست ناکەوێی تا لەباشترین و خۆشەویسترین مالەکەی خۆتان نەبەخشن (وإن أحبَّ أموالي إلي بَيرُحاءُ)وتی من باشترین مالەکەم بریتیە لە (بَيرُحاءُ)ئەو باخە خورمایەی کە ئەم ناوەیە لەهەموو باخەکانم ئەو باشترینە (وإنها صدَقَةٌ للهِ)ئەوە کردم بە خێر لەپێناوی الله دا (أرجو برَّها وذُخرَها عِندَ اللهِ)من ئەمەوێی بێتە زەخیرە لەلای الله تعالی دا (فضَعْها، يا رسولَ اللهِ، حيث أراك اللهُ)[١٧٢]وتی : ئەی پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) چی لێ ئەکەی لێ کە ،سەیرتان کرد لەگەل ئایەتەکە چۆن تجاوبی کرد ئەوە بوو حالی سەلف نەیدەخوێندەوە و مالیشی هەبێ و گوێی پێ نەدا دواتریش مالەکەشی هەر کۆبکاتەوە بلێ نایدەم بەکەس ئەوها نەبوو بەم شێوەیە کەچی ئەمرۆ زۆربەی دەولەمەندەکان بەم شێوەن ، ئێ والله والله والله هیچ مالێ لە صەدەقە کەم

[١٧١]:سورة ال عمران اية : ٩٢
[١٧٢]:صحيح البخاري

نابیَ ئەمە پێغەمبەر فەرموویەتی (صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی : (ما نقص مال عبد من صدقه)[١٧٣] هیچ کاتێك مالەکەت لەخێرکردن کەم نابێتەوە هەر زیاد دەبێت الله تعالی وەعدی داوە بەس تاقیت ئەکاتەوە ئەلیَ بزانم لەدەستی دێت !دەی تۆ تاقی بکەوە خێرێك بکە بزانە الله تعالی لەکوێی وە بۆت ئەنێرێتەوە بەس تۆ الله تعالی تاقی مەکەوە بیکە بەعیبادەت بۆی ، ئەمە هەلەیە بلێن برۆ الله تعالی تاقی بکەوە کە ئێمە دەلێن برۆ تاقی بکەوە مەبەستەکەمان ئەوەیە کە تێبگەن ئەلێن الله تعالی وەعدی داوە إلا ئەبیاتە سەر .

جا پێغەمبەر بزانین قبولی کرد ؟!پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قبولی نەکرد فەرمووی : نا من حەز دەکەم کەس و کارەکەیی خۆت کامەیە بیکەتە بەصەدەقە بۆیان وتی باشە کردی بەخێر بۆ کەس و کارەکەی خۆیی .

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)چاوی لەمالی کەس نەبووە ئاگادارین ، ئەوە ئەگەر ئێمە و مانان بوونایە ئەیوت بیدە بەئێمە بەقوربان مەمنون و سوپاسی دەکا .

إبن عباس (رەزای الله تعالی لیَ بێت ) دەفەرمووی : عیونەی حەصنی کوری حوذیفەی کوری بەدر هات لە جێگەیەکەوە ( فنزل علی ابن أخیه الحر بن قیس بن حصن)هات بۆلای کورە براکەی کە ناوی حوری کوری قەیس بوو (وکان من النفر الذین یدنیهم عمر)حەری کوری قەیس یەکێك بوو لەوکەسانەی عومەر (رەزای الله تعالی لیَ بێت)نزیکی دەکردەوە خۆیی و لەمەجلیسەکەیەوە لەمەجلیسی حوکم و مەجلیسی مەشوەرەیەوە جا عومەر (رەزای الله تعالی لیَ بێت)هەر کەسێك ئەهلی عیلم بایە گەورە بایە یاخود بچوك گوێی نەئەدایە و لەخۆیی نزیکی ئەکردەوە ، ابن عباس خۆ تەمەنی ئەوەندە نەبوو بەس نزیکی ئەکردەوە لەخۆیی ئەیوت ئەهلی عیلمم ئەوێی ئەهلی عیلم ، ئەمرۆ ئەلیَ نا فلان کەس ئەوەنە دکتۆرایی هەیە بەلام نیو عیلمیشی لەدیندا نیە ئەچێتە پێشەوە و ئەچێتە پێشی پێشەوە کابراش چەند عیلمی دینی هەبیَ لەدواوە داوەیە بەس ئیمامی عومەر وانەبوو (رەزای الله تعالی لیَ بێت)دەسەلاتدارانی ئەم ئومەتە ئەوها نەبوون کاتی خۆیی چونکە بەعیلم ئەم ئومەتە رزگاری ئەبیَ بەدین و بەتەقوا رزگاری ئەبیَ بەدەست پاکی و چاو پاکی رزگاری ئەبیَ ئەمرۆ زۆربەی ئەوانەی دەچنە پێشەوە وا نین بۆیە ئاوا قورمان کراوە بەسەردا .

(وکان القراء أصحاب مجالس عمر ومشاورته، کهولا کانوا أو شبانًا)یانی ئەگەر بێتوو بەتەمەن و کەمال بوونایە یاخود گەنج بوونایە ئەهلی عیلم بون قرا ئەوانەی لەقورئانیان ئەزانی و شارەزابوون ئەوانەی کەوا

[١٧٣] : أخرجه الترمذي

خاوەنی عیلم بوون ئەوانە لەمەجلیسی ئیمامی عومەر دا بوون (فقال عيينة لابن أخيه)عوينە بە كورە براكەی وت (يا ابن أخي، هل لك وجه عند هذا الأمير، فتستأذن لي عليه)ئەتوانی مۆلەتێکم بۆوەرگریی لەلای عومەری کوری خەتاب تا بچمە مەجلیسەکەیەوە دابنیشم (قال: سأستأذن لك عليه)ئەویش وتی : بەلی ئیزنت بۆ وەرئەگرم ئیزنی بۆ وەرگرت بەلام با بزانین ئەو چی کرد و چی روویدا وە ئیمامی عومەر لەگەل ئایەتی الله تعالی چۆن تجاوبی کرد (قال ابن عباس : فاستأذن لعيينة)داوای ئیزنی کرد و رۆیشتە ناو مەجلیسەکەوە (فلما دخل قال: يا ابن الخطاب)ئەم کابرایە چوە مەجلیسەکەوە و بیٚ ئەدەبی کرد وتی کوری خەتاب (والله ما تعطينا الجزل)والله تۆ مالی زۆرمان نادەیتی (ولا تحكم بيننا بالعدل)ئەوەی کەوا بلاوە ماشاء الله عەدالەتی عومەر زۆر عەجائیبە کەچی ئەم دەلیٚ والله تۆ بەعەدالت حوکم ناکەی ئەی قوربەسەر ئەگەر ئەو بەعەدالت حوکم نەکا (فغضب عمر)زۆر تورە بوو ئیمامی عومەر (حتى هَمَّ بأن يقع به)ویستی لیٚ بدا ، حەری کوری قەیس وتی : (فقال الحر: يا أمير المؤمنين إن الله قال لنبيه صلى الله عليه وسلم)ئەی پێشەوای ئیمانداران الله تعالی بە پێغەمبەرەکەی وتوە لەقورئان(صلى الله عليه وسلم) (**خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ**)[١٧٤] پیٚ وت عەفووی خەلك بکە ئەمر بەمەعروف بکە پشت کەرە نەزانان وازیان لیٚ بێنە ئەوەی جاهیل بوو لیٚ گەرێی ، جا پیٚ وت (وإن هذا من الجاهلين)فەرمووی ئەم خزمەی من جاهیلە لیٚ مەگرە ئەم ئایەتە جیٚ بەجیٚ بکە ، بزانین ئیمامی عومەر چی وت : وتی نەخێر هەر لیٚ ئەدەم چۆن ئەمە شەرەف وکەرامەتی منی روشاند وای کردوە لەناو مەجلیسی جەماعەتدا منی وا لێکردوە ؟!! نەخێر وتی : (قال ابن عباس: فوالله ما جاوزها عمر حين تلاها عليه، وكان وقَّافاً عند كتاب الله عز وجل)[١٧٥] ئەلیٚ یەکسەر بیٚ دەنگ بوو هەر ئایەتێکی بۆ بخوێنرایەتەوە چی بووتایە یەکسەر بیٚ دەنگ ئەبوو چی وتبایە جیٚ بەجیٚ ئەکرد ئەوەی کە ئایەتەکە پیٚ دەلیٚ .

ئاخر بەگالتە نەبوون بە عەشەرەی موبەشەرە . جا با ئێمە تعامولمان لەگەل قورئاندا باشبیٚ حەلالەکانی حەلال بکەین وە حەرامەکانی حەرام بکەین ئەوەی ئەمری پێکردوە بیکەین ئەوەی ئەلیٚ مەیکە مەکەن وە چیرۆك و نمونەکانی ورد بینەوە و تێبگەین چونکە دەلیٚ والله تێناگەن إلا عالم نەبیٚ کەواتە لە چیرۆك و نمونەکانی تیٚ نەگەیی تۆ عالم نی ئەبیٚ هەولدەی عالم بی موحکم و متشابهی ئیمانمان پیٚ هەبیٚ وە ئاگامان لێی بیٚ مەسەلەی مخاریجی حورف و تیلاوە ئەبیٚ بزانی بەس ئەوە وات لیٚ نەکا لەعەمەل پێکردنی دوورت بخاتەوە یاخود عەمەلی پیٚ نەکەیت و خەریکی ئەوە بیت بەتەنیا ، تەجوید ئەزانی و قیرائەت ئەزانیٚ وەکو وتمان بەلام ئەحکامەکانی جیٚ بەجیٚ ناکا .

[١٧٤] :سورة الأعراف اية : ١٩٩
[١٧٥] : رواه البخاري ٤٦٤٢

قورئانی پیرۆز هەمووی باسی یەکخوا پەرستییە ئەم وتەمان زۆر جار وتوە و ئەیلێینەوە ئەلێن زۆرکەس کە باسی قورئان دەکا دەلێ ئەم قورئانە کەتەلۆك و وایە وایە نازانی تەعریفی قورئان بکا نەخێر بەلکو قورئان یانی یەکخوا پەرستی هەرچیەکی تێدایە باسی ئەوەت بۆ ئەکا الله بناسە پەیرەویی فەرمانەکانی بکە ئەوەش چیرۆکەکانی کە دەلالەت لەو کەسانە ئەکا کە کێ بەقسەی کردوە و کێ بەقسەی نەکردوە وە ئەحوالەکانیان چۆن بووە هەموو قورئان بگەرێی لەمە زیاتریی تێدا نیە ئەگەر ئەتەوێی پێناسەی تەواوی قورئان وەربگرێی بلێ کیتابی تەوحید و یەکخوا پەرستیە ، بەخەلك ئەلێ خەلکینە تەنها الله بپەرستن وەرە الله بناسە ئیش بە فەرمانەکانی بکە وە ئەوەش چیرۆکەکان چەندەها چیرۆك لەقورئاندا باس کراوە باس لەوانە دەکا کەوا ئەوەی کاری بەقورئان کردوە لەگەل ئەوانەی کەوا کاری بەقورئان نەکردوە لەوە زیاتر نیە داوا دەکەم لە الله تعالی لەوانەمان بگێری کەوا کار دەکەن بە قورئان و بەسەلامەتی بگەرێنەوە بۆلای .

## دووەم :

(التقرب إلى الله بالنوافل بعد الفرائض فإنها توصله إلى درجة المحبوبيَّة بعد المحبة.)هەرکاتێك کە فەرزەکانت جێ بەجێ کرد تەماشت کرد لەدوای هەر فەرزێك لەو فەرزانەی کەوا دەیکەیت بزانە چ سونەتێك هەیە جێ بەجێ کە ئەتەگەیەنێتە دەرەجەی خۆشەویستی الله تعالی .

ئەبو هورەیرە (رەزای الله تعالی لێ بێت)دەفەرمووی : (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله – صلى الله عليه وسلم – : إن الله قال ( من عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب ، وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب إلي مما افترضت عليه ، وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه ، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به ، وبصره الذي يبصر به ، ويده التي يبطش بها ، ورجله التي يمشي بها ، وإن سألني لأعطينه ، ولئن استعاذني لأعيذنه)[١٧٦] ئەم حەدیسە مانایەکی زۆر گەورەی تێدایە چەند ئیستفادە و فقهێکی تێدایە پێویستە ئیسنای موسلمان لێ ورد بێتەوە پێش هەموو شتێك الله تعالی فەرموویەتی : حەدیسێکی قودسیە : الله تعالی فەرموویەتی : هەرکەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکا من حەربی لەگەل هەلدەگیرسێنم هەر کەسێك دژایەتی خۆشەویستێکی من بکا ئەوە من ئاگاداری دەکەمەوە کەوا من حەربم لەگەل هەلگیرساندوە جا ئەو کەسانەی کەوا دژایەتی موسلمانان ئەکەن دژایەتی ئەوانە ئەکەن کە دۆستی

[١٧٦]:رواه البخاري

الله ن دژایەتی ئەوانە ئەکەن کە رێگەی راست نیشانی خەلکی ئەدەن با خۆیان ئامادە بکەن بۆ حەربی الله تعالی کەسیش لە حەربی الله دا نایباتەوە با باشبزانیٚ هیچ کەسێك چونکە الله تعالی دەفەرمووی : (وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ)[١٧٧] وەلەو الله تعالی پێویستی بە جوندی نیە ئەلیٚ کەس نازانی عەدەدی جوندیەکانی الله چەند زۆرە ! .، وە ئەو دەسەلات و ئەو قوەت و ئیقتدارەی الله تعالی هەیەتی هیچ کەسێك نیەتی کەس ناتوانی لەبەرامبەری رابوەستێتەوە تاریخیش باشترین شایەتە بۆ هەموو ئەوانەی کەوا کەلەرەقیان لەگەل الله تعالی دا کردوە وە لەگەل دینەکەی الله تعالی دا کردوە .

پاشان ئەفەرمووی : (وما تقرب إلي عبدي بشيء)هیچ شتێك نیە ئینسان پیٚ نزیك ببێتەوە لەالله تعالی إلا بەوە نەبیٚ کە (أحب إلي مما افترضت عليه)یانی فەرزەکانی الله تعالی کە فەرزی کردوە پێش هەموو شتێك ئاگاداربە ئەوە نەفەوتێنی دوای ئەوەی فەرزەکانت جیٚ بەجیٚ کرد لێرەدا ئیشارەتە بۆ گەورەترین فەرزە عەمەلیەکان کە نوێژە تۆ ئەگەر نەیکەت چۆن خۆت لە الله نزیك ئەکەیتەوە (وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه)پاشان ئەلیٚ : بەندەکانم بە نەوافل و سونەتەکان ئەوەندە ئەیکەن خۆیان نزیك کەنەوە لەمن هەتاوەکو من خۆشم دەوێن ، ئینجا سەیری دوای خۆشەویستیەکە بکە (فإذا أحببته)ئەلیٚ ئەگەر من ئەوم خۆشویست (كنت سمعه الذي يسمع به)تەبعەن لەم حەدیسە هەندێك بەهەلە لیٚ تێگەیشتوون لەماناکەی ئەبێت رۆشنی بکەینەوە کەوا ماناکەی چیە رووکەشی حەدیسەکە وا دەلیٚ دەلیٚ :ئەگەر من خۆشم ویست من ئەبم بەو گوێچکەیەی کە پیٚ ئەبیستی من ئەبم بەو چاوەی کە پیٚ ئەبینی من ئەبم بەو دەستەی کە دەستی پیٚ ئەبابۆشت من ئەبم بەو قاچەی کە پیٚ ئەروا ئەگەر داوام لیٚ بکا ئەیدەمیٚ ئەگەر پەنام پیٚ بگرێی پەنای ئەدەم لەشتە خراپەکان و لەکارەسات و ناخۆشیەکان نایەلم توشی زەر بیٚ .

بەلام لێرەدا مەبەستی پیٚ ئەوەیە کە ئێستا زانایان بۆمان شەرح ئەکەن کە ئەگەر تۆخۆشەویست بووی لەلای الله تعالی ئەبی بەو گوێچەکەیەی کە تۆی پیٚ ئەبیستی مانای وایە هیچ شتێك نابیستی إلا بەرەزامەندی الله تعالی نەبیٚ ئەوشتانە ئەبیستی کە الله تعالی پیٚ رازییە مراقەبەی الله تعالی لەسەرخۆت دا ئەنیٚ نایەلی هیچ شتێکت گوێی لیٚ بێت إلا ئەوشتانە نەبیٚ کە الله تعالی پیٚ خۆشە نەك والعياذ بالله الله تعالی ببێت بەگوێچەکەی تۆ ئەم حەدیسە وەکو وتمان زۆر کەس بەهەلە لیٚ تێدەگا بەتایبەتی ئەو کەسانەی کەوا خاوەنی عقیدەیەکی پرو پوچن کە خاوەنی (وحدة الوجود)ئەلێن بوونەوەر هەمووی خوایە

[١٧٧]:سورة المدثر اية : ٣١

ئەوەتا لەو حەدیسەش ئەلێ من ئەبم بەگوێچكەی كەواتە تۆش خوای ! والعیاذ بالله نەخێر ئەمە مەبەستی نیە .

(فتضمن هذا الحديث الشريف الإلهي – حصر أسباب محبته في أمرين: أداء فرائضه، والتقرب إليه بالنوافل.)دووشتی باس كرد لەحەدیسەكەدا یەكەم ئاگات لەفەرزەكان بێ دووەم سونەتەكان . بەس پێش ئەوە بچینە سەر شەرحەكەی لەسەرەتا دا باسی وەلیمان كرد تەبعەن وەلی یانی دۆست خۆشەویستی الله ئێوەكەستان خۆتان بەدووژمنی الله ئەزانن ؟! نەخێر كەواتە ئێوە هەمووتان دۆستی الله ن ئەی دۆستایەتی الله تعالى لەسەر یەك دەرەجەیە ؟نەخێر هەیە دۆستایەتیەكەی زۆر زۆر بەهێزە هەیە مامناوەندە هەیە زۆر زەعیفە دۆستیش لەدونیادا هەروایە كەسێك سەیر دەكەی لەدونیادا هاورێتە زۆر دلسۆز تە كەسێك ئەبینی كەمتر كەسێك ئەبینی زۆر كەمتر هەیە هەر حەز ناكەی تەكلیفی شتێكی لێ بكەی ئەلێ بەخوا دۆستایەتیەكەم ئەوەندە زۆر نیە دۆستایەتیەكەم لاوازە كەواتە راستە ئەلێ دۆستە دووژمنت نیە بەلام دۆستایەتی دەرەجاتی هەیە ئێمەش هەمووی وەلی الله تعالى ین بەو مانایە ئێستا بۆ نمونە كەلیمەی وەلی لەلای خەلك مانایەكی سەیری هەیە وا ئەزانی كەوتت وەلی یانی ئەبێ بلێ عەرز شەق بە و ئاسمان برۆخی و هەموو بەقسەی بكا نەخێر وانیە وا دەزانی وەلی بریتیە لەو كەسەی سولتەیەكی مطلەقی هەیە لەدونیادا بۆ نمونە گەورەی ئەولیایان پێغەمبەرە (صلى الله علیه وسلم)ئینجا صەحابەكانە ئینجا هەتا دوای هەتا رۆژی قیامەت ئەبیاو رسول هەموی ئەولیای الله ن بەلام هەمووی بەندەن هیچی لەسنوری بەندایەتی دەرناچێ هیچی هیچی بەدەست نیە ئاگاداربە ئەوەتا الله تعالى بە پێغەمبەرەكەی دەفەرموی (صلى الله علیه وسلم) (وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ)[178]یەك لەو عقیدەی پرو پوچانەی كە خەلكی عقیدەی وایە كە وەلی غەیب ئەزانی ئەوەتا الله تعالى بەپێغەمبەر دەفەرمووی(صلى الله علیه وسلم ) بلێ من غەیب نازانم لەناو قورئانەكەتدا وانووسراوە كەچی بەقسەی ناكەی شێخ الاسلام أبن تیمیە دەفەرمووی: (وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ)بلێ ئەگەر من غەیبم بزانیایە پێشهاتە ناخۆشەكانم لەبەردەمی خۆمدا ئەبینی حەزم نەئەكرد تووشی بم تووشی نەئەبووم .

دوو پێش هاتی ناخۆشتان بۆ باس دەكەم لە سیرە كە پێغەمبەری الله (صلى الله علیه وسلم)ئەگەر بیزانیبایە لەژیانی خۆیدا كە ئەوەی دێتە پێش حیسابی بۆ ئەكرد كە هەردووكیان زۆر ناخۆشە .

[178] سورة الأعراف اية : ١٨٨

یەکێکیان ئیتهام کردنی خێزانی بەزینا هەتاوەکو ئێستا بەم بابەتەوە ئەنالێنین هەتا ئێستاش شیعەی رافیزەی کافری غەدار هەر بەدایکمان عائیشە نالیٚ زیناکار ؟! ئەگەر پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) ئەم پێشهاتەی بزانیبایە کە لەحادیسەیەکی ئاوادا تووشی ئەمە بین کە ئیتهام بۆ خێزانەکەی بکرێی حیسابێکی بۆخۆی ئەکرد تووشی ئەوە نەئەبوو هەتا لەژیانی خۆیی یەك مانگ نالاندی بەم بابەتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) غەیب نەزانی لەکوێی عبدالقادری گەیلانی غەیب ئەزانی ئەوەئەمان بەپیاو چاکایەتی خۆیان نەیان زانی ئەی چۆن ئەم فالچی ودرۆزن و ساحیر وکاهینانە کە خۆیان بە وەلی دا ئەنیٚ بەداخەوە کەسان خۆیان بەزانا و موسەقەف و دانائەزانیٚ ئەچن بۆلایان ئەوە لەکوێی غەیب ئەزانیٚ ئەوانە ئەولیای شەیطانن ئەولیای رەحمان نین کەچی ئەم خەلکە خۆی توشی چی کردوە ئەوە پێش هاتی یەکەم پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) نەیزانی .

پاشان لەشەری حوددا هەمووتان ئەزانن ٧٠ صەحابە شەهید بوو لەسەرووی هەموویانەوە حەمزە ئەو پالەوانە ئەگەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بیزانیبایە حالەتێکی وای لیٚ رووئەدا پیٚ ئەوتم من پێم وتن نەیەنە خوارەوە دواتر تووشی ئەوە ئەبین دواتر ئەوها و ئەوهامان لیٚ دێی ئەوانیش دەیانوت بەچاوان مادەم وایە ناینە خوارەوە بۆئەوەی تووشی ئەوە نەبین بۆخۆتان باش دەزانن چی روویدا ،. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زانی هەتا خەریك بوو پێغەمبەر شەهید بکرێی لەشەرەکەدا (صلی الله علیه وسلم).

وەلی ئەو کەسەیە کە دۆستایەتی الله دەکا فەرمانەکان بەجیٚ دەهێنیٚ سونەتەکان ئەکا و لەالله ترسە چاوپاکە و داوێن پاکە پاشان الله تعالی وەکو رێز و حورمەت هەندێك شتی ئەداتیٚ . جا ئەم وەلییە لەسەر مستەوا گشتیەکەی کە وتمان کە پێغەمبەرانن گەورەی ئەولیائانن ئەو شتانەی کە ئەیدا بە وان پێیان ئەوترێی موعجیزە یانی خەلك دەسە وەسان ئەکا وەکو ئەو بهێنیٚ مانگی شەق کرد کەس نەیتوانی مانگ شەق بکا پاشان ئەم قورئانە پیرۆزەی بۆ نارد کەس نەیتوانی وەك ئەم قورئانە بهێنیٚ ئەوە موعجیزەیە .

بەلام ئەولیا کەرامەتیان هەیە ، مەریم هەمووتان ئەزانن لەقورئاندا سورەتێك بەناویەتی یەکێك بوو لە ئەولیاکانی الله تعالی خۆپێغەمبەریش نەبوو کەچی الله تعالی خواردنی بۆ ئەنارد زەکەریایی پێغەمبەر(علیه السلام)ئەهات ئەیوت ئەمەت لەکوێی بوو ؟(**قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا**)[١٧٩] ئەوەت لەکوێی بوو ئەم خواردنە ؟ ئەیوت لەلایەن خواوە هاتووە . لەلای الله تعالی وە بۆی هاتە خوارەوە بروامان هەیە بە وەلی وە بروامان هەیە بەکەرامەتەکەی بەلاٚم هیچ کاتێك مەریم نەرۆیشت ها من ئەوعالەمەم هەیە ئەها من وا دەکەم و رەش سپی دەکەم و سپی رەش دەکەم وای نەئەوت هەر ئەترسا لە الله تعالی ئەوەتا

[١٧٩] :سورة ال عمران اية : ٣٧

عیسای کوری تووشی چی بوو ؟دەسەلاتی هەبوو لەکافرانی بپارێزێی إلا الله تعالی فەرمووی : خۆمان بەرزمان کردەوە .

جا ئاگادارین بابەتی وەلی ئەبێ پێناسەکەی باش بزانین وەلی یانی دۆستی الله . ئەم دۆستایەتیە دەرجاتی هەیە جا هەرکەسێك پیاو بێ و باشبێ و رێك و پێك بێ با دەرەجەکەی خۆیی بەرزبکاتەوە . تەشبیە نەبێ هەروەکو ئیمتحان کەسی وا هەیە ٥٠ یان ٦٠ یان ٧٠یان٨٠یان ٩٠یان١٠٠ی هەیە بەس هەمووی وەکو یەك نیە هەمووی دەرچووە بەس هەموو وەکو یەك وانیە ئەوەی ١٠٠ی ئیمتیازی هەیە ئەوە باشە ئەوە لە وەلییە مقرەبەکانە ئەوەی ئیمتیازی لەدیندا هەبێ ئینجا الله تعالی رێزیی لێ دەنێ سەیر دەکەی هەندێی شت حاسل دەبێ لەسەر دەستی ئەم کەسەدا بەبێ ئەوەی خۆشی بزانێ وە ناچێ شانازی پێ بکا و خۆیی دەرخا لەناو خەلکیدا بلێ من ئاواو ئاوا و ئاوام ، من زۆر سەیرم دێی لەخەلکانێك عیبادەتی خۆیان کەشف دەکەن و تەقوا و ئیمانی خۆیان بۆخەلکی باس ئەکەن ئەلێ والله کاکە من چەند سالە من وام و چەند سالە من نوێژم نەچووە کاکە نەچوە تۆ بۆ خەلکت کردوە ؟! دەبرۆ ئەوە وەرت گرت و وتی ئافەریم دەبرۆ وەرت گرت و تەواو کۆتایی هات ! ئەگەر بۆ الله شت کردوە باسی مەکە .

(وأولياء الله هم أوليائهم الذين امنوا وكانوا يتقون)پێناسەکەیمان بۆ ئەکا لەم ئایەتە پیرۆزەدا بزانن وەلی کێ یە بروا مەکەن بەوکەسانەی بەناوی جادوو و فالچی و دەست بر و بەناوی سەید و دەروێش و صۆفی و پۆخلەواتەوە ئەم دونیایەیان کاول کردوە هەرچی شیرك و گومراییە هێناویانە بەسەرماندا بروا بەمانە مەکەن سەیری ئایەتەکەی قورئان بکەن چۆن تەفسیرو باسی وەلیی مان بۆ دەکا .

الله تعالی دەفەرمویی: (أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)[١٨٠] (أَلَا)یانی بزانە ئەولیاکانی الله ناترسن وە خەمیش ناخۆن ناترسن لەوەی کاتێك ئەمرن بەرەو لای الله ئەرۆن ئەچن بۆناو رێز و کەرامەتی الله تعالی وە وەنە خەمیش دەخۆن لەدوای خۆیانەوە بۆ مال و منداڵیانەوە الله دەیانپارێزێی کاتێك کە ئەمرن و ئەچنەوە بۆلای الله تعالی نە لەرابردوو خەم ئەخۆن وە نە لەداهاتوو ئەترسن ،ئینجا پێناسەیان ئەکا الله تعالی (الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ)[١٨١] ئەوانەی بروایان هێنا بەدل بەزمان بەکردەوە (آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ)وە خۆیان ئەپاراست لەعەزابی الله بەوەی فەرمانەکانی الله یان جێ بەجێ ئەکرد خۆیان لەحەرامەکان ئەپاراست ئەمە پێناسەی وەلییە .

هەرکەسێك ئەم پێناسەی تێدا بێ ئەمە وەلییە کێ لەپێش تر بێ ئەو لەپێشترە لەلای الله تعالی وە .

[١٨٠] :سورة یونس ایة :٦٢
[١٨١] :سورة یونس ایة :٦٣

إبن كثيردەفەرمووی :(يخبر تعالى أن أولياءه هم الذين آمنوا وكانوا يتقون وقد بين في قوله)ئينجا بەئايەتێكى تر پێناسەی تەقوامان بۆ دەكا ئەڵێ الله تعالى بەيانی ئەولياكانی خۆيی كرد كە ئەوە ئيماندارەكانن پاشان ئەوانەن كە تقوايان هەيە تەقواشی پێناسەكردوە لەقورئانەكەيدا ئەمە خاڵەكانی تەقوايە كە لەكۆتاييدا دەفەرموی (هُمُ الْمُتَّقُونَ)ئەمانە متقون بزانين كێن ئەمانە :

(لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ)لێرەدا الله تعالى باسی رووكردنە كەعبەمان بۆدەكا رووكردنە رووگەكان لەناو ئەو ئومەتەی پێشينيندا يەهود و نەصارا رويان كردۆتە كوێی وە موسلمان رووی كردۆتە كوێی دواتر الله تعالى بەموسلمانی فەرموو رووبكەنە كەعبە جا پێيان ئەڵێ :رووكردنە مەشريق و مەغريب بۆ نوێژ ئەگەر الله ئەمر نەكا خۆيی بۆچ رووگەيەك روو بكەی و نوێژ بكەی ئەوەخێر نيە و ئەوە چاكە نيە لەلای الله تعالى مەگەر الله تعالى خۆيی بڵێ رووبكەنە ئەو شوێنە ئەوكاتە ئەمە چاكەيە (وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ)ئەمە رەدە لەيەهود و نەصارا و لەهەموو ميلەتەكانيتر.

(الْبِرِ)چی يە ؟چاكە چی يە لەلای الله تعالى وە ؟بۆيە (آمَنَ بِاللَّهِ)پێش هەمووشتێك ئەبێ ئيمان بهێنی بە الله ، والله ئيمانت نەبێ باشترين كەسی سەر زەوی بی پارە بدەی بەخەڵكی و خەڵكی تێر بكەی خەڵكی نازانم چی لێ بكەی چەندەها مەشروع و مەشاريع دابمەزرێنی هيچ ئيستفادەی نيە لەلای الله تعالى وە يەكەم مەرج مەرجی ئيمانە بۆيە ئەبێت لەم دەرگايەوە بچينە ژوورەوە مەرجی ئيمان بە الله بوون چونكە الله تعالى ئەوە نەبێ قبولی ناكا .

ئينجا وەرە تۆبەبێ ئيمان هەرشتێك بكە ديفاع لەهەرشتێك بكە بەتاڵ و پروپوچە ئەمرۆ لەم شتانە زۆر زۆر ئەبيستينەوە لەدەرگايی ئيمانەوە خەڵك ناچێتە ژوورەوە لەدەرگاكانيترەوە ئەرۆن بەڵكو بەداخەوە ئيمانداران زۆر زەليل و لەدوای كەسانێكن كە رقيان لێيان و كەسانێكن كەوا لەلای خەڵكی هيچ وەزنيان نيە و هيچ دەسەلاتيان نيە ، لەلای الله ش ئەمە مەرجە ئەبێت ئيمانت هەبێ ئەمە يەك.

(وَالْيَوْمِ الْآخِرِ)ئيمانی هەبێ بەرۆژی ئاخيرەت كەزيندوو ئەبيتەوە ، ئێوە سەيری زۆربەی سەرزەمين بكەن سەيری دەسەلاتدارانی بكەن بزانە بروايان بە زيندووبوونەوە و رۆژی قيامەت هەيە ! ؟ئەگەر بروايان هەبايە ئەمرۆژەمان بەسەر نەدەهات .

(وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ)ئيمانی بەمەلائيكە هەبێ وە بەكيتابەكان هەموو ئەو كيتابانەی كەوا الله تعالى ناردوويەتی وەكار بە قورئانی پيرۆز بكا (وَالنَّبِيِّينَ)وە ئيمانی بەهەموو پێغەمبەران هەبێ (عليهم الصلاة والسلام)بەبێ جياوازی لەنێوانياندا (وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ)مالی هەيە بيدا

لەکاتێکدا ئەو ماڵەی زۆر خۆش دەوێی بیدا بەکەسانێکی خزم و ناسیاو (وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ)بیدا بە هەتیوەکان و بێ باوەکە کان ، جا لێرەدا ئاگاداربن لە ڕەمەزاندا ئافرەت هەیە ئەڵێ من بێوەژنم من هەتیوم و هەتیوم هەیە یارمەتیم بدە !کاکە بێوەژن و هەتیو لەقورئاندا نەهاتووە ئەگەر فەقیر نەبێ ئەگەر فەقیر بێ یارمەتی ئەدەی ئەما بێوەژنی وا هەیە ماشاء الله چەندەهایی هەیە ئەو قسەقۆرەی دەکرێی لەناوی خەلکیدا والله ئەگەر دینگەکەشی زێر بێ هەر دەبێ یارمەتی بدەی شتی وامان نیە لەدینی ئیسلامدا بەلکو فەقیر و مسکینمان هەیە ، هەتیوەکە یان بێوەژنەکە مامۆستاکە فەقێ کە و خەلکەکە هەرکەسێك ئەگەر فەقیر و موسکین بوو بیدەرێی قەرزار بوو بیدەرێی قەرزێی لەپێویستیدا کردبوو ئەما ئەگەر دەولەمەند بوو نەخێر پێ ناچێ . لەپێش هەموو کەسێك مامۆستایی ئاینی پێ ناچێ ئەگەر دەولەمەند بوو .

(وَالْمَسَاكِينَ)فەقیر و نەدارەکان (وَابْنَ السَّبِيلِ)کەسێك کە لێ قەوماوە لەسەفەردا ئەو کەسە پارەی هەیە لەشوێنی خۆیی بەس لەم شوێنەدا لێ قەوماوە (وَالسَّائِلِينَ)ئەوەی بەحەق داوا دەکا نەك ئەوەی بەناحەق داوا دەکا ئەمرۆ زۆر کەسان هەن بەناحەق داوا دەکەن (وَالسَّائِلِينَ)یانی سوالکەرەکان و دەرۆزەکەرەکان ئەوانەی کەداوا دەکەن بەلام دەرۆزە نەك ئەوەی ئێستا هەیە (وَفِي الرِّقَابِ)پارە ئەدا ئەو بەندە موسلمانانە ئازاد ئەکا کە بەندەن (وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ)نوێژ دەکا بەرێك و پێکی دێتە ناو جەماعەت (وَآتَى الزَّكَاةَ)زەکات ئەدا (وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا)عەهد و پەیمانی خۆیان ئەبەن بەرێوە(والصَّابِرِينَ) ئەوانەی کە صەبریان هەیە لە(فِي الْبَأْسَاءِ)لە فەقیری (وَالضَّرَّاءِ)لەناخۆشی و نەخۆشی (وَحِينَ الْبَأْسِ)لەکاتی شەرکردن لەگەل کافراندا (أُولَٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا)ئەمانە ڕاست ئەکەن ئینجا ئەفەرمووی(وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ)[١٨٢] ئەوە موتقییە .

جادووگەر لەمەدا جێگەی ئەبێتەوە ؟! تخوا جادووگەرێکت بینیوە پارە بدا بە خەلکی ؟! جادووگەرێکت بینیوە ئەم مواسەفاتانەی تێدا بێ کە زۆربەی خەلك ناویان ئەنێن ولی و ئەوە سەیدە و ئەوە دەروێشە و ئەوە فلانە و ئەوە فلانە .

طلق کوری حبیب دەفەرمووی :( التقوى أن تعمل بطاعة الله على نور من الله يرجوارحمة الله)کەسێك کە بلێ خاوەنی تەقوایە تاعەتی الله بکا لەسەر ڕۆشنایی قورئان و حەدیس نەك لەخۆیەوە شت بهێنێ وەمەبەستیشی الله تعالى و بەهەشتەکەی بێ ئەوە تەقوایە (وأن تترك معصية الله على نور من الله يخاف عذاب الله)[١٨٣] وەواز لەشتە خراپەکان بهێنێ بەلام کامانە خراپەن ئەلێرەدا زۆر گرینگ ئیشارەت بەمە

[١٨٢] :سورة البقرة اية : ١٧٧
[١٨٣] : الفتاوي الكبري ج١-السنة والبدعة- الطهارة ص١٨٠

بدەین چاکەکان و خراپەکان بەکورتی خەلك ئەمە ئەزانیٚ بەکورتی خەلك ئەلیٚ کاکە چاکە بکە و خراپە مەکە ئەمە بەکورتی بەس وەرە خراپەکانم بۆ بژمێرە وەباسیان بکە وە چاکەکانم بۆ بژمێرە و باسیان بکە ئەوچاکانەی کە هەیە زۆربەی لەلای خەلکی خراپەیە !ئەو خراپانەی کەلای شەرع خراپە لەلای خەلك زۆربەی چاکەیە ئەبیٚ وریابین ئێمە کێشەمان لەو نیە بەلام کامە چاکەیە و کامە خراپەیە سەیری کیتاب و حەدیس بکە سەیری کیتابی الکبائر بکەن یەك یەك خراپەکان و گوناهە گەورەکان سەیر بکە بزانە کامانە گوناهە مەیکە .

(ولایتقرب ولي الله إلا بأداء فرائضه ، ثم بأداء نوافله.)لەکۆتاییدا ئەلیٚ وەلی الله تعالى لەخۆیی نزیکی ناکاتەوە إلا بە بەجیٚ هێنانی فەرزەکان و وە بەجیٚ هێنانی سونەتەکان پاشان ئەوە وەلی الله تعالى یە ئێستا تیٚ گەیشتن لە ولی الله تعالى .

وەلی الله تعالى کەسێکی ساختەچی و دەست برو قۆل بر نیە بروا نوشتە بکات و پارەی بیست وەرەقە و سی وەرەقەت لیٚ بستێنیٚ شتی وامان نیە لەشەرعی الله تعالى دا .

جا نزیك بوونەوە لە الله تعالى لە نەوافیلەکان ئەتگەیەنێتە ئەو دەرجەی خۆشەویستیە بۆلای الله تعالى .

پاشان ئەفەرمووی : (فم تمتأل القلب بعظمة الله تعالى )هەرکاتێك دلی بەندەکان پربوو لەخۆشەویستی الله تعالى لە گەورەی الله تعالى الله تعالت بەگەورە راگرت الله تعالى لەهەموو گەورەکان گەورەترە ئێمە سەرەتایی نوێژەکەمان بەبانگ دەست پیٚ دەکەین ئەلێن (الله أكبر) سەرەتایی نوێژەکە لەناو مزگەوت هەر دەلێن (الله أكبر) خوا لەهەمووان گەورەترە ئایا وایە لەدلماندا خۆشەویستانم یان کەسیتر گەورەتر هەیە .! ئەری واللە گەورەتر هەیە لە خوا والعیاذباللە تاقی بکەنەوە ئەگەر وانەبووایە حالمان بەو حالە نەئەگەیشت دەبا الله لەهەمووان گەورەتر بیٚ لەدلی هەمووان بزانە لەسەر پارە و پول ئەکەین بەشەر وەرە من تەحدا ئەکەم هەر شەرێك لەسەر ئەم زەوییە بکریٚی لەسەر پارە و پول و تەماع نیە لەسەر ئەرز و ئاوە هەمووی لەبەر خۆ خۆییە برا برا ئەکوژی دەبا ئەو پیسە فرێی بدەین ئەو تەماعە دوونیایە فرێی بدەین دەبا گەورەی الله بخەینە دلەوە بترسین لە الله تعالى وەکو هابیل و قابیل ، قابیل کاتێك تەماعی هەبوو براکەی خۆیی کوشت هابیل وتی دەستیشم بۆ بێنی من بکوژی من تۆ ناکوژم دەی لەوکاتەوە هەتا ئێستا و هەتا رۆژی قیامەت مەنزیلەی هابیل هەر بەرزئەبێتەوە و قابیلیش هەر بەقورا ئەچێتە خوارەوە ئەوە نەتیجەی هەر تەماع کەرێکە و هەر قاتیلێکە کە بەناحەق کارەکان ئەکا لەگەل باشەکاندا بن و لەگەل خراپەکاندا مەبن .

هەركاتێك دل پربوو لە گەورەیی الله (محى ذلك من القلب كل ما سوى)هەموو شتێك لەدل ئەسرێتەوە ئەگەر تێدا بێت ئەگەر گەورەی الله تعالى تێدا بێ إجلال و أكبارى الله تێدا بێ هیچ لەدلتدا نامێنێ (ولم يبق للعبد تعلق بشيء من هواه . ولا إرادة إلا ما يريده منه ربه ومولاه)هیچ شتێك لەو دلەی نامێنی هیچ ئیرادەیەك إلا ئەوە نەبێ الله داوای لێكردوە ، الله تعالى داوای هەرشتێكی لێكردبێ یەكسەر ئەیكا .

ئینجا وەرنەوە بۆ حەدیسەكە ئەفەرمووێی : (فحينئذ لا ينطق العبد إلا بذكره)هیچ قسەیەك ناكا إلا زیكری الله تعالى نەبێ چونكە دلی پرە لە إجلال و گەورەیی الله ئەلێ چۆن زمانم بەكار بێنم بۆ شتێك كە الله تعالى پێ ناخۆش بێ (ولا يتحرك إلا بأمره)جولەیەك ناكا إلا بەئەمریی الله تعالى نەبێ (فإن نطق نطق بالله)ئەگەر قسەی كرد بەوە قسە دەكا كە الله تعالى پێ خۆشە (وإن سمع سمع بالله)ئەگەر بیەوێی گوێی لەشتێك بگرێی گوێی بۆ شل دەكا بزانی رەزامەندی الله تێدایە ئەگەرنا دەروا و بەجێی دێلێ ، دەی ئەمرۆ گوێچكەكان زۆربەی زۆری گوێی بۆ غەیری رەزامەندی الله (وإن نظر نظر بالله)ئەگەر سەیری كرد ئەوشتەی الله پێ خۆشە سەیری دەكا بزانێ الله پێ خۆش نیە سەیری ناكا ( وإن بطش بطش به فهذا هو مراد بقلبه)ئەگەر دەست بەرێی بۆ هەر شتێك ئەلێ بزانم الله تعالى رازییە دەستی بۆ بەرم ئینجا دەستی بۆ دەبا ئامەیە كە ئەلێ (كنت سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصر به)ئائەمەیە حەدیسەكە ماناكەی ،ئەبم بەوچاوەی پێی ئەبینێ وە ئەو گوێچەكەیەیی كە پێی ئەبیستێ وە ئەو دەستەی ئەیبات بۆ شت یانی هیچ شتێك بەبێ ئەمری من ناكات ئەم بەندەیە ئائەوە دەرەجەی محبوبیەتە.

حافظ إبن حجر دەفەرمووی : (وفى الحديپ عِظَمُ قەر الصلاه؛ فإنّه ينشأ عنها محبّه الله للعبد الژى يتقرّب بها)ئەلێ ئەلێرەدا گەورەیی نوێژ دەردەكەوێی كەتۆ ئەچیتە ناو ئەو نوێژەوە هەموو كیانت لەگەل الله یە خۆشەویستانم سەرنج بدەن لەناو نوێژەكەتدا دوات لەكەس نیە و ماناكانی لێك بدەنەوە هەموو كەلیماتەكانت لەگەل الله دا قسە ئەكەیت هەمووی یەك بەندەیەكی تێدا نیە كە تۆ داوای لێ بكەیت هەتا تۆ داوا ئەكەی بۆ پێغەمبەر محمد و ئیبراهیم (عليهم الصلاة والسلام)لەتەحیاتەكەدا ئەلێ (اللهم صل على محمد وال محمد كما صليت على إبراهيم وال إبراهيم)بزانە سەیر بكە لەناو نوێژەكەتدا هەموو كیانت لەگەل الله دایە ئەلێ خوایە پلە و پایەی پێغەمبەر محمدمان بەرز بكەرەوە چۆن ئی پێغەمبەر ئیبراهیمت بەرزكردەوە ، یانی دوعا ئەكەی بۆ خۆشەویسترین كەسی الله تعالى هەموو گیانت لەگەل الله تعالى دایە ئەوە گەورەترین عیبادەتە كە نوێژە .

ئینجا كاتێك كە سەلام ئەداتەوە ئەلێ یارسول الله هاوار یان ئەچێت غەیری رێبازی الله پەیرەو دەكا ئێستا تۆ دوعات بۆ پێغەمبەر كرد چۆن ئەبێ بچی داوای لێ بكەی ! !ئاخر خۆت كافر كرد پێغەمبەرت كرد بە

شەریکی الله لەم دوعایەدا ئەها سەیریی بکەن نوێژەکە ئەکا هەمووی تەوحید و ئیمانە دوای سەلام ئەداتەوە هەمووی بەتال ئەکاتەوە زۆربەی زۆری پیرەمێردان ئاوان چونکە ئەم عیلمەیان وەرنەگرتوە عیلمی تەوحید و یەکخوا پەرستی پێ ناخۆشە بلێ داوا لە الله بکە و داوا لە پێغەمبەر مەکە پێ ناخۆشە .
کەچی الله تعالی دەفەرمووی : (وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ)[١٨٤] ئەلێ موشریکەکان ئەوانەن کاتێك کە بەتەنها الله باس بکرێی دلی خەریکە شەق ئەبا بەلام کە غەیری الله باس ئەکرێی زۆر فەرح و خۆشحال دەبێ ، تخوا ئێستا زۆربەی پیرەمێردان وانیە پێ بلێ کاکە مەلێ یارسول الله و یا عبدالقادر ئەلێ مامۆستا ئەوە چیە تۆ رقت لە پێغەمبەرە !(صلی الله علیه وسلم)دلی خەریکە شەق ئەبا پێ ناخۆشە کە بلێ بەس الله ،ئەی پیرەمێرد ئەی بەس الله بەس نیە هەی پیرە ژن ئەی بەس الله بەس نیە بۆمان بۆ تێ ناگەن بۆ ئەتانەوێی بەموشریکی بگەرێنەوە بۆلای الله تعالی ئێمە ئەمانەوێی بەیەکخواپەرستی بگەرێنەوە بۆلای الله تعالی رزگارتان بێ وبچنە بەهەشتەکەی کەچی تۆ ئەلێ نەخێر من هەر جەهەنەمم ئەوێی ئاخر زەرەر ئەکەیی ئی الله بەسە (أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ)[١٨٥] بەس الله بەس نیە بۆ بەندەکانی ، یەك ئایەت هەیە لەقورئاندا بێ الله و پێغەمبەر بەسە !نیمانە ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەندەیە لەبەر ئەوە لەنوێژەکەتدا گەورەی ئەو خۆشەویستیە دەرئەکەوێی کەتۆ تەنها لەگەل الله تبارك وتعالی دایی .
جا ئەلێ (ومن كانت قرة عينه في شيء فإنه يَوَدُّ أن لا يفارقَه )هەرکەسێك ئەگەر خۆشحالی بینینی چاوی لەشتێکدا بوو حەزناکا بەجێ بهێلێ ، پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم)وابوو ئەی فەرموو : من خۆشحالی بینینی چاوم چۆتە ناو نوێژەوە، هەموو خۆشەویستی و هەموو رۆح و کیانی خۆیی لەناو نوێژدا ئەبردە سەر چونکە نوێژ گەورەترین عیبادەتی بەدەنییە ئەگەر ئینسان نەیکا پێی کافر ئەبێ وە ئەگەر بیکا بەمەرجێك ماناکەی بزانی هەموو قسەکردنەکەت لەگەل الله تعالی دایە .
پاشان دەفەرمووی نزیك بەرەوە بە نەوافیلەکان وە لەباشترینی هەموو نەوافیلەکان شەو نوێژە ئاگاداربە باشترینی فەرزەکان نوێژە فەرزەکانە باشترینی نەوافیلەکان واتا سونەتەکان شەو نوێژە ئاگاداربن ئەو شەو نوێژە ،
(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ الله عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ)ئەبی هورەیرە (رەزای الله تعالی لێ بێت) دەفەرموی :پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : باشترین رۆژوو لەدوای رەمەزان ئەو مانگەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

[١٨٤] :سورة الزمر اية : ٤٥
[١٨٥] :سورة الزمر اية :٣٦

دەفەرمووی :مانگی الله کەمحرەمە (وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ)[186]باشترین نوێژیش لەدوای فەرزەکان شەو نوێژە ،

جا ئەو شەو نوێژەی ئەکریی لەرەمەزان بەجەماعەت چەند خێر و فەزلی هەیە صەبری لەسەر بگرن براکانم مانگێکە وە بەهۆیی ئەم صەبرەتانەوە الله تعالی لەگوناهی پێشووتانەوە خۆش دەبێ إن شاء الله ، پاشان تەرکی مەکەن لەشەوانی غەیر رەمەزانیش هەرئەوەندەیە بەینەکەی لەرەمەزان بەجەماعەت ئەکرێی و سونەتە لەغەیری رەمەزان بەتەنها ئەکرێی و ئەوها سونەتە ئەوە جیاوازییەکەیە ئەگینا هەرئەو نوێژەیە ئەو نوێژە بەرنەوە بۆ مانگەکانیتر .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی :کە الله تعالی فەرموویەتی : نوێژم تەقسیم کردوە لەنێوان خۆم بەندەکەم بەدوو بەشەوە مەبەستی لەنوێژەکە سورەتی الفاتحەیە کەتۆ ئەیخوێنی ئەلێ : کاتێك کە تۆ ئەلێ (**الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**)[187] بزانە تۆ ئەلێ حمد و سوپاس بۆ الله تعالی ، الله تعالی وەلامت ئەداتەوە و قسەت لەگەل دەکا تۆ لەگەل الله دا قسەدەکەی باش بزانە . ئەلی کاکە من خەیالم ئەروا لەنوێژەکەمدا پێت دەلێم تۆ وەرە بیربکەرەوە لەنوێژەکەتدا و لەنوێژەکەت بیر بکەوە بزانە خەیالت ئەروا لەماناکەی بگە بزانە چی دەلێ ئێستا ئێمە ئەکەین بەکوردی سورەتی فاتیحە بزانە الله تعالی چیت لەگەلدا ئەلێ :

سوپاسی بۆ الله تعالی ، الله تعالی دەفەرمووی : بەندەکەم سوپاسی کردم یەکەسەر تۆ ئەمەت بێتە خەیالت کە الله تعالی وات پێ دەلێ (قال الله تعالی : حمدني عبدي)( الرحمن الرحيم)کەتۆ وادەلێ یەکەمجار حەمد و سەنای الله دەکەی دووەم جار وەسفی الله دەکەی سەنایی الله دەکەی ئەلێ رەحمان و رەحیمە ، ئەویش ئەلێ: (قال الله تعالی : أثنى علي عبدي)ئەلێ بەندەکەم مەتحی منی کرد پێ خۆشە ئەلێ وەك هیچ شتێکی پێ خۆش نیە ئەوها مەتحی بکەی ، پێ خۆشە مەتحی بکەی و دائیمەن زیکری بکەی جا لەخالیکیتر دا باس دەکەین کە زیکری الله یەکێکە لەو نیشانانەی کە نزیکت ئەکاتەوە لەخۆشەویستی الله تعالی هەتا تۆ باسی بکەی بلێ ماشاء الله ئەم خوایە یارمەتیمان ئەدا ئەم خوایە بارانمان بۆئەبارێنی ئەم خوایە ئەمان پارێزی هەر زمانت هەر ئەو خوایە و ئەم الله یە بێ ،ئەلێ الله زۆر زۆری پێ خۆشە کە تۆ وتت )( الرحمن الرحيم)تۆ وەسفت کرد ،ئەویش ئەلێ ئەوا بەندەکەم وەسفی منی کرد (مالك يوم الدين)پاشای رۆژی لێ پرسینەوە یانی بیری قیامەتت هەیە ، ئەلێ (قال : مجدني عبدي)یانی بەندەکەم مانە و بەقا بۆتۆیە ئەی خوایە هەمووومان ئەمرین رۆژی قیامەت ئەو دێی و گەورەمانە ولێمان دەپرسێتەوە ئەوە

[186] : أخرجه أحمد (٢/٥٣٥ ، رقم ١٠٩٢٨) ، ومسلم (٢/٨٢١ ، رقم ١١٦٣)
[187] :سورة الفاتحة اية :٢

بەندەکەم ئائەوە ئەزانێ یانی مەتحت ئەکا ئەویش (مجدني عبدي) (إياك نعبد وإياك نستعين)تۆ وەعد ئەدەی بە الله من هەرتۆ بپەرستم لەتۆ زیاتر بەقسەی کەس ناکەم مل بۆکەس نانەوێنم عیبادەت بۆ تۆ ئەکەم دوعا و رەجا و هەمووشتێکم تەنها بۆتۆیە نوێژ و رۆژو و زەکات و حەج داوا کردن و پارانە و نوزانەوە هەموشتێکم بۆتۆیە یا الله بۆکەسیتر نیە لە بەندەکانت وە داوای یارمەتیش دەکەم کە یارمەتیم بدەی لەسەر ئەو عیبادەتە داوای یارمەتی لەتۆ دەکەم ئەگەر تۆ نەبی یارمەتیم بدەی ناتوانم ئەوە بکەم (هذا بيني وبين عبدي ولعبدي ما سأل)ئالێرەدا الله تعالى دەفەرمووی : ئەمە لەنێوان من و بەندەکەم دایە وە بەندەکەم هەرچیەکی داواکرد ئەیدەمی .تخواچەند کەس لەنوێژەکەیدا ئاگای لەم مانایانەیە !؟ ئینجا ئەلێ (اهدنا الصراط المستقيم ، صراط الذين أنعمت عليهم ، غير المغضوب عليهم ولا الضالين)یا الله بمخەیتە سەر رێگە راستەکەی خۆت و هیدایەتم بدەیت بۆ ئەم رێگە راستەی خۆت بەس رێگەکەی تۆم ئەوێت رێگەی کەسیترم ناوێی رێگەی ئینسانەکانم ناوێی چونکە هەمووی ئینسانن وەکو من کاتێك لەدایك بوون هیچیان پیێ نەبوو هاتنە دەرەوە تۆ بەخێوت کردن ئێستا من بەقسەی ئەوانە بکەم ، سبحان الله خۆشەویستانم موشریکەکانی عەرەب ئەیانوت (أبشرا يهدوننا )یانی پێیان سەیربوو ئەیانوت چۆن ئەبێ ئینسانەکان هیدایەتم بدا ئەوان قسەکەیان وەلو بەرامبەر بە پێغەمبەران هەلەبوو بەس عەقلیەتێکیان هەبوو ئەیانوت باشە ئەوە ئینسانە وەکو من محمد ئینسانە چ جیاوازیەکی لەگەل مندا هەیە !؟ بۆ ئەبێ ئەو رێگا نیشانی من بدا بۆخۆم رێگە دانەنێم بۆخۆم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەوەحی وەلامیان ئەداتەوە ئەفەرموی : راستە من ئینسانم (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ)[188] راستە من ئینسانم بەلام (يُوحَىٰ إِلَيَّ) جیاوازییەکەی نێوان من و ئێوە وەحییەکەیە ، دەباشە ئەوەی ئەمرۆ بەرنامەیەکمان بۆ دائەنێ وەحی بۆ دێت ؟! کەواتە هیچ جیاوازی نیە تۆ وا ئەلێت منیش وا ئەلێم تۆ ئەلێ با وابێت منیش ئەلێم با وابێت ئەی منیش مافم نیە بلێم وابێت ؟!تۆ ئەلێ حەزدەکەم وابێت منیش ئەلێم حەزدەکەم وابێت ، حەزەکەم حەزەکەم نابێت هەمووی ئیختلاف و شەر دروست دەبێ ئەوە نیە ئیستا ئیختلاف لەهەموو دونیادا دروست بووە لەبەر حەزەکەم حەزەکەم ئەی ئەگەر هەموو بەقسەی الله بکا حەز نامێنێتەوە و تەواو هەمووتان ئەبێ بەقسەی ئەم قورئانە بکەن ئەوکاتە ئەبێت بەیەك ئومەت .

الله تعالى لەقورئاندا فەرمووی : خەلکی یەك ئومەت بون بەس دوای شەیطانەکان سەریان لێ تێکدان بەقسەی الله یان نەکرد بوون بەبەش بەش و حیزب حیزب و هەتا دوایی دوای الله تعالى دەفەرمووی :

[188] :سورة الكهف اية : ١١٠

(وَمَن يَكْفُرْ بِهِ مِنَ الْأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ)[189] هەرکەسێك لەو بەش بەش و گروپانە ئیمان بەو قورئانە نەهێنێ ئاگر جێگەیەتی ئاگر ، کەواتە تۆ ئەلێ (اهدنا الصراط المستقيم)یا الله رێنمایم بکە بۆ رێگە راستەکەت ئینجا تەئەکید لەوە دەکەیتەوە کە رێگا راستەکە کامەیە ؟( صراط الذين أنعمت عليهم)رێگەی پێغەمبەر محمد(صلى الله عليه وسلم)رێگەی پیاو چاکان رێگەی صەحابەکان (غير المغضوب عليهم ولا الضالين)یا الله رێگەی یەهود و نەصارام پێشان مەدە ئینجا الله تعالى دەفەرموی: (قال : هذا لعبدي ولعبدي ما سأل)[190] ئەمە بۆ بەندەکەم وە بەندەکەم هەرچیەکی بیەوێت ئەیدەمێ .

تخوا گەورەترین عیبادەت نەبوو ئەمە قسەت لەگەل الله دا کرد وە الله ش قسەی لەگەلدا کردی ئەوەیە نوێژ ئەوەیە گەورەیی نوێژ بەس بەداخەوە ئەو نوێژ بەس شکلەکەی لەناوماندایە رۆحەکەی رۆیشتووە و نەماوە وەکو ئینسانێکی بێ رۆح کەوتبێ ئەوهایی لێهاتووە بۆیە هیچ ئیستفادە ناکەین .

## دووەم :

(دوام ذكره على كل حال باللسان والقلب والعمل والحال فنصيبه من المحبة على قدر نصيبه من هذا الذكر.)ئەفەرمووێ : الله تبارك وتعالى ئەمری کردوە بەوەی ئینسان کەوا زۆر زۆر زیکری الله بکا لەقورئانی پیرۆزدا چەند ئایەتێك باس دەکەین کە ئەم فەرمانانەمان پێ دەلێ :

الله تعالى دەفەرمووی: (وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)[191] سەیربکەن زیکری الله بەستەوە بە سەرفرازی بەرزگاربوون لە عەزابی جەهەنەم بە رزگاربوون بەوەی کە الله تعالى عەزابت بدا ئەفەرمووی : (وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا)هەر هەمووتان ئەی موسلمانان یادی الله زۆر بکەن ، ئینجا یادی کردنەوەی الله جۆری زۆرە .

یاد کردنەوەی الله یادکردنەوەیە بەناوەکانی بە سیفەتەکانی بەمەدح کردنی یادکردنەوەیە بە تەصبیح و تحميد تكبير و تهليل وتمجيد کە ئەمە بەزۆری لەلای موسلمانان کە ئەلێ یادی الله ئەوەیە کە دێتە بەرچاویان ئەوە دێتە بەر گوێیان و ئەوەیان بۆ باسکراوە وە متأخرين زیاتر باسی تەسبیحاتیان کردوە لەوانە (سبحان الله و الحمدلله الله أكبر لا اله الا الله) ئەوانە کراوە کە ئەمەش بۆخۆی گەورەترین زیکرە ، هەروەکو لەحەدیسدا هاتووە ئەفەرموی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) : (أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)[192] .

[189] :سورة هود اية : ١٧
[190] : رواه مسلم
[191] :سورة الجمعة اية :١٠
[192] : رواه النسائي في " السنن الكبرى " (٢٠٨/٦)

پاشان یادی الله بەوەی کە ئەحکامەکانی باس بکەی ئەوامیر ونەهیەکانی بەوەی کە ئەمری کردوە و بەوەشی کە نەهی کردوە ئەمە زیکری ئەهلی عیلمە بەلکو هەرسێ زیکرەکەیتر زیکری ئەهلی عیلمە بەمەی کە الله تعالی ئەناسن بەناو وسیفەتەکانی .

ئەگەر باسی ناو سیفاتی الله تعالی بکەین زۆری دەوی باسی بکەین جاری بەتایبەتی خەلکی زۆر بەکەمی ناو وسیفاتی الله تعالی بەکەمی ئەزانن بەو مانایەی دیراسەیان نەکردوە ، ئێوە لەناوتاندا باو حەدیسێك هەیە کە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی : الله تعالی ٩٩ ناوی هەیە هەرکەسێك بیژمێرێت ئەچێتە بەهەشتەوە ، وە ناوەکانیش هاتوون ئەوەتا لەبەرگی ئەم قورئانانەدا ئەبینی هەمووی نوسراوەتەوە ، لەراستیدا ئەم حەدیسە سەرەتاکەی صەحیحە بەلام هێنانی ناوەکان ئەوە هی دەستی راوییەکانە بەلکو ناوی تێدایە کە ناوی الله تعالی نیە  هەندێك ناو هەیە لەو ناوانە ناوی الله تعالی نیە چونکە ئەمە پێغەمبەر نەیفەرمووە(صلی الله علیه وسلم) ئاگادارین ئەو ٩٩ ناوە ئەو ٩٩ ناوەی کە باسکراوە نالێن هەمووی ناوی الله نیە زۆربەی ناوی الله یە بەلاّم بەشێکی باشی تێدایە کە هی ناوی الله نیە بەلکو ئەو راوییەی ئەو حەدیسەی نەقل کردوە کە سەرەتاکەی صەحیحە هاتوون ناوەکانی الله یان هێناوە و تا ٩٩ یان پێ تەواو کردوە هەندێکی بە ئیجتهادی خۆیان دایان ناوە کە زانایانی حەدیس دەفەرموون ئەمە ناوی الله تعالی نیە .

یەك لەوانە (الظار)نوسراوە لەو وەرەقانەی لەمالاندا هەلواسراوە لەمزگەوتەکان لەقورئانەکان کە نوسراوە ٩٩ ناوە هەندێك ناو لەو ناوانە هەیە ناوی الله نیە جا ئاگاداربە کە ئەلێن بەناوەکانی الله زیکر بکەی ئەبێ بگەرێتەوە بۆ قورئان و حەدیسی صەحیح ئەو حەدیسە کە ئیمامی تزمزی ریوایەتیان کردوە زانایان دەفەرموون : بە ئیتفاق صەحیح نیە ئەم حەدیسە نەك سەرەتاکەی ئاگاداربە بەهەلە تێ مەگە ، الله تعالی ٩٩ ناوی هەیە هەرکەسێك بیژمێریت ئەچێتە بەهەشت ئەمە صەحیحە بەلام ناوەکانی یەك یەك کەباسکراوە پێغەمبەر نەیفەرمووە ئەمە ناوەکانە ، دووەم ئەبێ لەوە تێ بگەین بلێن ئەم ناوانە تەنها ٩٩ ناو نیە ناوی الله تعالی زۆر زۆرە ئەصلن ناو هەیە هیچ کەسێك لە پێغەمبەران ومەلائیکەتەکانیش نایزانن و نەیان بیستووە الله تعالی خۆی لە غەیبی خۆیدا دایناوە بەو مانایەی ناوی الله تعالی پێ پایانە باش ئاگادارین ناو و سیفەتی الله بێ پایانە بێ نیهایەتە بەلام هەندێکی بۆ ئێمە ناردۆتە خوارەوە .

الله تعالی دەفەرمووی : (وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا)[١٩٣] ئەو عیلمەی کە الله دایبەزاندوە بۆ سەر زەویی کە داویەتی بە پێغەمبەران لەکیتابەکاندا هێناویەتی کەمەیەکی کەمە لەعیلمی الله ، لەقورئاندا الله تعالی دەفەرمووی : ئەگەر بەحرەکانی سەر زەویی هەمووی ببێ بە مرەکەب دارەکانیشی هەمووی ببێ

[١٩٣] :سورة الإسراء اية :٨٥

بەقەلەم بیەوێت عیلمی الله بنوسێتەوە ناتوانی تەواوی بکا ئەگەر حەوت جاریش بیهێنیتەوە ، مەبەستی هەرچەند جار بیهێنیتەوە هەر ناتوانی تەواو نابێ عیلمی الله تعالی .

ئینجا ئاگاداربە ئەبێ دیراسەی ئەسطح و سیفات بکەی لەروانگەی ئایەت و ئەحادیسی صەحیح ئەمە بابێکی زۆر قولە ناچینە ناویەوە بەلکو باسی یادی الله تعالی یە هەرکاتێك یادی الله ت کرد و ناوەکانیت باس کرد وەرە بۆ کیتاب و سونەی صەحیحە .

لەباشترین زیکری الله تعالی ئەوەیە کە بەکەلامەکەی زیکری بکەی وەکو باسمان کرد الله تعالی دەفەرمووی : (وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ)[194] هەرکەسێك کە پشت بکاتە ئەم قورئانە کە زیکری الله تعالی یە ژیانێکی تەسك و تاریك و ناخۆشی لەقیامەتدا ئەدرێتی ، وەبەبەرچاویشمانەوەیە خۆشەویستانم ئەوە ژیانە ئێمە هەمانە ! چەندجارمان وتوە . جا لێرەدا کەلیمەی زیکر کە دەفەرمووی (وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي)مەبەست پێ قورئانی پیرۆزە.

الله تعالی دفەرمووی : (الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)[195] ئەو کەسانەی ئیماندارن دلیان بەوە ئۆقەرە و موتمەئین دەبێ بەوە دائەمەزرێی و خۆشحال دەبێ بەزیکری الله .

زانایان دەفەرموون زیکری الله لێرە بریتیە لە تەوحیدی الله یەکخوا پەرستی ئەو دلە یەکخوا پەرست نەبێ قەت ئۆقەر و متمەئین نابێ دوو خوا و سێ خوا و چوار خوای تێدا بێ موتمەئین نابێ چونکە تۆ ئەبیت بە بەندەی چەند کەسانێك لەکوێی موتمەئین دەبی چەند جار الله تعالی لەقورئاندا ئەم پەندەمان بۆ لێك ئەداتەوە ئەگەر بەندەیەك هەبێ بۆیەك سەید بەندەیەکیش هەبێ بۆ چەند سەیدێك کامیان مورتاحە ؟ کام بەندە ؟ ئەوەی بۆ یەك سەید ، پێ بلێ وابکە وادەکا دانیشە دائەنیشی و تەواو ، ئەمیتر ئەو دەلی وابکە ئەویتر دەلی وابکە نازانی سەیری کامیان بکا !الله تعالی ئەو پەند و ئامۆژگاریمان بۆ باس دەکا لەقورئانەکەیدا .

جا ئەلێ (أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)[196] بەراستی بەتەوحیدی الله بەیەکخوا پەرستی دلەکەت موتمەئین دەبێ ، زۆران زۆر خەلك دێن وباس دەکەن دەلێن ئەلێن کاکە زۆر بێ تاقەتین وەزع وحالم باش نیە دلم مورتاح نیە ، منیش پێ ئەلێم خۆت یەکلا بکەرەوە بۆ الله کەخۆت یەکلاکردەوە بۆ الله موستحیلە دلت مورتاح نەبێ چونکە الله تعالی وا دەفەرمووی (أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)تۆ یەکخوا پەرستبە بزانە دلت بۆ ئۆقەرو متمەئین نابێ .

[194] :سورة طه اية : ١٢٤
[195] :سورة الرعد اية : ٢٨
[196] :سورة الرعد اية : ٢٨

هەروا لەزیكری الله دا كە دوعا بكەی و ئیستغفار بكەی و لێی بپاڕێتەوە ئەمە پێنج جۆر بوو لەو زیكرانەی كە جۆرەكانیان باسكرا ،

ئینجا ئەفەرمووی :ئێوە ئەگەر ئاوەها زیكری الله بكەن الله تعالی لێتان خۆش دەبێ الله تعالی سەرفرازتان دەكا الله تعالی لەجەهەنەمەدا ئەتان پارێزێ .

وە الله تعالی دەفەرمووی : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا)[197] زۆر یادی الله بكەن ئەی ئیمانداران (وأثنى على أهله )یانی لەسەر ئەعلی زیكر زۆر وەسفی ئەهلی زیكری كردوە الله تعالی (وأخبر بما أكد له الجنة والمغفرة )تەئەكیدی كردۆتەوە كە هەركەسێك یادی الله بكاتەوە بەهەشت و لێخۆشبوونی خۆی ئەداتێ ، ئێستا لەلای خەلكی زۆربەی بەتایبەتی لەلای صۆفی و دەروێشەكان ئەوەیە كەوا دەفێكت بەدەستەوە بێ لەگەل تەپلێك تەق تەق لێ بدەیت !! من یەك پرسیار لەئێوە دەكەم یەك حەدیسم بۆ بێنن لە هەموو كیتابەكانی حەدیس پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەفێك یان تەپلێكی بەدەستەوە گرت بێ یەك حەدیسم بۆ بێنن ؟!بلێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەكاتێكدا زیكری ئەكرد دەف و تەپلی لێ ئەدا ، والله نایبینی و لاتان نیە ، ئەی ئەمە چۆن داهات ئاخر مەعقولە تۆ هەلپەریت و زیكری الله بكەی بە هەلپەركێوە بەتەپل لێدانەوە خۆ جەماعەتی هەلپەركێمان دانەناوە الله تعالی چۆن بەمە رازییە .یان لەمزگەوتەكان تەماشا دەكەی (لا اله الا الله)هەندێك سیفات و هەندێك شت بەكار دەهێنن كە لەحەدیس نەهاتووە ،

بۆنمونە سەر ئەجوولێنی بۆلای راست ئەلێ (لا اله )بۆ لای چەپ (الا الله)من تەحەدا ئەكەم یەك حەدیس بلێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وای كردبێ ئی لاواز و دروست كراو هەیە ، هاتووە لەریوایەت بەس ئەوە صەحیح نیە ئەلێ (كانوا يتلاومون)هەندێك لەو شتانەی كەوا بە لاوازی و بەدروست كراوی هاتووە خۆیان دەلەراندەوانێ وەكو دار و درخت زیكریان ئەكرد شتی وامان نیە لەحەدیس نەهاتووە هاتبێش صەحیح نیە ریوایەتەكان گشتیان لاواز و دروست كراون .

بەلكو دائەنیشم و زیكر ئەكەم كەستان تەحیاتان كردوە وابكەن كەستان لەنوێژدا وا دەكەن نوێژ گەورەترین زیكرە كەستان وادەكەن لەناو نوێژەكەیدا !؟كە تەحیات ئەخوێنن وا دەكەن ئەوە قسەكردنە لەگەل الله تعالی بەلكو زیكری الله بەگریان و بەبێ دەنگی و بەفرمێسكە .

ئینجا دوای ئەوە چەندەها ئەعدادایان داناوە تەسبحێكی هەزار دەنكی وا نالێ الله تبارك وتعالى وە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وانالێ ، ئەو زیكرانەی كە وارید بووە سەیر بكەن عەدەدی تایبەتی

[197]:سورة الأحزاب اية : ٤١

خۆیی هەیە هەر حەدیسێکی صەحیح عەدەدی دیاری کرابێ زانایان دەفەرموون کەم و زیادی مەکە ، بۆنمونە با بێنە لای نوێژەکان زیکری نوێژ لەوکاتەی سەلام ئەدەینەوە ئەوە سەلامان دایەوە جاری لەسەرەتا دا کێشەیەکی گەورە لەمزگەوتەکاندا هەیە ئەویش ئایا دەنگ هەلبرین یان نا لەکاتی زیکر خوێندنەکاندا !

إبن عباس لە صەحیحی بوخاریدا دەفەرمووی : ئێمە کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژ تەواو دەبوو بەوە دەمان زانی کە دەنگیان بەرز ئەکردەوە بە زیکر ، ئیمامی شافعی و ئیمامی نەوەوی ئیمامی ابن حجر لە فتح الباری هەموو ئەمانە شەرحی ئەکەن ئەفەرموون ئەوە لەکاتی خۆیدا بووە کە نەیانزانیوە بەس کە فێربوون ئیتر بێ دەنگ بوون بەبێ دەنگی ئەیان کرد هەتا نەیان دەزانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەموو صەحابە پێکەوە هەموویان دەنگیان بەرز ئەکردەوە هەتا دەنگی ئەدایەوە یەکێ لەدەرەوەی مزگەوتەکە بوایە گوێی لەزیکرەکە بوو ئەیزانی کە نوێژەکە تەواو بووە ئەوە إبن عباس وا دەلێ (كنت أعرف انقضاء صلاة النبي صلى الله عليه وسلم بالتكبير)[198] تەکبیر لێرەدا ئەوە نیە بلێ (الله أكبر )(سبحان الله والحمدالله ولا اله الا الله والله أكبر)

ئیمامی نەوەی دەلێ : (الإمام و المؤموم يخفيان ذكر إلا نحتج إلى تعليم)ئیمامی شافعیش هەموویان وادەلێن بەس نازانم ئەم ولاتەی ئێمە ئەلێ ئێمە شافعی مەزهەبین وە لەو دەبێ تۆ پێغەمبەر مەزەهەب بیت (صلى الله عليه وسلم)بەلام باشە بۆ بەقسەی ناکەیت ئەوە لە تەعزیەدا بۆ بەقسەی ناکەی خۆئەوانە هەر هەموویان بە حەرام و بەمەکروهیان داناوە بۆ بەقسەی ناکەی ناگەرێنەوە سەر کیتابەکان ئەوەتا ئیمامی شافعی ئەلێ ئەبێ دەنگ نزم بکەیتەوە نابێ دەنگ بەرزبکەیتەوە. ئەگەر لەفەرزێکیشدا دەنگت بەرزکردەوە ئەفەرمووی ئەبێ هەمووی دەنگی بەرزبکاتەوە ، ئێوە هەمووتان دەنگتان بەرز ئەکەنەوە لەدوای نوێژ و بلێن (سبحان الله،،،)وەرە با هەموومان بلێن (سبحان الله،،،)هەموو بەدەنگی بەرز ئەیلێن ؟! نەفەرێك لەمزگەوتەکە ئەلێ سبحانك سبحان الله ئینجا ئەوانیش ئەلێن سبحان الله !! دەلێ الحمدلله ئینجا ئەوان دەلێن کەی دەنگ بەرزکردنەوە ئاوا بووە لەزەمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)ئەگەر ئەتەوێت وەکو خۆیی بیکەیت وەکو خۆیی بیکە ئەگەر وەکو خۆشی ناکەیت مەکەیە ،ئیمامی شافعی لە مەوزوعەکە تێگەیشتوە ئەلێ ئەمە بەرزکردنەوەیە بۆ فێربوونە فێری بوویت بەدەنگی نزم ئەبێ بیکەیت هەر کەس بۆخۆیی ،

[198] : الكتب » صحيح البخاري» أبواب صفة الصلاة» باب الذكر بعد الصلاة:،،، رقم :٨٠٦

ئینجا لەسەر ئەمە کێشەیەکی گەورە گەورە هەیە لەهەموو سەردەمەکاندا دوای تابعیین ،ئەلێ ئەمە زیکر ناکا چونکە دەنگی بەرز ناکاتەوە !!چۆن زیکر ناکەین ئەوە دەرسەکەمان هەمووی باسی زیکری الله یە ئەلێ ئەم مزگەوتە زیکر ناکەن و حەزیان لە صەلاوات نیە !! والله روو رەش دەبی لەبەر دەمی الله دا ئەم قسەیە کە ئەکەیت، دینی ئێمە هەمووی نوێژ و صەلاوات و عیبادەت و خۆشەویستی و یادی الله یە بەس تۆ کاتێك ئەلێ زیکر ناکەی برۆ بزانە چەند الله لەدلتدا هەیە !! من بەس ئەم پرسیارەت لێ دەکەم بزانە چەند خوا لەژیانتدا هەیە وەرە بە تاقی تەنها الله بپەرستە بە هێمنی و خۆت بە الله تعالی وە مشغول بکە فرمێسك ببارێنە ئەوە یادی الله یە .

لە قورئاندا خوفیە و خیفە هاتووە خوفیە و خیفە بۆ زیکر یانی بە شاراوەیی لەگەل بەترسەوە الله تعالی ئەبیستی الله تعالی لەهەموو کەون و کائیناتی خۆیی شارەزاییە پێویست ناکا دەنگی بۆ بەرز بکەینەوە لەو شوێنەی کە پێت ئەلێ دەنگ بەرز مەکەرەوە دەنگ بەرز مەکەرەوە .

نمونە لەناو نوێژەکەدا دەهێنینەوە تۆ زیکری (سبحان رب الاعلی و سبحان رب العظیم)دەخوێنی دەتوانی دەنگ بەرز بکەیتەو ؟!!ناتوانی ونابێت .

ئەوەتا نوێژ کراوە بە دوو بەشەوە بەشێکی لەوانەی کە جەهرییە الحمدلله کە دەنگی پێ بەرز ئەکەیتەوە لە بەیانیان و مەغریبان و عیشایان لەنیوەرۆ و عەصردا ئەبێت دەنگ نزم بکەیتەوە ، بەومانایەی ئەم دینە هەمووی بە شەریعەت دەروا بەپێ ئارەزووەکەی تۆ نیە ئەبێ لەکوێدا وتی دەنگ بەرز بکەیتەوە بەرزی بکەیتەوە .

لەبانگدا ئەبێ دەنگ بەرز بکەین ؟!نابێ چونکە خۆی بانگ بۆ بانگ کردنی خەلکە ئەبێ دەنگ بەرز بکەیتەوە وە هەتا دەنگت بەرز بێ باشە .

بەلام ئەوانەی باسمان کرد لەکوێدا هاتووە دەنگت بەرزبکەیت دەنگ بەرز بکەوە لەکوێدا هاتووە دەنگ نزم بکەیتەوە دەنگ نزم بکەوە ئیتر ئەم هەموو عینادییە و خیلافەی ناوێی.

کەکاتێك لەسەرەتاوە دەست بە خوێندنی زیکری دوای نوێژ دەکەی دەلێ (أستغفرالله)هەر کەس لەجێگایی خۆیی سێ جار وا دەلێ (اللهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ)[١٩٩] دواتر (للهم أعني على ذكرك، وشكرك، وحسن عبادتك)[٢٠٠] ئەبێ ئەمانە بلێ ئەمە زیکرەکانی دوای نوێژە نەخوێندەوار و خوێندەوار هەمووتان خۆتان فێری ئەمانە بکەن بەم تەرتیبە برۆن ، دواتر (لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)دەواتر باقی زیکرەکانیتر ئەهێنی ئایەتی کورسی ئەخوێنی ،

[١٩٩] : أخرجه مسلم (٥٩٢)
[٢٠٠] : رواه أبو داود(١٥٢٢)

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموی: هەرکەسێك ئایەت الكرسى بخوێنی لەدوای نوێژە فەرزەکان لەنێوان ئەو بەهەشت دا هەر مردن ئەمێنێتەوە .

دواتر سبحان الله والحمدلله و الله أكبر چەند جۆرێکە :

جۆرێکیان هەیە ١٠ جارە ئیش و کارت هەیە ئەتەوێت زیکرەکەت تۆزێی زوو تەواو بکەی ئەتوانی ١٠ جار ئەم زیکرە بخوێنی (سبحان الله والحمدلله و الله أكبر)وەکو وتمان بەجوانی ولەسەر خۆیی بیلێت تۆ ئەلێ (سبحان الله) خوایە پاکی بۆتۆ لەشەریك لەعەیب تۆ هیچ عەیب و شەریکت نیە تۆ پاکی ئەی خوای گەورە .

جۆرێکیتریان هەندێك لەزانایان دەفەرموون : هەرسێکیان ١١ جار .

جۆرێکیتریان لەئەهلی علیم دەفەرموون :هەرسێکیان ٢٥ جار وە لێرەدا (لا اله الا الله)شی بخەرە سەر .

جۆرێکیتریان ٣٣ جار (سبحان الله و الحمدلله)بەلام ٣٤جار (والله أكبر)دەکەی .

جۆرێکیتریان : ٣٣جار (سبحان الله ،الحمدلله ، الله أكبر)وە جارێکیش (لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)ئەمە زیکرەکانە .

دەربارەی خوێندنی ئایەتی الكرسى زۆر ئەبینی کە ئایەتی کورسی ئەخوێنی فوو دەکا بەخۆیی دا داوای خوێندنی لەکوێی هێناوتە ؟هیچ کاتێك نەمان دیوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەحەدیسێکدا بلێ کە تۆ ئایەتی الكرسیت خوێند فوو بکە بەخۆتدا نیمانە ، من ئەمەوێی شتەکان وەکو خۆیی برۆن هیچ لامەدەن کەم و زیاد مەکەن لەحەقیاندا ، کەس ئەتوانی بلێ ئەوەم لەکوێی هێناوە ؟ناتوانن .

بەلام لەشوێنیتر هەمانە فوو بکەی بەخۆت دا لەوانە : کاتێك ئەچیتە سەر جێگا لەکاتی خەوتندا سورەتی (ئیخلاص و الناس و الفلق)سێ جار ئەخوێنی وله هەر خوێندنەکیدا فوو ئەکەی بەخۆتدا ئەمەمان هەیە لەسەر جێگادا ، یاخود کە نەخۆش بووی سورەتی الفاتحه یان سورەتی الناس و الفلق بەسەر خۆتدا ئەخوێنیتەوە یان بەسەر نەخۆشیکدا فووی پێدا ئەکەی ئەمەمان هەیە بەس نیمانە بۆ ئایەتی الكرسى یەك حەدیسیشم نەبینیوە رجا ئەکەم کێ بنیوەتی بامنیش وەکو ئەو بکەم .

شتێك مەکە زیادە بێ لەدین ، ئینجا رەنگە تۆ بلێ سەیری ئەم کەسە بکە لەسەر شتێکی سادە چی دەکا مەسەلەکە سادەی نیە مەسەلەکە دینی الله یە ئەوەت هێنا ئەگەر بەعیلم هێنات باشە ئەگەر بەبێ عیلم هێنات من دەلێم کاکە تۆ بێ عیلمی لەکوێت هێنا ؟!

پاشان خوێندنی سورەتەکانی (ئیخلاص و الناس و الفلق)لەدوای نوێژە فەرزەکان یەك جار یەکجارە نەهاتوە سێ جار یەکجار یەکجارە .

پاشان ئاگاداربن بەنیسبەت زیکرەکانەوە ئەوانەی کەوا زیکر ئەکەن بە پەنجە زیکر بکەن لەکاتی دوایی نوێژەکان تەسبیحێك دەر ئەهێنی تەق تەق یاخود لەکاتی جومعەدا ئەبینین ئەم تەسبیحە ئەیا بەیەکدا ئەمە نابێ لەکاتی جومعەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : (من مس الحصى فقد لغا)[٢٠١] بۆخۆم چەند جار گوێم لێ بووە چاویشم بینیویەتی تەسبیحەکەی دەرهێناوە و یاری بەتەسبیحەکەی ئەکا یان تەسبیحە دەنك گەورەکان تەقەی دێ ئاگای بەخۆیی نیە و رۆیشتووە بزانە خەیالی بۆ کوێی رۆیشتووە ئەوانەی زیاتر تەسبیحیان بەدەستەوەیە خەیالیان ئەروا و رۆیشتووە ئەگەر تەسبیحیان لەدەست نەبێ نازانی و ئاگای لەخۆیی نامێنی و ئەلێ شتێکم لێ بزر بووە ئێ کاکە تۆ وەرە یادی الله بکە بزانە هەست دەکەی هیچت لێ بزر بووە ! ؟بە تەسبیح مەیکە بەلکو بە پەنجەکانت بیکە .

عەمری کوری عاص (رەزای الله تعالى لێ بێ ) دەفەرمووی (يعقد التسبيح بيمينه)[٢٠٢] پێغەمبەری خوام بینی (صلى الله عليه وسلم) بەدەستی راستی و بەپەنجەکانی تەسبیحاتی دەکرد .

ئاداب و لەسەر رۆیشتنی زیکر زۆر زۆرە حەزم کرد ئەمە باس بکەین بۆ ئەوەی راستی بکەینەوە بۆ یەکیتریی لەناو مزگەوتی موسلماناندا راست بکەینەوە لەو هەلانەی کەوا تێ دەکەوین .

زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران بەهەمان شێوە زیکرەکان لەبەر بکەن ئەگەر لەبەریشت نیە پەری بچوك بچوك هەیە لەسەری بخوێنەوە ئینجا ئەگەر تۆ مانگێك هەر بیخوێنێتەوە هەر لەبەری ئەکەی .

الله تعالى مەتحی ئەهلی زیکری کردوە ئەفەرمووی : (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا)[٢٠٣] ئەوانەی کە موسلمانن و تەسلیم بە الله بون و تەسلیم بە شەیطان و بەندەکان نەبوون ، موسلمان یانی تەسلیم بە الله بوون واتا تەسلیم بووە بە الله تەسلیم نەبوە بە بەندە و شەیطان و پارە و ئارە زوو و هەوا و دینا و دونیا وە بەشتەکانیتر ، جا والله ئەگەر ئەم سیفەتانە نێتە ناو تۆوە ئەم ئەجرە گەورەیە تووشت نابێ .

موسلمانەکان ئەوانەی تەسلیم بە الله بوون تەسلیم بەکەسیتر نابن ئیمانداران ئەوانەی تەنها ئیمانیان بە الله یە ئیمانیان بەشتی تر نیە (وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ)ئەوانەی ئیتاعەی الله ئەکەن جا ئەمە هەمووی پیاو و ژنی باس کردوە (وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ)راستگۆیان لە پیاوان و ژنان (وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ)ئەوانەی بەئارامن لەسەر عیبادەتی الله وەلەسەر نەکردنی گوناهەکان وە لەسەر ئەو

[٢٠١] : رواه إبن ماجة(١٠٢٥)
[٢٠٢] : رواه أبو داود والبيهقي
[٢٠٣] :سورة الأحزاب اية :٣٥

نارەحەتیانەی کەوا بەسەریاندا دێی لە پیاوان و لە ئافرەتان (وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ)ئەوانەی ئەترسن لە پیاوان و لەئافرەتان کە لە الله تعالی بەتەنها ئەترسن (وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ)ئەوانەی کەوا دەبەخشن لەپێناوی الله تعالی دا چ لەپیاوان وە چ لە ئافرەتانیش ، ئاگاداری ئافرەتان بن ئا لەم ئایەتەدا تیبنیەکەم هەیە:

بەتایبەتی لەسەر زەکات و خێرو سەرفترە و خێر : زۆربەی ئافرەتان زەکات نادەن ئاگادارین لە خشل و لەزێرەکانیان ئایەتەکە ئەڵێ (وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ)با ئافرەتان زەکات بدەن لە خشلەکانیان با صەدەقات و خێر بکەن ئافرەتی وا هەیە پیاوەکەی بۆیی ئەدا خۆیی نایکات والله جیاوازە پیاوەکەت بۆ گۆری خۆیی تۆش بۆ گۆری خۆت تۆ برۆ خێری خۆت خۆت بیکە کاتێك کەسێك ئەکەی بە وەکیل ئاساییە بەس مەڵێ پیاوکەم ئەوەندە زێرەم هەیە برۆ زەکاتەکەم بۆ بدە کەواتە تۆ ئەوکاتە زەکاتت نەدا لەمالی خۆت نەتدا چونکە دەڵێت لەمالی خۆت بیدە با تۆش بیت بە(وَالْمُتَصَدِّقَاتِ) پیاوکەت خێردەکا تۆش خێربکە .

(وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ)ئەوانەی بەرۆژوو دەبن و بەرۆژوون لە پیاوان و ئافرەتان (وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ)ئەو پیاو و ژنانەی لە زینا وە لەدەرخستنی حەورەت و جێ شەرمیان خۆیان دەپارێزن ، ئەها ئەمرۆ سەیر بکەن حەورەت ماوەتەوە نەبینرێی ! ؟تخوا من پرسیارێك لەئێوە دەکەم هەر بەسەراحەت وەلام بدەنەوە ژن بە رووت و قوتی یاخود بەو جل و بەرگەی کاسیات و عاریات خەلك زیاتر سەرنجی لێ ئەدا والله لەوانەیە رووت و قوت بێ سەرت دانەوێنی و بلێ عەیبە بەس کاتێك خۆیی ئەرازێنێتەوە ئەو پەریی خەلك شوێن خۆیی ئەخا ئەمرۆ وایە (وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ)جێ شەرمی خۆیی بپارێزی وە عەیب و عاری خۆیی بپارێزی لەزیناو لەوەی خەلك سەیری بکا.

(وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ)ئەوانەی یادی الله دەکەنەوە لە پیاوان و لەئافرەتان زۆریش یادی الله دەکەن کەم نا بەلکو زۆر ئینجا دەفەرمووی : (أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا)الله تعالی لێیان خۆش دەبێ وە ئەجرێکی زۆر گەورەیان بۆ داناون .

أبن القيم دەفەرمووی :(وأما خسران من لها عنه )ئینجا دواتر باسی ئەوە مان بۆ دەکا کەوا کێ خەسارەت مەندە ئەوەی خۆیی مەشغول بکا لەغەیری زیکری الله وە .

ئێستا پرسیارەکەمان ئەوەیە : زیکری الله وە زیکری غەیری الله چەند زۆرە کەسان هەن زیکری الله دەکەن وە لەگەلیشدا زیکری غەیری الله دەکەن وەش شەریکە پەنا بە الله تعالی، هەشە هەر زیکری الله ناکا

ئەوەندەی کەوا باسی عەمر و زەید و فلان وفیسار ئەکا ئەوەندە باسی الله تعالی ناکا جا ئەلێ ئەوە خەسارەت مەندە .

سەیری ئەم ئایەتە بکەن الله تعالی لەسورەتی المنافقون یانی دووروان هێناویەتی باش ئاگاداربن الله تعالی دەفەرمووی : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ)[٢٠٤] ئەی ئیمانداران مال و مندالتان بێ ئاگاتان نەکا لەیادی الله تعالی ئەمرۆ زۆربەی مال و مندال بێ ئاگای کردووین یاخود نا ؟! با بێ ئاگاتان نەکا لەیادی الله تعالی (وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ)هەرکەسێك مال و مندال بێ ئاگای بکا لەیادی الله تعالی لەتەوحید و یەکخوا پەرستی لەزیکر کردنی الله لەنوێژ و رۆژوو وە لەعیبادەتەکەی ئەوە خەسارەت مەندە ئەم کەسە ،

ئیتر لەوە خۆشەویستر نیە لەمال و مندال لەخۆشەویسترین شتەکانی تۆیە ئەگەر ئەمە مەشغولت بکا خەسارەت مەندی ، کاتی نوێژ دێت وەرە بۆ نوێژ رۆژووە رۆژوو زەکاتە زەکات وە قورئان خویندن قورئان خوێندن ئەلێم کاکە لێرە سونەتەکە مەکە لەمزگەوت برۆ بۆ مالەوە ئەلێ بەخوا مال و مندالەکەم نایەلن و مەشغولم ئەکەن ئێ بۆ مەشغول ئەبی تۆ فێریان بکە تۆ لەمندالیەوە فێرت نەکردون ئەبێ ئێوە مندالەکانتان لەحەوت سالی لەگەل خۆتاندا بهێنن بۆ مزگەوت لەگەل خۆتدا بیهێنت و فێری بکەیت وە بیبەیتەوە بۆ مال بلێ کورم سونەتەکە لێرە خێری یەك دەرەجەیە لەمالەوە خێری ٢٧دەرەجەیە بابەیەکەوە لەمالەوە سونەتەکە بکەین دەی مال و مندال دەی سونەتەکەتان بکەن ، بەس تۆ کە ئاگات لەمال و مندالت نیە و پێ نالێ نوێژ بکە و ئەمر بە معروف و نەهلی لەمنکر ناکەی  لەمالەکەت دەنگی تەلەفزیۆن و گرمە گرم ئەرێی والله بچیتەوە مالەوە نوێژت بۆ ناکرێی خەتاکەی هی خۆتە ئەوە تەربیەتەکەی خۆتە مالەکەی خۆت نەکردوە بە جێگەی عیبادەت نەکردوە بەجێگەی ئەویە مال و مندالەکەت الله تێدا بپەرستن ، من هەموو جارێك مالێك ئەبینم کە تازە دروست ئەکرێی و ئەلێم خوایە ئا ئەم مالە بکەی بەجێگەی عیبادەت بۆ ئال و بەیتی ئەم مالە خوایە عیبادەتی تۆیی لێ بەرزببێتەوە خوایە نەبێتە هۆی فسق و فجور .

بەس ئایا ئێمە ئەوها تەربیەتی مال و مندالمان داوە چەند جار پێیان وتوم مامۆستا کە ئەچمەوە بۆمالەوە نایەلن نوێژەکە بکەم مال و مندال نایەلن بۆچی نایەلن خۆت مەسئولی .

پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : مالەکانتان مەکەن بەسەر قەبران برۆن نوێژە سونەتەکانتان ببەنە ئەوێی .

[٢٠٤] :سورة المنافقون اية ٩:

جا لێرەوە داوا و رجاتان لیٚ دەکەم نوێژی سونەت لەمال خێری زیاترە لەدوای نوێژی فەرز نوێژە سونەتەکانتان ببەنەوە بۆ مالەوە بەلکو لەمزگەوتەکاندا زیکر بکەن من سەیر دەکەم کەسی وایە هەیە یەکسەر هەلدەستەوە و نوێژی سونەتەکەی دەکا کاکە هەلەی هەلە زیکر بکە ئەو زیکرانە بکە کە باسمان کرد بەو تەرتیبەی کە باسمان کرد .

إبن القيم دەفەرمووی :(وأما جعل ذكره لهم جزاء لذكرهم له)[٢٠٥] ئەفەرمووی الله تعالى لەقورئاندا بۆمان باس دەکا (**فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ**)[٢٠٦]هەرکەسێك یادی الله بکا الله تعالى ش یادی الله دەکا جەزای ئەو زیکرەی تۆ ئەو یادەی تۆ بۆ الله تعالى جەزەکەش ئەوەیە الله تعالى یادی تۆ دەکا لەلای گەورە مەلائیکەتەکانی ئاسمان کاتێك کە تۆ ئەلیٚ (سبحان الله) ئەلیٚ ئەها بەندەکەم یادی من دەکا .

هەر مەجلیسێك کە تۆ دائەنیشی و یادی الله تێدا دەکەی لە حەدیسدا هاتووە الله تعالى لەلای مەئیکەتەکان پێیان ئەلیٚ ئائەوانە یادی من دەکەنەوە منیش لێیان خۆش دەبم وە رەحمەت دەبارێنم بەسەریاندا کەواتە تۆ جێی یادی الله تعالى ، وە الله تعالى کەسی لەبیر ناچیٚ ئەوەی یادی بکا و یادی نەکا لەبیری ناچیٚ بەس مەبەستمان رەحمەت و مەغفیرەت و بەرەکەت و لێخۆشبوونەکەی الله تعالى یە ، رووت تیٚ دەکا .

الله تعالى دەفەرمووی : (**فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ**)یادی من بکە من بەیەك بزانە بەقسەی من بکە لەمن بترسە ومنت خۆش بوێی بەس بەقسەی من بکە منیش تۆ لەبیر ناکەم رەحمەت و بەزەیت بەسەردا دەبارێنم لەدونیاو لەقیامەت (**وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ**)شوکرم بکە من نیعمەتەم داوە بەتۆ شوکری من بکە شوکری غەیری من مەکە ، یانی لەمنی بناسە پێش هەموو شتێك ئینجا کاتێك کە یەکێك چاکەت لەگەل دەکا شوکرو سوپاسی ئەویش بکە یەکەم جار شوکری الله تعالى بکە .

لەحەدیسدا هاتووە دەفەرمووی : ئەو کەسەی شوکری خەلك نەکا شوکری منی نەکردوە ، لەبەرامبەر ئەو چاکەی لەگەلتدا دەکرێی لەلایەنی خەلکیەوە کەتۆ ئەبیٚ لە الله یەوە بناسیی . ئەوە جیاوازە ئەم حەدیسە ئاگاداربە ، یانی کەسێك چاکەت لەگەلدا ئەکا تۆش شوکر و سوپاسی دەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : ئەوەی شوکری خەلکی نەکا لەسەر چاکەیەك کە لەگەلیدا ئەکرێی ئەوە شوکری الله ی نەکردوە.

[٢٠٥] : مدارج السالكين :ص١٤٤
[٢٠٦] :سورة البقرة اية :١٥٢

بەس ئایەتەکە لێرەدا مانای (وَاشْكُرُوا لِي)من نیعمەتی ئیمانم داویەتی من نیعمەتی خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ ژیانم داویەتی تۆش شوکری من بکە (وَلَا تَكْفُرُونِ)کوفرانی نیعمەتی من مەکە کوفرانی دین و ئیمان مەکە من الله ی تۆم و من تۆم دروست کردوە .

هەروەها دەفەرمووی : (وأما الإخبار عنه بأنه أكبر من كل شيء)زیکری الله لەهەموو شتێك گەورەترە .

الله تعالی دەفەرمووی : (اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ ۖ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ)[٢٠٧] الله تعالی ئەمر دەکا بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەویشەوە ئەمر دەکا بە ئێمە بخوێنەوە ئەو وەحییەی بۆتان هاتۆتە خوارەوە ئەو قورئانە بخوێنەوە (اتْلُ)مەعانی زۆرە یەك لەمەعانیەکانی ئەوەیە : شوێنی بکە و بەقسەی بکە و کاری پێ بکە (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ)یەکسەر باسی نوێژ دەکا چەند گەورەیە نوێژ ! !وەکو چەند جار بۆم باسکردوون ئەلێن بابەتی نوێژ زۆر گەورەیە گەورەترین عیبادەتی بەدەنییە نەکردنی کافربوونە تەمبەلی و ئەوشتانە ناخوا تێدا ئەلێن تەمبەلە و تاقەتی نیە و براوی بەخوا هەیە بروای بەنوێژ هەیە بەس تاقەتی نیە ! والله وەکو شەیطان وایت شەیطان براوشی بە الله هەبوو سوجدەی نەبرد کافربوو ئیتر حیسابی خۆت باش بکە .

پاشان ئەفەرمووی : (إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ)نوێژەکان کە تۆ ئەیکەت وات لێ ئەکا واز لە فحشا و منکر بێنی، ئەها ئینسانی نوێژ کەر تۆ سەیری بکە هەموو رۆژی بەلایەنی کەمەوە پێنج جار نوێژ دەکا و روو دەکاتە الله و الله تعالی لەیادە وە الله تعالی بیر ناچێتەوە گەر یەکێك یادی الله بکا الله تعالی بیر ناچێتەوە و ئەزانێ و حەلال و حەرامەکان ئەپارێزی خراپەکان ناکا ئەی ئەگەر نەیکا وەرە پێم بلێن ئەو پیاوەی هەلدەستێ لەژیانی نازانێ دەست و نوێژ و زیکر چیە بۆگەناتی ژیانی ئەم کەسە ئەبێ چۆن بروا ! الله ی لەبیرە ؟! حەلال و حەرامی لەبیرە ؟! والله چەندەهام بیستوە ئەلێ من بەحەرامی ئەیخۆم ئەلێ نوێژی چی و رۆژووی چی ! ! دەست دەکا بەم قسانە .

ئەمە لەکێ و پاك و تەمیز و تەوحید و زیکری الله تعالی لەلای ئەم کەسەدا هەیە ئەمە لەکوێی ئیماندارە .

ئەفەرمووی : (وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ)لەمانای ئەم ئایەتە زانایان چەند مانایەکیان لێك داوەتەوە:

یەکەم : زیکری الله لەهەموو شتێك گەورەترە بۆمان دەرکەوت وتی (أن ذكر الله أكبر من كل شيء)هەتاوەکو لە حەدیسدا هاتووە دەفەرموی : لەجیهاد کردن و خۆت بدەیت بە کوشت لەپێناوی الله تعالی دا گەورەترە لەبەخشینی ئالتون و زیر و زیوو گەورەترە .

[٢٠٧] سورة العنكبوت اية : ٤٥

دووەم: ئەڵێن ئەم مانایەی واتا تۆیادی الله تعالى دەكەی بەس ئەگەر الله تعالى يادی تۆ بكا ئەوە گەورەترێكە لەیادەكەی تۆ ، یانی تۆ یادی الله دەكەی الله تعالى ش دەفەرمووی: (أَذْكُرْكُمْ)ئەوەی الله تعالى گەورەترێكە لەتۆ كە مەغفیرەت و لێخۆشبوونە ، یانی زۆر كەس هەیە یادی الله دەكا بەس الله تعالى لێ قبول ناكا ، گرینگ ئەوەیە الله تعالى یادی تۆ بكا ئەوە گەورەكەیە وەكو لەباسی خۆشەویستیدا وتمان راستە زۆر كەس ئەڵێ الله م خۆش دەوێی بەس الله تعالى ئەو كەسەی خۆش ناوێی چونكە هەڵوەشێنەرەوەی ئیمانی تێدایە لەبەر ئەوەی شیرك و گومرایی تێدایە بەخۆیی نازانێ شەیطان هەڵی خەڵەتاندووە شەیطانی كردوە بە ئەولیای خۆیی وا ئەزانی مهتدا الله تعالى وا دەڵێ لەقورئاندا (وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ)[208] ئینجا بانگەشەی خۆشەویستی الله دەكا بانگەشەی زیكری الله دەكا ئەڵێ ئەمە گرینگ نیە بەڵكو گرینگ ئەوەیە كە الله تعالى یادی تۆ بكا .

ابن القيم دەفەرمووی : (جعله خاتمة الأعمال الصالحة)لەقورئاندا سەیر بكەن هەرعەمەلێكی صالحی باس كردبێ زیكری بەدوایدا هێناوە الله تعالى سەیری ئەم ئایەتانە بكەن :

(وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ)[209] رۆژووی رەمەزان كە ئەیگرین لەكۆتاییەكەیدا (وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ)كە رەمەزاننتان تەواو كرد (الله أكبر )بكەن شەوەكەی ئەیكەن وە بەیانیەكەی دەست دەكەن بە الله أكبر و زیكر كردن ئەلەوێدا بەدەنگی بەرزیش دەكرێی چونكە سونەتە بەدەنگی بەرز بكرێت ، كۆتایی ئەم هەموو رۆژە لەم مانگەدا كە پرییەتی لە خێر و صەدەقە و رۆژووە بەزیكری الله ئەكرێی (وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ)ئینجا الله أكبر بكەن بەدەنگی بەرز كە الله تعالى هیدایەتی دان بۆ ئەو رۆژووە بۆ ئەو تەوحیدە و بۆ ئەو عیبادەتە (وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ)ئا بەمە ئێوە شوكری الله تعالى دەكەن .

باسی حەجمان بۆ دەكا الله تعالى دەفەرمووی : (فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا)[210]ئەڵێ ئەگەر مناسكی حەجتان تەواو كرد لەكۆتاییەكەیدا بكەونە زیكری كردنی الله تعالى چۆن یادی باو باپیرانتان دەكەنەوە لەوە زیاتر یادی الله تعالى بكەن .

ئەڵێ كاتی خۆیی قوریش دائەنیش باسی مفاخیر و گەورەییەكانی با و باپیرانیان ئەكرد دائەنیشتن هەر باسیان ئەكردن ، الله تعالى ئەڵێ : ئێوە یادی الله تعالى بكەن كەمترین شت وەكو باوكتان چۆن باسی مفاخیری باوباپیرانیان ئەكرد بەڵكو لەوە گەورەتر باسی الله تعالى بكەن، ئەوەش حەج .

[208] : سورة الزخرف اية : ٣٧
[209] :سورة البقرة اية : ١٨٥
[210] :سورة  البقرة اية : ٢٠٠

باسی نوێژ دەکا الله تعالی دەفەرمووی : (فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ)[٢١١] ئەگەر نوێژت تەواو کرد یادی الله بکە (قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ)بەهەموو شێوازێك بەپێوە بەدانیشتان و بەراکشان ئەوەش نوێژ .

ڕۆژی جومعەی بەزیکر تەواو کرد الله تعالی دەفەرمووی : (فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)[٢١٢] ئادەی بزانم بەشی زیکری الله لەدوای تەواو بوونی نوێژی جومعەکانی ئێمەدا چەنێکە ؟! هەمووتان سەیربکەن ، نەخێر بەلکو سەیرانە بەلکو هەلپەرکێ یە نەخێر بەلکو هەل هەلەیە نەوالله گۆرانییە ، تخوا ڕۆژانی جومعە وانیە لەدوای نوێژی جومعە زۆربەی خەلك وانیە ؟!نەخێر بەلکو الله تعالی پێت ئەلێ (وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا)بەتایبەتی سەعاتێك هەیە لەئاخیری ڕۆژی جومعەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەفەرمووی : هەرکەسێك لەوکاتەدا دووعا بکە الله تعالی لێ وەردەگرێی وە لێ قبول دەکا کەپێش مەغریبە بەسەعاتێك لەڕۆژی جومعەدا .

ڕۆژی جومعە ڕۆژی زیکرە و ڕۆژی یادی الله یە ، بەس لای ئێمە ڕۆژی هەمووشتێکە بەس یادی الله نا هەتاوەکو جومعەکەش بەجێ دەهێلین بەیانی دێ لەگەل بانگی بەیانیدا ئەچن بۆ سەیران ، ئادەی بزانم لەو دەشتە چی دەکەی مەرێکت خوارد و هەلپەرکێت کردوو ئەو پەریی موسلمان بی ئەلێ والله خۆشبوو هەندێك گۆانیمان گوێی گرتووە ئەی قورئان ئەی جومعەکەت ئەی یادی الله کەت ئەو ڕۆژە گەورەت بۆ لەدەستە خۆت دا گەورەترین ڕۆژی هەفتە جومعەیە بۆ لەدەست خۆتی ئەدەی .

باشە بیخەرە تەرازوێکەوە سەیران خۆشە یان زیکری الله ؟! بۆ عاقیبەتت کامیان باشە ؟بەداخەوە بەتایبەتی لەبەهارەکاندا ئەگەر ئێوە سەرنج بدەن مزگەوتەکان بەتالیان پێوە دیارە .

(وأخبار عن أهله بالانتفاع بآياته) الله تعالی پێمان ڕادەگەیەنی ئەو کەسەی ئەهلی زیکر بێ ئەو کەسانە ئیستفادە دەکەن لەئایەتەکانی (وهم أولو الألباب والعقول دون غيرهم)ئەوانە خاوەنی عەقلن ئەوانیتر عەقلیان نیە .

الله تعالی دەفەرمووی : (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ)[٢١٣] بەڕاستی لەدروست بوونی ئاسمانەکان و زەویدا وە لەجیاوازی نێوان شەو و ڕۆژدا کە بۆخۆتان ئەیبینن ئەمە چەندها بەلگەی لەسەر وەحدانیەتی الله تعالی تێدایە لەسەر ئەوەی کە الله تعالی بەتەنها خۆی ئەم ئاسمان و زەوییە دروست کردوە چونکە ئەگەر خوایەکی تر هەبوایە لەگەل الله دا ئەو بونەوەرە

[٢١١] :سورة النساء اية : ١٠٣
[٢١٢] :سورة المنافقون اية : ١٠
[٢١٣] : سورة ال عمران اية : ١٩٠

تێك ئەچوو جا كەواتە ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی كە یەك خوا هەیە و ئەرز و ئاسمانی دروست كردوە جیاوازییەكانی نێوان شەو و رۆژ كە قەد ناگۆرێی شەو و رۆژ هەر ٢٤ سەعات بووە ئەگەر دوو خوا هەبوونیایە ئەو دەیوت نا بازیاتر بیٚ ئەویتر دەیوت نا با كەمتر بیٚ ئەمە دەلیلە لەسەر ئەوەی كە الله تعالی یەكە ، جا ئەم ئایەت و بەلگانە (لِأُولِي الْأَلْبَابِ)بۆ كەسێك كە عەقلی هەبیٚ ئینجا دەفەرمووی : (الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ)[٢١٤] ئەوانەی یادی الله دەكەن بەلام بە چ شێوازێك (قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ)بەپێوە بن هەر یادی الله دەكەن دابنیشن هەر یادی الله دەكەن رابكشێن هەر یادی الله دەكەن ، یانی ئینسان هەر لەو سیٚ حالەتەدایە یان بەپێوەی یان لە بەدانیشتەوەدایی یان بە راكشانەوەی ،سەیری بكە لە هەر سیٚ حالەتەكەدا داوات لیٚ دەكا یادی الله تعالی بكەی بۆ هەریەكێكیش لەو حالەتانە چەندەها زیكر و ئەزكار هەیە لەكیتاب و لەسونە .

**ئیمامی موجاهید دەفەرمووی :** (لا يكون من الذاكرين الله كثيرا والذاكرات حتى يذكر الله قائما وقاعدا ومضطجعا. )[٢١٥]

ئەگەر تۆ ببی بەو كەسانەی كە الله تعالی موژدەی لێخۆشبون و گەورەترین ئەجر و پاداشتت ئەداتیٚ هەروەكو باسمان كرد (وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا)[٢١٦]ئەلیٚ ئەگەر ئەتەوێت لەوانە بی لەسەر هەر سیٚ حالەتەكەش هەر یادی الله بكە بەپێوە بووی هەر یادی الله بكە ،پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) لەماوە بچوبایەتە دەرەوە لەماڵەوە یادی الله دەكرد وە زیكری الله دەكرد وە كاتێك ئەهاتەوە بۆ ماڵەوە یادی الله دەكرد لەدانیشتندا یادی الله دەكرد لەپاڵكەوتندا یادی الله دەكرد وەكاتێك ئەخەوت یادی الله دەكرد وە كاتێك هەلدەستا یادی الله دەكرد .

(وجعل قرينه جمع الأعمال قرين جمع الأعمال صالحة ورحها) الله تعالی وای كردوە ئەم زیكرەی كردوە بە هاودەم لەگەل هەموو ئەعمالەكانیتردا وە رۆحی هەموو عەمەلێكە لەو عەمەلانەی كە الله تعالی لەسەر ئێمەی داناوە .(فمتى عمدته كانت كلجسد بلا روح)هەر عەمەلێك بەبیٚ زیكری الله بیٚ وەك جەسەد وایە بەبیٚ رۆح ، هەتا ئینسان خۆیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : ئەو كەسەی یادی الله دەكا وە ئەو كەسەی یادی الله ناكا وەك زیندوو و مردوو وایە . بۆخۆشتان ئەزانن یەك لەنیشانەكانی منافیق ئەوەیە كەوا كەم یادی الله دەكەن ،یادی الله دەكەن ئەوانیش بەس كەم (وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا)[٢١٧] موونافیق وایە ، جا بۆ ئەوەی تۆ لەسیفەتی موونافیق دوور كەویتەوە زیكری الله زۆر بكە

[٢١٤] :سورة ال عمران اية : ١٩١
[٢١٥] أوردهما النووي في الأذكار (ص:١٠) .
[٢١٦] سورة الأحزاب اية : ٣٥
[٢١٧] :سورة النساء اية : ١٤٢

(وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ)ژنان و پیاوانێك كەوا زۆر زیكری الله دەكەن (أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) .

سەیربكەن الله تعالى دەفەرمووى : (إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي)[٢١٨] الله تعالى بە پێغەمبەر موسا دەلێ ، تەبعەن لەگەل هەموو بەندەكانیشى ئەلێ ، ئەفەرمووى : بەراستى هەر من خوام كە كەس شایستەى پەرستن و سەمع وطاعە بۆكردن نیە جگە لە من نەبێ ، چونكە خۆیى بونەوەرى دروست كردوە ئێمە هى ئەوین و ئێمە بەندەى ئەوین ئێمە ئەبێ بەقسەى ئەو بكەین ئێمە ئەبێ ملكەچ بین بۆ ئەو ئێمە ئەبێ سوجدە و ركوع هەموو زیكر و یادێكمان بۆ ئەو بێ بەلام بەداخەوە ئەمرۆ ئەبینى تەنانەت كەلیمەى سجود و ركوعیش بۆ ئینسانەكان ئەبرێت هەر بەئاشكرا ،ئەلێن سەرى رێز و نەوازش دائەنوێنین بۆ بەندەكان ! ! نابێ بۆ بەندەكان دابنێنن با پێغەمبەریش بێ (صلى الله علیه وسلم).

معاذى كورى جەبەل سوجدەیەكى رێزى بۆ پێغەمبەر برد (صلى الله علیه وسلم)فەرمووى نابێ سوجدەى عیبادەت نەبوو بەلكو سوجدەى رێز بوو ، پێغەمبەرى خوا (صلى الله علیه وسلم) فەرمووى نابێ ، سوجدە دروست بووە لەكاتى خۆیدا ببرێت ئەوەتا مەلائیكەتەكان سوجدەیان برد بۆ ئادەم ئەوەتا شەیطان لەسەر ئەم سوجدەیە مالى خۆیى وێران كرد كە سەجدەى رێز بوو نەك سەجدەى عیبادەت لەناو هەموو ئومەتەكانیشدا ئەم سوجدەیە هەبوو هەتا پێغەمبەر یعقوب ئەوە بوو كە پێغەمبەر یوسفى بوو پاشان ئەو نیزاعە كەوتە نێوان خۆیى و براكانى پاشان چوون بۆ میسر دواتر هەموویان چون بۆ میسر و سوجدەیان برد بۆ یوسف ئەمە هەمووى رێز بوو ، ئەمە هەتاوەكو زەمانى پێغەمبەریش مابوو (صلى الله علیه وسلم) كە معاذ چوو بۆ یەمەن و هاتەوە سەیرى كرد سوجدە ئەبن لەشام بۆ قەشەكان ئەمانە ئەویش وتى پێغەمبەر بەرێزترە بۆ ئەوەى سەجدەى بۆ بەرم . فەرمووى مەكە معاذ دروست نیە ئەم سوجدەیە ببرێت تەواو لەئێستاوە ئەم شتە نەسخ بوویەوە ئەم شتە نەما ئەگەر دروست بایە ئەمرم ئەكرد بە ژن سوجدە بەرن بۆ پیاوەكەى بەس دروست نیە ،.

كەواتە سوجدە بردن عیبادەت كردن بەقسە كردن هەموو شتێك لەو بابەتانە ئەوە شایستەى الله تبارك وتعالى یە تایبەت مەندكراوە بە الله تعالى وە .

فەرمووى : (فَاعْبُدْنِي)تۆ ئەمن بپەرستە (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي)[٢١٩] تۆ بۆ ئەوە وەرە ناو نوێژەكەوە تاوەكو یادى من بكەیتەوە ، خۆشەویستانم كە دێنە ناو نوێژەوە هەموو دونیا فرێى بدەن ، دونیا هیچ نیە بەلكو هەر ئەوەیە كە ئەیخۆیت و لەبەرى دەكەیت دونیا هەر ئەو پارە و ئافرەتە یە كەلەبەردەستت دایە

[٢١٨] :سورة طه اية : ١٤
[٢١٩] :سورة طه اية : ١٤

واز بێنە ئەوە هەموو شتێکی براوەیە و بەجێ ئەهێلی وەرە بۆ یادی ئەو الله تعالی یە کە تۆ گەورەترین غایە و ئومەی تۆ ئەوەیە بەس بیبینی ، ئەگەر ئێستا بلێن گەورەترین هیوایەتی تۆ چیە وانالێ ؟!ئەلێ بەس خۆزگە الله تعالی م بینیبایە تەواو هیچترم ناوێی !! دە کەدێتە ناو نوێژەکەت ئەوها وەرە ناو نوێژەکەت وەکو باسمان کرد کە تۆ قسە لەگەل الله دەکا شعور و هەستت هەبێ کە الله تعالی قسەت لەگەل دەکا نەك ئاگات لەنوێژەکەت نەبێ و ماناکەی نەزانی خوا خوات بێ لێ بێتەوە تاوەکو زوو لێبێتەوە و رابکەیت بۆ دەرەوە .

لەحەدیسێکی قودیسدا هاتووە پێغەمبەر دەفەرمووی : (صلی الله علیه وسلم) الله تعالی فەرموویەتی : من مالم ناردۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی نوێژ بەجەماعەت بکرێی و زەکات بدرێی مالم بۆ ئەوە ناردوە ، کەچی ئەمرۆ بەعکسەوە مال هاتووە بۆ ئەوەی نوێژ و زەکات هەموو لەناو بچێ ئەوەتا ئەگەر خاوەن مالەکان ئەگەر بەس زەکاتیان بدابایە کەس فەقیر نەدەما پێویستیمان نەدەبوو بە نەتەوەیەکگرتوەکان بەولا و بەملا یان بە فلان وفلان لەدەستی کافر داوا بکەین ، والله بەس زەکاتی شەریعی دابەشکرایە وەکو خۆیی هیچ فەقیر نەدەما و کەم دەبوویەوە .

لەدینەکەماندا هەموو شتێکی تێدایە دواتر إبن القیم  دەفەرموی : (وقرنه بالصيام وبالحج ومناسكه ، بل هو روح الحج ولبه ومقصوده)الله تعالی زیکری بەستۆتەوە بە رۆژوو وەکو باسمان کرد بەحەج بەمەناسیکەکانی بەلکو رۆحی حەج هەموو زیکری الله تعالی یە بزانە شەو ورۆژ ئەو حاجی و معتەمیرنە هەر زمانیان لەزیکری الله تعالی دایە .

إبن القيم دەفەرمووی (وقرنه بالجهاد وأمر بذكره عند ملاقاة الأقران ومكافحة الأعداء)هەروەها لەهەموو عیبادەتێکیتر وەکو عیبادەتی جیهاد الله تعالی دەفەرمووی : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)[220] ئەی ئیمانداران ئەگەر لەگەل دووژمنان و کافران و خوانەناساندا چەنە و بەرۆکی یەك بوونەوە شەر هاتە کایەوە ثەباتان هەبێ ئینجا دەفەرمووی (وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)ئەبێتە هۆکاری سەرکەوتنتان یادی الله زۆر بکەن .

ئەمرۆ سەیری شەرەکان بکەن ئەو شەرانەی کە ئەکرێی ئیتر هەموو جۆرە شەرێك یادی الله چەندێك تیا ئەکرێی ، ئەوەتا لە ئەسنائی شەردا الله تعالی دەفەرمووی : یادی الله زۆر بکەن ، ئەوەی ناکرێی یادی الله یە ئەوەی ئەکرێی یادی ئینسانە ئینسان سەربکەوێی نەك الله سەربکەوێی .

[220] :سورة الأنفال اية : ٤٥

ئەبو هورەیرە (رەزای الله تعالی لیٚ بێت ) حەدیسێکمان بۆ ئەگرێتەوە ئەفەرمووی : پێغەمبەری خۆشەویست(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (أنا عند ظن عبدي بي ، وأنا معه إذا ذكرني)[٢٢١] بەندەکەم چۆن هەست ونەستی بەرامبەرم هەبیٚ منیش ئەوهام بەرامبەری چۆن گومانی بەرامبەر بەمن هەبیٚ منیش ئاوام .

لێرە زانایان جوان شەرحی ئەم کەلیمەیە ئەکەن ، یانی ئەگەر کەسێك گومانی باشی بە الله هەبیٚ نیەتی بە الله باشبیٚ الله تعالی ش چاکەی ئەو کەسەی ئەوێی .یانی با سەیری کردەوەکانمان بکەین کردەوەکەت چۆنە  عیبادەتەکەت چۆنە دەست پاکی و چاو پاکی و عیبادەت و قورئان خوێندن و نوێژ و ڕۆژوو و تاعەت و عیبادەت ومال و مندال کار و کاسبیەکەت لەرەزامەندی الله یە ئالەو کاتەدا ئەگەر لەوکاتەد اتۆ بمرێی بچیتەوە بۆلای الله زۆر مورتاحی ئالەو کاتەشدا الله تعالی  گەورەترین پاداشتی بۆ داناویی ، بەلام ئەگەر وانەبی ئەگەر گومانت بەرامبەر بە الله خراپ بوو بۆنمونە : ئێستا بلێن ئەو عیبادەتە بکە ئەلیٚ بەراستی من هەتا بلیٚ خراپم خۆی ئیعتراف بەخۆی دەکا ئەگەر بەزمانیش ئیعتراف نەکا بەدل ئیعتراف دەکا چونکە بەزمان بەدەگەمەن ئیعتراف دەکەین بەس لەناو سگماندا هەموومان ئیعتراف دەکەین بای چەندین لەبەردەمی الله تعالی دا ، یانی بای چەندی الله تعالی ش ئاوایە لەگەلت بەکورتی حەدیسەکە ئاوایە نرخت چەنێکە بەرامبەر بە الله الله تعالی ش ئەوەندە پاداشتی هەیە بۆتۆ ، ئینجا سەیری خۆت بکە عیبادەت دەکەی الله تعالی ت خۆش دەوێی ، ڕاستگۆیت ، ڕاستکاری ، ڕێك و پێکی ، الله تعالی ش لەگەلت باشە ، لەناخی خۆت هەست دەکەی وانیت دە ئیتر خۆت چاك بکە ، ئەگینا مانای نیە تۆ زینا بکەیت و ئارەق بخۆیت حاشا لەڕووی ئێوە دەستی خەلك ببریت و داوای بلیٚ گومان بە الله باشە ئاخر چۆن گومانت بە الله باشە ،یانی الله تعالی بەهەشتەکەی بۆ زیناکەران داناوە ئەوکاتە !! الله تعالی بەهەشتەکەی بۆزیناکەر و دەست برو قول بر موشریك و کافر دانەناوە بەلکو جەهەنەمەکەی بۆ ئەوان داناوە (**أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ**)[٢٢٢] خۆتان لەو جەهەنەمە بپارێزن کە بۆ کافرەکان دانراوە .

(وأنا معه إذا ذكرني)من لەگەلیدام ئەگەر یادی من بکا ئەگەر باسی من بکا ئەگەر منی لەیاد بیٚ منیش لەگەل ئەودام .ئەو لەگەلدا بوونە بەمشێوەیە :

لەگەلدا بوون دوو لەگەلدا بوونە :

لەگەلدابوونێك بەگشتی : الله تعالی لەگەل هەموو بونەوەرە بەگشتی بەعیلم و زانیاری لەگەل هەمووان دایە و ئاگای لەهەموو شتێکە .

[٢٢١]:رواه المسلم
[٢٢٢]:سورة البقرة اية : ٢٤

لەگەڵدابوونی تایبەتیش هەیە کە بەندەکەی سەرئەخا کە ئەویش ئەبێت بەدوو بەشەوە،

زانایان دەفەرموون بەحەقیقەت و بەسەرخستن بەس نازانین چۆنە حەقیقەتەکەی .

الله تعالی لەئاسمانە بەس لەگەڵشیماندایە بەس نازانین چۆنە .

بەسەرخستن و بەتەدبیرکردنی ئەمرمان و بەرێنمایی کردنمان بەبەخشینی نیعمەتەکانی بەپاراستنی بۆ ئێمە لەگەڵماندایە ئەگەر تۆ لەگەڵ ئەودا بی .لەگەڵیدا بی لەگەڵت دایە.

هەروەها دەفەرمووی : (فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي)ئەگەر لەنەفسی خۆیدا ئەو بەندەیە یادی من بکا منیش لەنەفسی خۆمدا یادی ئەو بەندەیەم ئەکەم ، کەلیمەی نەفس لێرەدا بۆ الله تعالی هاتووە بەڵکو لە قورئانیش زۆر هاتووە (تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ)[٢٢٣] کەلیمەی نەفس یانی : یانی زاتی الله تعالی بەتەنها سیفەت نیە وەبەتەنهاش زات نیە زاتێکی بێ سیفەت و سیفەتێکی بێ زات . بەڵکو زاتی پر لەسیفاتی جەلال و کەمالی الله تعالی یە نەفس . ئەڵێ ئەگەر لەناخی خۆیدا باسم بکا منیش لەلای خۆم باسی ئەو ئەکەم ئەجرو پاداشتی گەورەم بۆ داناوە .

هەروەها دەفەرمووی : (وإن ذكرني في ملإ ذكرته في ملإ خير منهم)ئەگەر لەناو کەسانێك باسی من بکا من لەلای باشترین کەسان لەئاسمان باسی ئەو ئەکەم یانی لەلای مەلائیکەتەکان ، واتا ، ئەگەر تۆ بەتەنها دابنیشی ، هەتاوەکو بەتەنها بوون زۆر گەورەیە لەحەدیسی حەوت کۆمەڵەکەدا باسمان کرد ، ئەگەر بەتەنها یادی الله تعالی بیرکەوتەوە و چاوەکانی فرمێسکی لێ هاتە خوارەوە الله تعالی ش لەژێر سێبەری عەرشی خۆیدا حەشری ئەکا ئەوە بەتەنهابوون چی بۆ ئامادە کردوە ، ئەگەر لەناو کۆڕ و کۆمەڵان و خەڵکیدا باسی الله تعالی کرد ئەڵێ من لەناو کۆڕ و کۆمەڵانی باشترین لەوان کە مەلائیکەیە باسیان ئەکەم لەلای مەلائیکەتەکانی مقربین ، نزیکەکان ئەوانەی نزیکن لە الله تعالی وە حملت العرش ، جوبرائیل و میکائل و ئیسرافیل ملك الموت هەموو ئەوانەی کە نزیکن لە الله تعالی وە .

هەروەها دەفەرمووی : (وإن تقرب إلي بشبر تقربت إليه ذراعا)ئەگەر ئەو بستێك بۆلای من بێ من باسکێك بۆ دێم واتا لەسەری پەنجەوە تاوەکو ئەنیشك باسێك بۆ لای ئەو بەندەیە دێت ، یانی تۆ چەنێك بێت الله تعالی زیاتر دێی . ئەم هاتنەش زانایان باسی دەکەن و دەفەرموون : ئەتوانی بوترێی لەسەر حەقیقەتە و نازانرێی چۆنە وە ئەتوانرێی بوترێی کە الله تعالی تۆ چەندێك بەتاعەت بۆی بێتە پێشەوە ئەویش بە مەغفیرەت و پاداشت زیاتر ئەو دێتە پێشەوە هەر الله تعالی خۆی فەرموویەتی : (مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا)[٢٢٤] . (وإن تقرب إلي ذراعا تقربت إليه باعا)ئەگەر بەندەکەم باسکێك لەمن نزیك بوویەوە

[٢٢٣] :سورة المائدة اية : ١١٦
[٢٢٤] :سورة الأنعام اية : ١٦٠

دوو دەست لەم سەر هەتا ئەو سەر ئەوە باعا ە لەزمانی عەرەبیدا ئەوە باعا،ئەوەندە لێ نزیك ئەبێتەوە .

(وإن أتاني يمشي أتيته هرولة)[225] ئەگەر ئەو بێت بۆلای من بە رۆیشتن من بە هەروەلە دێم بۆ لای ئەو .

ئەمەش زانایان دەفەرموون : هەردوو حالەتەکە بەدیی ئەکرێی :یان لەسەر حەقیقەتێکە کە نازانین چۆنە ، یان مەبەست پێ ئەوەیە کە ئەو عیبادەتانەی رۆیشتنی بۆ بەکار دەهێنی الله تعالى پاداشتی زیاتری بۆ بەکار دەهێنی بۆ ئەم بەندەیە .

حەدیسێکی تر کە ئەبو هورەیرە(رەزای الله تعالى لێ بێ ) دەفەرمووی (عن أبي هريرة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم إن الله تعالى يقول ( أنا مع عبدي إذا ذكرني وتحركت بي شفتاه ))[226] من لەگەل بەندەکەم دام مادەم یادی من بکا مادەم باسی من بکا مادەم لێوی بەمن بجولێی ، لێرەدا سەرنجێك هەیە هەندێك ئەبنین لەنوێژدا دەمی داخستووە لەزیکردا دەمی داخستووە زیکر ئەوەیە ئەبێت لێویشت بجولێ سەیری حەدیسەکە بکە ئەلێ (وتحركت بي شفتاه)ئەبینم لەنوێژدا هەیە فاتیحەکە ئەخوێنی لەدلیدا بەزمان نایخوێنی ئەوە هەلەیە ئەوە نوێژت نەکرد تۆ تۆ ئەبێ دلیش و زمانیش و هەموو گیانت بخەیتە گەر بۆ عیبادەتی الله تعالى .

(عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال قال النبي صلى الله عليه و سلم)ئەبو دەردا ئەم حەدیسەمان بۆ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وتویەتی ({ألا أنبئكم بخير أعمالكم)ئەفەرمووی : باشترین کار و عیبادەتان پێ بلێم کەبیکەن بۆ الله تعالى تان ؟ (و أزكاها عند مليلككم)خاوێنترینی لەلای مەلیکەکەتان کە الله تعالى یە (و أرفعها في درجاتكم)بەرزترینیان لە دەرەجاتی ئەعمالی تۆ کام عەمەلەی کە لەهەمووی بەرزترە (و خير لكم من إنفاق الذهب و الورق)لەبەخەشینی زێرو زیویش گەورەتر بێ (و خير لكم من أن تلقوا عدوكم فتضربوا أعناقهم و يضربوا أعناقكم؟)لەوەش باشتر بێ کە بچیتە جیهاد و غەزا لەپێناوی الله تۆ لەگەردنی کافران بدەیت و ئەوانیش لەگەردنی ئێوە بدەن ؟

(قالوا بلى)فەرموویان : بەلی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)تۆ پێمان بلێ ئێمە حەز دەکەین باشتر عەمەل و عیبادەت بکەین بۆ الله تعالى ، لەوانە هەمووی باشتر ئەبێ چی بێ ؟( قال{ذكر الله} ،)[227]وتی: یادی الله تعالى زیکری الله باسی الله . زۆر حیکمەتێکی گەورەی تێدایە ئەم حەدیسە تۆ

[225]:رواه البخاري والمسلم
[226]:رواه البخاري
[227]: رواه الترمذي و ابن ماجة

ئەگەر زمانت هەر بە الله جولایەوە باسی کەسیترناکەی ،ئەمڕۆ باسی خەلکان ئەکرێی بۆیە باسی خەلکان بیرچۆتەوە بۆیە ژیانمان هەمووی بوە بەدەردە سەری و نارەحەتی .

الله تعالی ئێمەی داوەتە دەست خۆمان ئەلێ برۆ یادی کێ ئەکەی با ئەوە بەخێوت بکا ،یادی کێ ئەکەی و باسی کێ ئەکەی و کێ لەدلتدا گەورەترە با ئەو بەخێوت بکا باسەرپەشتیاریت بکاو با دەردەکانت چارەسەر بکا ، بەهەموویان فریا ناکەون کەچی دەولەمەندیشن فریا ناکەون نیە لەولاوە رەزیلی و لەولاوە نەبوونی و هەزار حیساب ئەکا بۆخۆیی الله تعالی لەقورئاندا بۆمان باس دەکا دەفەرمووی : ئەگەر ئەم مولکە بەدەست خەلك بوایە هیچیان بەخەلك نە ئەدا ئەترسان لەفەقیری و فەقیری توشیان بێ . سبحان الله دەفەرمووی ئەگەرئەو مولکەیان هەموو بەدەستەوە بایە نەیان ئەدا بەکەس . بەتەئەکید وایە ئێستا کوا یانی ئێستا ئێمە لەنەبوونیماندایە لەم ولاتە ؟!کە دەردەسەری و نەخۆشی وناخۆشی ونەبوونیمان هەیە ؟!لەنەبوونیە؟ نەوالله زۆر دەولەمەندین بەس ئەوەیە کە وتمان چاو چنۆکی و رەزیلییە .

دەیادی الله بکە خۆیی الله تعالی سەرپەرشتیاریت ئەکا ، بەس الله ئەوکاتە خۆیی یارمەتیت ئەدا ، بەس کە تۆوتت نە تۆ و یەکێکیتر یان بەس ئەو کەسە یان ئەو ١٠ کەسە یان ٢٠ کەسە یان ئەو کۆمەلە دەلێ دەبرۆ بۆ لای ئەوان والله ئەوەی داوا لەمنیش دەکەی ئەویشت نادەمی چونکە نابێ شەریك پەیا بکەی شەریك نابێ پەیا بکەی بۆ الله تعالی جا ئەوەیە زیکری الله خۆشەویستانم ئەها لە هەموو عەمەلێك گەورەترە بەپێ ئەم حەدیسە صەحیحە . الله تعالی دەفەرمووی : (وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ)[٢٢٨]یادی الله لەهەموو شتێك گەورترە.

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَسِيرُ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ)ئەم حەدیسە باسی ئەوەمان بۆ دەکا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەحەجی الوداع لە مەدینەوە دێی بۆ مەککە کە دێت بۆ مەککە ١٠٠ کیلۆ مەترێك ئەمێنی بۆ مەککە شاخێك ئەبێ ناوی جومدانە ئەگەنە شاخەکە ،یانی چۆن تۆ ئێستا ئەچیت بۆ جێگایەك نیشانەیەك هەیەبۆ ئەو شوێنە پێش ئەوەی بگەیت ئەلێ کاکە ئەوە گەیشتین و نزیك بووینەوە ئەو شاخەش نیشانە بووە بۆ گەیشتن بە مەککە یانی لەمەدینەوە نزیکەی ٤٠٠ و چەند کیلۆمەترێکە ١٠٠ کیلۆمەتری ماوە بگەنە مەککە شاخێك هەیە ناوی جومدانە (فَمَرَّ عَلَى جَبَلٍ يُقَالُ لَهُ جُمْدَانُ)بەلای شاخێکدا تێپەرین پێ وترا جومدان (فَقَالَ: «سِيرُوا هَذَا جُمْدَانُ)بەسەحابەکانی فەرموو : ١٠٠ هەزار سەحابەی لەگەلدا بووە لەحەجی مالئاوایی فەرمووی برۆن بێگومان ١٠٠ هەزار کەس بەسوارو بەپێ هەیە پێش ئەکەوێی وە هەشە دەوا ئەکەوێی ئەوە عادەتی سەفەر و کاروان ئاوایە بۆخۆیی (سِيرُوا هَذَا

[٢٢٨]:سورة العنكبوت اية :٤٥

جُمْدَانُ)ئەمە جومدانە برۆن (سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ ، قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ؟ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: «الذَّاكِرُونَ اللهَ كَثِيرًا، وَالذَّاكِرَاتُ»)[229] تەبعەن گومانی تێدا نیە لەسەفەر هەیە پێش ئەکوێی وە هەشە داوا ئەکوێی ئیشارەت ئەدا لەحەدیسەکەدا وەکو زانایان دەفەرموون : فەرمووی راستە ئەوەی زووگەیشتە جومدان بەرەو مەککە زوو تر ئەروات و ئەچێتە پێشەوە ئەمە موسابەقەی کرد و پێش هاورێکانی کەوت بەس باشترین کەسێك کەوا پێشبرکێ بکا لە عیبادەت و زیکری الله دا لەوانەی کەوا زیکری الله دەکەن ئەوانەی کەوا زیاتر زمانیان بە زیکری الله تعالی وە ئەگەڕێت و یادی الله تعالی دەکەن ئەوانە مغفیرەت و بەهەرمەند و رەحمەتی الله یان تووش بوو .

ئیمامی إبن رجبی حنبلی ئەفەرمووی : (ومن هذا السياق يظهر وجه ذكر السابقين في هذا الحديث)بابزانین بۆ باسی (سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ)کرد ، ئەلێ : (فإنه لما سبق الركب ، وتخلف بعضهم ، نبه النبي – صلى الله عليه وسلم – على أن السابقين على الحقيقة هم الذين يدمنون ذكر الله ، ويولعون به)پێ رایگەیاندن بەلێ کەسانێك زوو پێگەیشتن و رێگەکەیان بریی بەلاّم باشترین کەس کەپێشبرکێ بکا لە عیبادەتی الله تعالی وە لەزیکری الله تعالی ئەوەی کە زیکری الله دەکا .

ئیمامی ابن رجب دەفەرمووی : عومەری کوری عبدالعزيز لەشەوەی عەرەفەدا ئەوکاتەی کە لەعەرەفە ئەچوون بۆ موزدەلیفە فەرمووی : (ليس السابق اليوم من سبق بعيره ، وإنما السابق من غفر له )سابق ئەو کەسە نیە کە زوو بگاتە مەنزل زوو بگاتە شوێنەکە ، بەلکو ئەوەیە کە الله تعالی لێ خۆش بێ ئەوەیە سابق .

دواتر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەمەی شەرح کردەوە بە (**وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ**)[230] ئەوانەی کە زۆر یادی الله دەکەن لەپیاوان و ئافرەتان .

إبن القيم دەفەرمووی : (والمقصود : أن دوام ذكر لما كان سببا لدوام المحبة)[231] کەواتە بەردەوامبوونی زیکر هۆکارە بۆ بەردەوامبوونی خۆشەویستی و محیبەتی الله تعالی (التى هى روح الاسلام)کە ئەمە رۆحی ئیسلامە (وقطب رحى الدين، ومدار السعادة والنجاة.)وەکو وتمان دەست تار دوو بەشی هەیە بەشی خوارەوە و بەشی سەرەوە زیکری الله یادی الله وە ئەو عیبادەتانە هەر هەمووی بریتیە لە بەشەکەی خوارەوە ئەگەر سەرەوەی هەتاوەکو ئێوارە ژێرەکەی لەگەلدا نەبێت هیچ سودی نیە تۆهەر بیهاریی ، هەرعەمەل بکە هیچ سودی نیە .، ئەبێ لەسەر ئەم ئەساسە دایرێژیی .( وقد جعل الله لكل شيء سبباً،

[229] :صحيح مسلم : ٤٨ - كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار / ١ - باب الحث على ذكر الله تعالى / حديث رقم ٢٦٧٦
[230] :سورة الأحزاب اية : ٣٥
[231] : جلاء الأفهام في فضل الصلاة على محمد خير الأنام

وجعل سبب المحبة دوام الذكر.) الله تعالى هەموو شتێكی بەسەبەب داناوە سەبەبی خۆشەویستی الله تعالى بەردەوامی زیکری تۆیە بۆ الله تعالى (فمن أراد أن ينال محبة الله عز وجل، فليلهج بذكره)كێ ئەیوێی بەبەردەوام الله تعالى خۆشبوێی وە الله تعالى ئەوەی خۆش بوێی با هەریادی الله تعالى بکا هەتاوەکو دەمرێی .

صەحابەیەك لەصەحابەکان فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەبعەن ئەزانن ئیسلام لەماوەی ٢٣ سالیدا تەواو بوو ١٣مەککە و ١٠ سالی مەدینەش ،صەحابەکە فەرمووی : شەریعەتەکانی ئیسلام زۆربوون لەسەرم بەشەکانی و عەمالەکانی فەرمووی بە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) شتێکم پێ بلێ کەوا من لەسەری بم و بەبەردوامی و دەستی پێوە بگرم لەسەرووی هەموویانەوە بێ . پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : بەبەردەوام زمانت تەر بێ بەیادی الله تعالى (لا يزال لسانك رطباً من ذكر الله)[٢٣٢] .

ئینجا تۆ سەیری سودەکان و فوائیدی ئەم زیکرە بکە تۆ ئەگەر بەبەردەوام زیکری الله تعالى بکەی لەبیرت ناچێتەوە ، بەس زیکرێك زمان و دل پێکەوە بەند بکاتەوە ئینجا عەمەلەکانت هەمووی کۆنترۆل بکا و سەیتەرەبکات بەسەریدا ئا بەم زیکرە دەست بەریی بۆ هەر شتێك الله تعالى ت بیر بکەوێتەوە نەکەی کاری خراپ بکەی . لەزینادا الله تعالى ت لەیادە ، معقول نیە کەسەکە زیکر بکا و زینا بکا ! !زیکر بکا و دزی بکا ، معقولە کەسێك لەدوکانەکەیدا زمانی هەر بلێ (سبحان الله والحمدلله ولا اله الا الله والله أكبر)کەچی لەولاوە بچێ لەتەرازودا فێل لەخەلکی بکا نایکا و ئەترسێ لە الله تعالى ، بەس ئەگەر یادی الله نەکا یادی شەیطان بکا و گۆرانی و مۆسیقا لێدا پارە دەیی دونیا ئەریی والله کاکە دەستی باشترین کەسیش ئەبرێی نەك خراپترین کەس دەستی مەلاش ئەبرێی وەکو ئەلێن ! !بەس ئەگەر یادی الله تعالى ت کرد هەر دەم لەبیرتە .

جا یادی الله تعالى بەهێز و بەقوەتت ئەکا ئێوە سەیری فاطیمە و عەلی بکەن (رەزای الله تعالى یان لێ بێ)داوای خادمیان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کرد فەرمویان : ئەگەر خادمت بۆ هات خادممان بدەرێی ئیشەکانمان قورسە بەلکو هەندێك ئیشمان بۆ بکەن . چوو بۆلایان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: لەجیاتی خادم بلێن (سبحان الله والحمدلله )٣٣ جار وە (والله أكبر )٣٤ جار بکەن لەسەر جێگاکانتان .

[٢٣٢] : رواه الترمذي

زانایان دەفەرموون :یادی الله بەهێزت ئەکا بۆ ئیش کردن تۆ یادی الله بکە بزانە چەند بەهێزوبەقوت دەبی ،. الله تعالی قوەتت ئەداتێ .

(فالذكر باب المحبة، وشارعها الأعظم، وصراطها الأقوم)[٢٣٣]زیکر دەرگای مەحیبەتی الله تعالی یە لەو دەرگایە ئەچیتە ژوورەوە (فالذكر للقلب كالمائل للزرع)تۆ ئەتەوێی زەراعەتەکەت ڕێك و پێك بێ و بەرووبوومی هەبێ ئەبێ ئاوی بدەیت بەبێ ئاو نابێ ، ئەم لاشەیەش ئاوەکەی زیکری الله تعالی یە ڕۆحەکەی زیکری الله تعالی یە (بل كل مائل سمك)ماسی بەبێ ئاو دەبێ !ئەوهایە تۆش بەبێ زیکر ناژیت ، ئەگەر وتت ئەژیم تۆ ناژیت بەلکو تۆ مردویەکی بەسەر زەویدا ئەرۆیی (لا حياة الا بهم).

زیکریش وەکو باسمان کرد جۆری زۆری هەیە :

١–زیکر کردنی الله تعالی بەناوە جوانەکانی بەسیفاتە بەرزەکانی بەمەدح کردنی .

٢–زیکردنی الله تعالی بەو لەفزانەی کە (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر)کە پێغەمبەر دەفەرمووی (صلى الله عليه وسلم) (أحب الكلام إلى الله تعالى أربع : سبحان الله ، والحمد لله ، ولا إله إلا الله ، والله أكبر . لا يضرُّك بأيِّهن بدأت)[٢٣٤] خۆشەویسترین قسە لەلای الله تعالی بریتیە لەم زیکرانە هەرچواریان مختصە بە الله تعالی وە هەرچواریان باسی الله تعالی یە هیچ باسی ئینسانەکان و مادە و دونیا ناکا بەس باسی الله تعالی دەکا ، تۆ ئەگەر لەمانە بەردەوام بی لەغەیبەت دوور دەکەویتەوە لەشەر دوور ئەکەویتەوە لەوە دوور ئەکەویتەوە کە مەلائیکەتەکان لەسەرت ئەنووسن هەرشتێکی تر بلێ زەرە ئەکەی لەغەیری زیکری الله تعالی .

٣–ئەحکامەکانی الله تعالی بزانیت و جێ بەجێ یان بکەیت ئەوەش هەر زیکری الله تعالی یە . حەلال و حەرامەکانی بەبەر چاوت بێ .

٤–خویندنی قورئان ، ئەوەی لەم قورئانە خۆی بێ بەش بکا بەکوێری حەشر دەکرێی لەرۆژی قیامەتدا ،ئاگاداربن الله تعالی دەفەرمووی (وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ)[٢٣٥] والله هەرکەسێك خۆیی لەم قورئانە دوورخاتەوە و نەیخوێنێتەوە ئاگای لێ نەبێت و بێ ئاگابێ لێی رۆژی قیامەت الله تعالی بەکوێری حەشری دەکا . جا ئەلێ خوایە بۆچی بەکوێری حەشرت کردم ؟ ئەلێ :ئاخر تۆ کوێر بووی لەئاستی یادەکەی من لەزیکرەکەی من و لەقورئانەکەی من کوێر بووی منیش ئەمرۆ تۆ بەکوێری حەشر دەکەم . مەلی نەخوێندەوارم وەکو باسمان کرد خۆت فێر بکە خۆت

[٢٣٣] : الوابل الصيب.
[٢٣٤] :رواه مسلم
[٢٣٥] :سورة طه اية : ١٢٤

فێری خوێندەواری بکە خۆت فێری قورئان خوێندنەوە بکە ئەوانەی کەوا نەخوێندەوارن ئەوانەشی کە خوێندەوارن بۆچی خوێندتان کردوە ؟!بۆچی ئەلف و بێ فێر بوون بۆ دینار و درهەم !؟یان بۆ ئاخیرەتەکەتان .

٥–زیکری الله تعالی بکەی بە إستغفار و دوعا کردن وپارانەوە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەیت خۆتی لەبەردەمی کەسیر و زەلیل بکەیت بگریت و بپارێتەوە .

ئەمانە هەمووی پێنج جۆر بوو لەجۆرەکانی زیکرکردنی الله تعالی .

إبن القیم دەفەرمووی :(أفضل الذکر وأنفعه : ما واطأ فیه القلب واللسان ، وکان من الأذکار النبویة)[٢٣٦] ئەمە تێبنیەکی زۆر گرینگە باشترین زیکر ئەوەیە کە زمان و دل هەردووکی ئاگایان لەیەکتری بێ کە زیکری الله تعالی دەکەی وە زیکرەکانیش زیکری پێغەمبەری خوا بێ (صلی الله علیه وسلم)لەوەی کەوا پێ وتوین بۆمان هاتوە لە سونەی صەحیحە، نەك لەخۆمانەوە شت دابهێنین .

سەیربکەن ئەو زیکرە بیدعیانەی کەوا هەیە لەرەمەزاندا ئەو تەراوحیانە سەیر بکەن ئەو هەموو هێنان و بردنەی لەتەراوحیدا ئەکرێی یەك دەلیلی لەسەر نیە ئەلێن :١٠٠ هەزار سلاوات لە دیدرای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)!ئینجا هەلدەستنەوە و نوێژەکە دەکەن! یاخود دەلێن (یاحنان یامنان یا دیان یا برهان) ئادەی پێم بلێن ئەمانەتان لەکوێی هێنا ، ئەو مزگەوتەی ئەوەی تیدا بکرێی چونکە لەسەری راهاتوە لەمنداليەوە تا ئێستا ئەلێ ئەوە تەواوە باو باپیرانمان ئەوەیان هێناوە !بەلام بلێن کاکە کا حەدیس پێغەمبەر وای نەوتوە وەرن دانیش بەهێمنی و لەسەرخۆ بانوێژەکەمان بکەین ! سەیر دەکەی چونکە سالەهای سالە بەم بیدعانەدا رۆیشتووە ئەوە بووە بەدین لەلای ئەوەی پێ ناخۆشە کە تۆ ئێستا یادی الله تعالی وەکو پێغەمبەر دەکەیتەوە (صلی الله علیه وسلم)نازانێ تامەکەی نە چێشتووە لەسەر سونەت نەرۆیشتووە و خوێندەواری نەبووە بەرامبەر بە حەدیسی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆیە هەرکەسێك کە هەلدەستێ و سونەت زیندوو ئەکاتەوە بیدعە ئەمرێنی لەلای خەلکەکە موتەهەم دەکرێی ئەلێ ئەوە دینی تازەی هێناوە ، کاکە ئەوە دینی تازە نیە ئەوە شەریعەتی الله یە و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وای کردوە ئەگەر تۆ زیاتر پێی یە وەرە بیهێنە بزانم ئەم تەراویحە چۆن دەکرێی ئەو بیدع و گومراییە چیە تۆ خستۆتە ناو ئەو عیبادەتانەوە .

یان سەیربکەن لەپێش بانگ لەبەیانیاندا پێ ئەلێن کبارا یان سبحان الله ئەمەت لەکوێی هێنا ، دوو بانگ هەیە لەبەیانیاندا بانگی یەکەم و بانگی دووەم ، ئێستا بانگی یەکەم نادرێی لەهیچ شوێنێك گوێمان لێ نیە

[٢٣٦] : الفوائد ص ٢٧٢

لەم ولاتەی خۆماندا بانگی یەکەم بدرێی خۆی ئەبێ زیندوو بکرێتەوە ئەو کەسەی کە مەسئولە بەخەلکەکەی رابگەیەنێ بلێ کاکە گوێبگرن دوو بانگ هەیە بەیانی بانگی ٢٠ دەقە نیوسەعات پێش ئەوەی نوێژ ببێ بانگێك ئەدرێی لەم بانگەدا خەلکی هەلدەستن بۆ شەو نوێژ یاخود هەلدەستن خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ خواردنی پاشێو بگەرێنەوە بۆ مالەوە لەمزگەوتەکان یان هەلسن لەخەو و ئاگاداربن وا نوێژی بەیانی دەبێ و هەندێك شەو نوێژیان لەکیس نەچێ ، دواتر کە فجری صادق بوو بانگێکی تر ئەدرێی ئەمەنەمان هەیە .

شتێکیتر لەم بیدع و زیادانە ئیمساك ، ئیمساکی چی ، الله تعالی لەقورئاندا دەفەرمووی : بخۆن و بخۆنەوە (**وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ**)[٢٣٧] یانی ئەو بانگەی کە عبدالله کوری ام مکتوم دایی لەزەمانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)بەم بانگە نوێژیش ئەبوو وە دەمیشیان ئەگرتەوە نەك پێش ئەوە بە٢٠ دەقەبلێن دەم بگرنەوە ئینجا داویی بلێ با نوێژ بکەین ،! هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە دامەزاروە ئەم شتە ، ئەلێن ئەو ئیمساکە علی أساس دەست پێ دەکا بە فجری صادق باکەس شت نەخوا بەلام هێشتا نوێژەکە لێ تەئەکید نین کەوا بووە یاخود نا چارێگێك دوای ئەو تەئەکیدین کە بووە یاخود نا!! کاکە تۆ ئەوشتەت گۆریی ئەم نەخشیەت گۆری پێغەمبەر وای نەکردوە (صلی الله علیه وسلم)بانگ بۆنوێژیشە وە بۆ دەم گرتنەوەشە کە بانگی دا دەم ئەگریتەوە بانگی دا نوێژ ئەکەی تەواو ، بەس ئێستا برۆ پێ یان بلێ بە ئیمساکەکە بانگ بووە ؟نوێژ بکەم ئەلێ نا نوێژ مەکە بۆ ؟ ئەلێ نەبوە بۆیە .ئەی بۆ پێم ئەلێ دەم بگرمەوە !؟

ئێوە بیری لێ بکەنەوە بانگ لەزەمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دراوە بەم بانگە دەمیان لەخواردن و خواردنەوە گرتۆتەوە وە نوێژیشیان دەست پێ کردوە بەس ئێستا وانیە چارێگێك پێش بانگەکە ئەلێن ئیمساك مەخۆن بۆ ئیحطیاطن ئەم ئیحطیاطەمان نیە لە ئیسلامدا .

یەکێکیتر لەم شتانەی کەداهێنراوە و ئەوتریێ پێش بانگ سەیری پێش قامەت بکەن کەستان بینیوە لەپێش بانگدا کە بانگ ئەدا بلێ (اللهم سیدنا محمدا وال محمد)وەکو لەقامەت ئەوترێی ئینجا دوای بانگ بدا کەستان بینیوە کە بانگ ئەدا وابلێ ؟!ئەی بۆ لەقامەت ئەیلێن لەقامەتیش نیە هەر بە الله أكبر دەست پێ دەکا ، ئەگەر لەقامەت بە سەلاوات دەست پێ دەکەی ئەی بۆ لەبانگ بە سەلاوات دەست پێ ناکەی ،من پرسیارتان لێ دەکەم بۆچی لەبانگ بە سەلاوات دەست پێ ناکەی ، زۆر جار رەخنەی ئەوەمان لێ

[٢٣٧] :سورة البقرة اية : ١٨٧

دەگرن ئەلێن قامەتەکیان سەلاواتی لەگەلدا نیە ئەمانە رقیان لەسەلاواتە ! تۆش رقت لەسەلاواتە بانگەکەت سەلاواتی لەگەلدا نیە لەسەرەتا ئەی بۆلەسەرەتا سەلاوات نادەی ! بۆ سەلاوات لیٚ نادەن چونکە نەهاتوە ئیٚ لەقامەتیش نەهاتوە،

کەستان بینیوە لە بانگدا بلیٚ (أشهد أن سیدنا محمد رسول الله)!!؟بۆ رقت لیٚ یە پێغەمبەر سەید بیٚ ئەی بۆ پیٚ نالیٚ سەید ئەلیٚ ئاخر نەهاتووە ،ئیٚ ئێمەش هەر ئەوەیە پێت ئەلێن لەقامەتیش نەهاتووە لەتەحیاتیش نەهاتووە وەکو خۆیی بیلیٚ زیادە مەخەرە سەر زیکرەکان .

بۆیە لێرەدا إبن القیم ئیشارەتی دا بەوەی کە دەلیٚ زیکرەکانی پێغەمبەر بکە (صلى الله عليه وسلم)زیادەی مەخەرە سەر .

کەمن ئەلێم (أشهد أن محمد رسول الله)لەبانگدا رقم لەوە نیە پێغەمبەر سەید بیٚ (صلى الله عليه وسلم)بەس وا هاتووە لەقامەتیش هەروا بکە لەتەحیاتیش هەروا بکە ،

باشە کە تۆ ئەوەندەت خۆش دەوێی و بەسەیدی خۆتی ئەزانی ئەی بۆ لەژیانی دونیادا نەتکردوە بە سەید لێرە زیادەم بۆ دەخەیتە سەر وبیدعەکم بۆ زیاد دەکەی کە (كل بدعه ضلالة)[٢٣٨] لەدەرەوەشەوە ئەیکەیت بە حوجە لەسەرخۆتەوە کە ئەلیٚ سەیدمە و ناشی کەیت بە سەید ، سەیدتە ؟ئەگەر سەید تە بۆ بەتەنها شوێنی ناکەویت ! ئەگەر گەورەتە و بەرێزتە نوری چاوتە بۆ لەهەموو ئەعمالی بازارەکەتا شوێنی ناکەوی بۆ لە ئەخلاقی مال و مندالدا شوێنی ناکەوی لە ژن هێناندا و تەعەزیەکەتدا لەئەحکامدا و لەهەموو شتێکی دونیادا بۆ بەشوێنی ناکەویی !!

یاخود لەدوای بانگ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەفەرمووی کە بانگ درا سەلاواتم لەسەر بدەن داوای وەسیلەم بۆ بکەن نەی وتوە بەدەنگی بەرز بانگ بێژەکە وابکا بەلکو فەرموویەتی: هەمووتان وابکەن ،

کەچی ئەبینی لەبانگەکاندا هەمووی ئەم زیادەی خستۆتەسەریی هەموو کتێبە شەرعیەکان بگەرێی یەك سەلاوات نیە لەدوای (لا اله الا الله ) کەتۆ لەدوای بانگ بەدەنگی بەرز بانگ بێژەکە وابلیٚ نیمانە .

فاتیحەش ئەلێن هدیتا الفاتحه کەی ئەوەمان هەیە !! والله هەموو کیتابی علیم بگەریی تێدا نیە ، جارێکیان لەمزگەوتێك چوون شکاتیان لیٚ کردم وتیان وەرە کاکە هاتنە بەردەمی مالەوە وتیان تۆ بۆچی نایەلی خەلك بانگبدا و خەلك فاتیحە بلیٚ !؟ وتم وەرە بۆمەکتەبەکە بگەرێی ئەگەر یەك حەدیست دۆزیەوە وابلیٚ من لەپێش تۆوە دەیلێم !کەسەکە چوە دەرەوە وتی خوا حافیز من علیلمم پیٚ نیە و هیچم پیٚ نەما .

[٢٣٨]:رواه مسلم

ئەوانەشی کەوا لەپێش نوێژەکانەوە ئەوترێی لەدوای نوێژەکان من رجاتان لیَ دەکەم با هەمووی زیکری پێغەمبەرمان بیَ (صلی الله علیه وسلم)وەرە بۆخۆتان سەیری کتێبی حەدیس بکەن بخوێنەوە و هەتاوەکو کەی ناخوێنیتەوە ئەگەر ئێستا قەرارێك دەرچی شەرق و غەربی بۆ ئەکەی یەکەسەر وەرەقەکە کۆپی ئەکەیت و ئەیهێنی کەچی ناچی زیکرەکەی پێغەمبەر بێنی(صلی الله علیه وسلم)کێتان هاتوون زیکری دوای نوێژەکان لە حەدیسی بوخاری وموسلیم ولەکیتابەکانی حەدیس نەقل کرد لیَ وەرگرت هەر بەتەقلیدە زۆر بەی زۆرتان با بەتەقلید نەبیَ .

یەکێکی تر کە کراوە بە زیکر تەبعەن ئێمە باسی ئەوەتان لەگەل دەکەین کەوا وارید بوە ئەبیَ ئەوە بکەن شتی زیادە نەخەینە سەر عیبادەتەکانمان ئەوەی وارید بووە ئەوەی کە مشهور و عادەتە لەناو مزگەوتەکان لەدوای نوێژ دەجار سەلاوات لیَ ئەدەن من بەهەرکەسێك دەلێم یەك حەدیسم بۆ بێنە باسی شتێکی وا بکا تۆ لەکوێت هێنا ئەم شتە!؟ نیە ئەزکاری نوێژ بخوینەوە لە کیتابەکانی حەدیس بەوەوە پەیوەست بەرەوە شتی زیادە مەخەرە دینەکەی الله تعالی وە ، من نالێم سەلاوات مەدە بەس تایبەت مەندکردنی عەدەدێك و ژمارەیەك بەعیبادەتێکەوە لەجێگایەکی تایبەت ئەبیَ بەبیدعە .

ئێستا ئێمە ئایەتی الکرسی ناخوێنین لەدوای نوێژەکان ئەلێن حەدیسی لەسەرە ،یەکێکیتر دەلیَ کاکە من سورەتی الحشردەخوێنم بەبەردەوام لەدوای نوێژەکان ئاخر دەلیلت نیە تاوەکو بخوێنی برۆ لەشوێنیکیتر سورەتی الحشر بخوێنە ،یانی تایبەت مەندیەکان ئەبیَ دەلیلیان لەسەر بیَ ، ئەوانەی تایبەت مەندن بە نوێژ بەئەلفازی نوێژ ئەلفازی بانگ یان قامەت یان هەر شتێکیتر هەیە ئەمە لەزیکردا ئەم تنبیهات و هۆشیاریانە وەر بگرن .

## چوارەم :

(إيثارُ محابّه على محابّك عند غلَبَات الهوى، والتسَنُّمُ إلى محابّه وإن صَعُبَ المرتقى.)ئینسان سەیر بکا الله تعالی چی پیَ خۆشە وە سەیری خۆشی بکا بزانی چی پیَ خۆشە دائیمەن ئەوەی کەوا الله تعالی پیَ خۆشە زالی بکا بەسەر ئەوەی کەوا خۆیی پیَ خۆشە بێگومان هەموومان نەفسی ئینسانی ئەزانین کەوا چی پێخۆشە ، عادەت وایە دائیمەن ئەم نەفسە حەزی بەشتی خراپە حەزی بەرحەرام و بەلادانە حەزی

بەئیشی خراپکاری و ئەو بابەتانەیە بەشێوەیەکی عام ئەمە ئەم حەزانە ئەبێت بمرێنی چونکە الله تعالی ئەوەی کە پێ خۆشە ئەوە نیە ئەوەی کە پێ خۆشە الله تعالی شتی باشە نەك خراپ .

جا سەیر بکە جیاوازی بکە لەنێوان ئیرادەی کەونی و ئیرادەی شەرعی بۆ ئەوەی لەلایەنە عقیدەیەکەشەوە ئیستفادە لەم کەلیمەیە بکەیت ، الله تبار وتعالی لەناو ئەم بونەوەرەدا هەرچی ئەبێت ئەمە بەئیرادەی خۆیەتی ، بەو مانایەی کەس ناتوانی لەئیرادەی الله تعالی دەرچێ لەویستی الله تعالی دەرچی کەس ناتوانی هەتاوەکو شەیطانیش شەیطان کە سەجدەی نەبرد ئەگەر ئیرادەی الله تعالی لەسەرنەبوایە نەیدەتوانی هەتاوەکو کەس نەتوانی بلێ توانایمان الله تعالی ببەزێنین خوا ئەو ویستەی کە ویستی ئێمەش ویستمان وە ویستی ئێمە زال بوو بەسەر ویستی الله دا !

ئەم بابەتە تۆزێك حەساسە خەلکی بەهەلە زۆر تێدەکەوێت بۆنمونە کاتێك کە شتێك ئەبێت نالێ ئیرادەی الله یە ئەلێ خوا پێ خۆشە ئەو زینایە بکرێی خوا پێ خۆشە ئەم قەتلە بکرێی خوا پێ خۆشە ئەم دزییە بکرێی ئەلێ پێ خۆشە ئەلێت ئەگەر خوا پێ خۆش نەبوایە نەیدەهێشت ئەمە ببێت !! نا پێ خۆش نیە بەس ئەیەوێت ، لەنێوان ویست و پێ خۆش بوون جیاوازی هەیە . تەشبیە نەبێ هەر بۆخۆتان جاری وا هەندێك خالەت هاتۆتە بەردەمتان پێتان خۆش نەبووە بیکەن حالەت هەبووە ئەبێ بیکەیت بەس پێشت خۆش نیە والله مثل الاعلاء

هیچ شتێك لەئیرادەی الله تعالی دەرناچێ کەواتە هەمووشتەکان لە بونەوەر بە ئیرادەی الله یە ئەوە پێ ئەوترێی ئیرادەی قەدەریی لەقەدەردا الله تعالی وای نوسیوە ئەبێ ئەمە توشی زینا بێ ئەوە تووشی کوشتن و قەتل بێ ئەوە تووشی عەرەق خواردن بێ ئەوە توشی کافر بوون بێ بەس ئایا الله تعالی پێ خۆشە نا .

الله تعالی دەفەرمووی : (**وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ**)[٢٣٩] الله تعالی پێ رازی نیە و پێ خۆش نیە کەبەندەکانی کوفر بکەن بەس کە کوفرئەکەن بە ئیرادەی ئەمە ئەم خالە گرینگە ئاگاداری بن .

باسی ئەوشتانە ئەکەین کە الله تعالی پێ خۆشە مەبەستمان شتە شەرعیەکانە ، عەرەق حەرامە الله تعالی پێ خۆشە تۆ نەیخۆیتەوە بەس ئەگەرویستی لەسەر بوو بیخۆیتەوە هەر ئەیخۆیتەوە تاوانەکەشی لەملی خۆتە چونکە کەس بەزۆر نایکات بەدەمتەوە خۆت هەلت گرتووە بەس الله تعالی لەقەدەردا نوسیوویەتی ئاگاداربن ئەم بابەتە تەسلیم بوونە بەقەزا و قەدەری الله تعالی .

[٢٣٩] :سورة الزمر اية :٧

لەو هۆکارانەی کەوا وادەکا خۆشەویستی الله رابکێشی بۆ ناو دلان ئەوەیە کەوا ئەوشتانەی کەوا تۆ پێت خۆشە وازی لێ بێنی بۆ ئەوشتانەی کەوا الله تعالی پێ خۆشە .

تۆ پێت خۆشە عەرەق بخۆی الله تعالی پێ خۆشە تۆ عەرەق نەخۆیی وازی لێ بێنە ئەوە مەحبەتی الله تعالی رادەکێشی بۆ دلت ، تۆ پێت خۆشە زینا بکەی الله تعالی پێ خۆش نیە زینا بکەی (**إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ**)[٢٤٠] الله تعالی هیچ کاتێك ئەمر ناکا بە فحشا و بەمونکەر تۆش ئەمری پێ مەکە و پێت خۆش نەبێ.

إبن القيم دەفەرمووی : (عند غلَبَات الهوى)لەواکاتەی کەوا هەوا و ئارەزوو زال دەبێ بەسەرتدا لادان زال دەبێ بەسەرتدا لەشەریعەتی الله ئەوە تۆ یەکەسەر بزانە شەریعەتەکەی الله بێنەوە بەر چاوی خۆت بلێ الله تعالی پێ ناخۆشە تۆش مەیکە لەبەر الله تعالی نایکەم .ئەمە خۆشەویستی الله یە .

یەکێك لەو کەسانەی کەوا لەژێر سێبەری عەرشی الله دا حەشر ئەبن ئەو کەسە کەوا کەسێك ئافرەتێکی خاوەن جوانی و دارای و نەسەب و حەسەب دێت و ئەلێ ئەم کارەم لەگەل بکە (زینا) ئەم پیاوەش ئەلێ : نا بەلکو من لە الله تعالی دەترسم .یەکەسەر ئەوەی الله تعالی پێ خۆش بوو زالی کرد بەسەر خۆیدا الله تعالی ش ئەوەندە پاداشتی گەورەی ئەداتەوە ئەیگەیەنێت بەوە لەو رۆژە گەرم و ناخۆشەدا لە ژێر سێبەری عەرشی خۆیدا حەشری بکا .

یاخود إبن القيم دەفەرمووی : (وإن صَعُبَ المرتقى)بەراستی زۆر زۆر ئەمە نارەحەتە . زۆر ئەمە نارەحەتە لەسەر دلان بەلکو دەبێ سەبرێکی باشی لەسەر بگریی .

## نیشانەکانی پێشێل کردنی حەزی نەفسی خۆت بۆ حەزی الله تعالی :

یەکەم : (فعل ما يحب الله إذا كانت النفس تكرهه وترب منه)ئەلێ : شتێك ئەزانم بدە کە الله تعالی پێ خۆشە ئەگەر نەفسەکەی خۆت حەزی پێ ناکا .

سەیر بکە کاتی دەست نوێژدێی سالانی زوو دەست نوێژ چۆن دەگیرا ئێستا دەست نوێژ چۆن دەگیرێی ، ئەگەر لەکیتابی حەدیسدا سەیر بکەین هەر لەو مەدینەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بەتایبەتیش

[٢٤٠]:سورة الأعراف اية : ٢٨

ئافرەتان بە رۆژ نەدەچوونە دەرەوە بەلکو بەشەو ئەچوون لەبەرئەوەی (ئاو دەست)سەر ئاو نەبوو لەشارەکاندا بەلکو ئەچوونە ئەو دەشتە .

کەسێك پێویستی بەدەست نوێژێك بێ لەناو مزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)جێگەی دەست نوێژ گرتن نەبوو ئەبوایە بچوبایتە ئەم دەستە لەوێدا ئەگەر ئاو نەبوایە بە بەرد خۆت خاوێن ئەکردەوە ئینجا دوای دەست نوێژێك ئەگرت ئینجا ئەهاتی بۆ نوێژ ، کەچی ئێستا دەست نوێژ گرتن چەند ئاسانە !دەی ئەوکاتە محافەزەیان لەسەر دەست نوێژ ئەکرد بەم حالەتە ناخۆشانەشیانەوە چەند قورس بوو لەسەریان محافەزە لەسەر دەست نوێژ ئێستا هەموومان یەك بەیەك مخسەلەکە و ئاوەگەرمەکە خانەوەکەش هەمووی داخیلییە هەتاوەکو لەزستان سەرمات نابێ کەچی ناچی دەست نوێژێك بگریی تەمبەلی دەستمان ئەگرێی پال دەکەوین بۆخۆمان کە شەو هەلدەستین یاخود هەر کاتێکیتر کە بمانەوی دەست نوێژ بگرین .

محافەزە کردن لەسەر دەست نوێژ بوە هۆی ئەوەی بیلال پێغەمبەر ببینی لە بەهەشتدا (صلى الله عليه وسلم) و دەنگی نەعل وپێلاوەکانی بێ ، بیلال فەرمووی: والله هیچ کاتێك دەست نوێژم نەشکاوە إلا دەست نوێژم گرتۆتەوە بۆ ئەوەی بەبەردەوام بە دەست و نوێژ بم .

ئەمە الله تعالی پێ خۆشە بەس نەفس پێ خۆش نیە ، هەمووتان ئەزانن ، تۆ سەیری خۆت بکە ئەوانەی کەوا لەگوندەکان ژیاون دەست نوێژ گرتنی گوندەکان چەند ناخۆش بوو ئێستاش لەمالەکەی خۆت چەند ئاسانە کەچی سەیر ئەکەی نایکەیت ، کەواتە تۆ ئەبێ هەستیت ئەم شتە کەمە لەبەر خاتری الله تعالی بیکەی ، وە بۆخۆشت بەسودە لە عیبادەتێکدا ئەمری ئەگەر بە دەست و نوێژەوە بمریی ئەمە نمونەیەکی زۆر زۆر ئاسان لەبەر چاوی هەموومانە .

ئینجا برۆ بۆ ئەوانەی تر کەوا نوێژ ناکەن ئەلێ بەخوا تاقەتم نیە ئەم دەست نوێژە هەموو جاری ئەم غوسلە بکەم ، خۆتان ئەزانن چونە لای ئافرەت پێویستی بە خۆشۆردنە ، ئەویش ئەلێ تاقەتم نیە هەموو رۆژی خۆم بشۆم ، زۆر بەی ئافرەتان بەدەست ئەمەوە دەنالێنن پیاوەکانیان ئەخەوێتەوە نە غوسل و خۆی دەشوا بەو جەنابەتەوە ئەمێنێتەوە هەر نوێژیش ناکا . ئەی بۆ باوکەی کچ ئەدا بەم جۆرە پیاوە کە خیانەت بکا لە الله ئینجا چۆن خیانەت ناکا لە کچەکەت .

دووەم : (تركوا ما تكره إذا كانت نفسه تحبه)نیشانەی دووەم ئەوەیە: تۆ شتێك تەرك بکەی ئەگەر الله تعالی پێ ناخۆشە ئەگەر تۆ پێشت خۆش بوو .

ئێستا هەر تەبیعەتی ئینسان غەیبەتی پێ خۆشە حەزدەکەی باسی فلان کەس بکەی بەخراپە بەس الله تعالی پێ خۆش نیە دەی تۆش وازی لێ بێنە ، چەند کەس لەغەیبەتدایە بەجاسوسی و بەنوسین و

بەتەقریر و بەقسەی ناشرین و هەر لێرە ئەچێتە دەرەوە یەکسەر ئەڵێ ئەمە چیە ئەم کابرایە ! دەست دەکا بەقسەکردن بە ئیمامەکە و ئەولا و ئەولا .

ئی تۆ ئێستا لێرە دانیشتبووی یادی الله دەکەی بۆ غەیبەت ئەکەی ،ئیتر بیگرە لە شتەکانیتریش کەنەفس چەند لادانی پێ خۆشە ئەم ئەیکات الله تعالی پێ ناخۆشە .

کەواتە یەك لەو نیشانە گەورانەی کە خۆشەویستی الله تعالی بۆ دلەکەی تۆ رائەکێشی ئەوەیە : الله تعالی چی پێ خۆش بوو بیکەی با تۆ پێت ناخۆش بێ .

هەر لەسەر ئەم ئەساسەیە ئێستا هەموو ئەم سەر ئەرزەی ئێمە رووناکاتە الله تعالی چونکە ئەوەی الله تعالی وتویەتی پێ خۆش نیە . الله تعالی دەست پاکی پێ خۆشە زۆربەی زۆری خەلك دەست پاکی پێ خۆش نیە ئەڵێ بەخوا حەرامەکەی لەگەل نەبێ تامی نیە ! پارووەکەی چەورە !بۆچی وامان لێهاتووە دەتۆ وەرە ئەوەی الله تعالی پێ خۆشە بەرێوەی بەرە و پیادەی بکە بزانم ئەبین بەچ کەسێك و ئەبین بەچ بەندەیەك لەبەندەکانی الله تعالی الله تعالی یارمەتیمان ئەدا و چۆن دەولەمەند ئەبین لەهەموو شتێکدا لەدین و ئیمان ومادە و هەموو شتێکدا .

ئەو شەریعەتی الله تعالی پێ خۆشە بیبەیت بەرێوە کەچی کەسانێکی زۆر پێیان خۆش نیە خوا خوایتیان پارچە پارچەی بکەن و حەز دەکەن ئەم قورئانە هەر نەمێنی ،ئەی کوا مەحیبەتی الله والله درۆئەکەی بلێی من خوام خۆش دەوێی حەز نەکەی قورئان رێبەری تۆ بێ راست ناکەی هەلت وەشاندەوە تۆ .

إبن القیم دەفەرمووی :(فبهذین الأمرین یصح مقام الإیثار)ئا بەم دووشتە حەزی خۆتت لابرد ئەو شتانەی کە الله تعالی پێ خۆشەبەرزت کردەوە بەم دوو خالە کەئێستا باسمان کرد .

إبن القیم دەفەرمووی :(ومؤنة هذا الإیثار شدیدة لغلبة الأغیار وقوة داعي العادة والطبع)بەلأم پێشت ئەڵێ بەلأم بەخوا زۆر قورسە ئەم شتە لەبەر ئەوەی بەتەبیعەت و عادەت وانیە شتەکان هەمووی بە پێچەوانەوەیە ئەبێت تۆ خۆت بیهێنیتەوە ئەبێ تۆخۆت خۆت راست بکەیتەوە نەفس بەرەو خواریت دەبا تۆ راستی بکەرەوە هەتاوەکو ئەمری ئەبێ تۆ لەژێر ئەم زەحتەدا بیت ئینجا ئەبی ئە بەندەیەکی راست ، خۆ بەندایەتی ئاسان نیە ،

ئێستا ئەگەر سەیدێك و بەندیەك سەیر بکەین ئەم بەندەیە چۆن لەلای گەورەکەی و سەیدەکەی خۆیی خۆشەویست بکا ! ئەگەر موخالفەی بکا خۆشەویست ئەبێ ؟!پێ بلێ هەستە ئەوەم بۆ بکە و بۆیی نەکا ئەمری پێ بکا و بەگوێی نەکا ! بەس ئەدی ئەگەر هەموو شتێکی بەگوێی بکا چۆن ئەو سەیدە چی پێ خۆش بوو ئەوە بکا ئەوە لەلای سەیدەکەی ئەبێت بە شەکر لەلای خۆی باشترین مالی ئەداتی بەقوربانی

ئەبی و بەساقەی ئەبێ ئەوهاین ئێمەش بەرامبەر بە الله تعالی والله مثل الأعلاء خۆ الله تعالی موحتاجی ئێمە نیە .

(فالمحنة فيه عظيمة)کەواتە بەراستی لێرەدا میحنەتێکی گەورە بەردەمی ئێمەدا هەیە لەبەر دەمی شتێکداین زۆر قورسە (والمؤنة فيه شديدة والنفس عنه ضعيفة فا)نەفسەکەشمان لاوازە بۆ ئەم شتە ، هەموومان نەفسی خۆمان ئەناسین ، الله تعالی دەفەرمووی: (وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا)[٢٤١] ئێمە لاوازین ئەبێ تۆ بە قوەتی ئیمان و زیکرو تەقوا و تاعە کردن و داواکردن الله خۆت بە هێز بکەیت (والله المستعان)مستعان واتا یاری دەدەر. الله تعالی یاریدەدەرمان بێ ،( ولا يتم فلاح العبد وسعادته إلا به)نەوالله سەرفرازی ئێمەش نایەتە جێگا إلا بەمە نەبێت (وإنه ليسير على من يسره الله عليه.)بەلاَم ئاگادارین کە قورسە لەسەر نەفسەکان کە بەقسەی الله تعالی ناکەن قورسە ئەما لەسەر کەسێك کە الله تعالی بۆی ئاسان بکا ئەها الله تعالی دەفەرمووی : (فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ)[٢٤٢] ئێمە رێگەکەت بۆ ئاسان دەکەین کەی ؟ (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ)[٢٤٣] ئەو کەسەی ببەخشێت و تەقوای هەبێ و ئەو کەسەی (وَصَدَّقَ)تەصديقی ئەم دينەی الله تعالی بکا .

تەصديق ئەوەیە : بەئیمان بەدل و بەزمان و بەعەمەل تەصدیقی بکەی بەراستی دابنێت هیچیان بێ هیچیان نابێ .

ئینجا الله تعالی دەفەرمووی : (فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ)[٢٤٤]ئێمە رێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان ئەکەین (وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ)[٢٤٥] ئەما ئەو کەسەی کەبەخلیلی بکا ئەو کەسەی کەوا دینی الله تعالی نەوێی ئەو کەسەی کەوا تەقوایی نەوێی ئەو کەسەی کە دینی الله تعالی بەدرۆ بخاتەوە والله الله تعالی دەفەرمووی (فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ)[٢٤٦] ئێمە رێگەی بەهەشتی لێ قورس ئەکەینەوە .

إبن القيم دەفەرمووی :(فحقيق بالعبد أن يسمو إليه وإن صعب المرتقى وأن يشمر إليه وإن عقمت فيه المحنه)کەواتە بەراستی جێی خۆیەتی کەوا بەندە هەلسێ بروا و بەرەو بەرزاییەکان بروا بەبەرو نشێویی نەروا حاشا لەبەر دەمتان بەرەو ئەخلاقی نزم نەروا بەرەو شتە خراپەکان نەروا بەلکو بەرەو بەرزی بروا یەك لە دوعایانەی کە لەنێوان دوو سوجدەکەدایە ئەلێ (ورفعنی) یا الله بەرزم بکەرەوە ، یا الله بەرزمان بکەیتەوە بۆ ئەخلاقی جوان و بۆ عیبادەتی بەرز بۆ کەسایەتیکەی بەرز بۆ ئەوەی لەبەر چاوی تۆ

[٢٤١]:سورة النساء اية : ٢٨
[٢٤٢]:سورة الليل اية : ٧
[٢٤٣]:سورة الليل اية : ٥-٦
[٢٤٤]:سورة الليل اية : ٧
[٢٤٥]:سورة الليل اية : ٨-٩
[٢٤٦]:سورة الليل اية : ١٠

نەکەوین ئەی الله تعالی ، ئەی قور بەسەر ئەو کەسەی کەوا لەبەر چاوی الله تعالی دەکەوێی (ويحمل فيه خطرا يسير لملك عظيم وفوز كبير)راستە نارەحەتیەکان لەدونیا ناخۆشە بەلاّم تۆش شتێکی گەورەت لەبەردەم دایە کە بینینی الله تعالی و بەهەشتەکەیەتی مەیگۆرەرەوە ، هەرکاتێك مەعصیەتێك و لادانێك ئینحرافێك هاتە بەر ڕێگەت یەکسەر بیر لە الله تعالی بکەرەوە (وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ)[٢٤٧] ئەو کەسەی لەبەردەمی الله تعالی بترسێ لەبەر مەقامی الله تعالی بترسی لەبەر محاسەبەی الله تعالی بترسی الله تعالی ئەفەرمووێی دوو بەهەشتی ئەدەمێ ، ئەوەت بیر بکەوێتەوە ، زۆر لەزانایان ئەفەرموون هەرکاتێك تاوانێك بهاتیە پێشەوە ئەم ئایەتەم ئەهاتە بەرچاو تاوانەکەم نەئەکرد و ئەموت مەقامی الله تعالی گەورەترێکە لە تامی گوناهەکە چونکە تامی گوناهەکە هەر ئەروا بەلاّم مقامی الله تعالی بینینی الله تعالی هیچ کاتێك تەواو نابێ بەهەشتی الله هیچ کاتێك تەواو نابێ ،ئەما بەندایەتی بۆئینسان و بەندایەتی بۆخۆم و ئارەزوەکانم تەواو ئەبێ بەمردن هەمووی تەواو ئەبێ وە لەزەتەکانیش کەمن .

إبن القيم دەفەرمووی: (مبتل الله سبحانه وتعالى عبده المؤمين بمحبة الشهوات والمعاصى وميل نفسه إليها إلا لسوقه بها إلى محبة ما هو أفضل منها وخير له وأنفع وأدوم) الله تعالى کە ئێمە تاقیکردۆتەوە بە ئارەزووەکان و بەمعاصی و شەهەواتەکان بۆ ئەوە تۆ تاقی ئەکاتەوە بۆ ئەوەی بتگەیەنێت بەشتی بەرزتر بەو مانایەی شتێکی کەم دەخاتە بەردەمت ئەلێ مەیکە شتی بەرزترت ئەدەمی ، ئەها ئەمە زینا ئەوە دزی ئەوە سەرەوەت ئەوە سامان ئەوە مولکایەتی بەناحەق ئەمانەت هەمووی لەبەردەمدایە تامەکەی زۆرخۆشە ئەلێ بۆیە ئەمەم خستۆتە بەردەمت لەولاشەوە پێ وتی بەهەشت و کەرامەتی هەتاهەتایی و نەمردون بینینی الله تعالی کە گەورەترین لەزەت بیننی الله تعالی یە ئەوەت لەبەردەمدایە جا کامیان ئەکەی بیکە ! !ئەوەی دونیات کرد ئەوی تر نابینی ، ئەلێ وازی لێ بێنە برۆ بۆ ئەمەی تر (وليجاهد نفسه على تركها له سبحان فتورثه تلك المجاهدة الصول إلى المحبوب الأعلى)ئا ئەم تێکۆشانە ئەتگەیەنێت بە خۆشەویستیە گەورەکە کە الله تعالی یە واز لەم شتە خۆشەویستانەی دونیا بێنە کەوا کاتی و برا وە و خراپ و تێکدەری باری هەمووشتێکی ئێمەن لێ گەری بۆ خۆشەویستیەکەی الله تعالی.

(فكلما نازعته نفسه إلى تلك الشهوات، والشتدت إرادته لها وشوقه إليها صرف ذلك الشوق والإرادة والمحبة إلى نوع العالي الدائما)هەر کاتێك ئەمانە هاندەر بوون بۆ ئەوەی تۆ بیان کەیت لەولاوە ئەو وەعدانەی الله تعالی بۆ تۆ ئەبێتە هاندەر بۆ ئەوەی نەیکەت و بەرەو الله تعالی برۆیت (فكان طلبه له أشد

[٢٤٧]:سورة الرحمن اية : ٤٦

وحرصه عليه أتم)کەواتە تۆ لێرەدا بەراستی زۆر بەقورسی دەست دەگریی بەوشتانەی کەوا الله تعالى پێ خۆشە بۆئەوەی بگەیت بەم ئامانجە گەورەیە کە سەرفرازییە لەرۆژی قیامەت .

نمونەیەك ئەهێنێتەوە و ئەلێ : (ألا ترى ان من مشي الى محبوبة على الجمروالشوك أعظم ممن مشي إليه راكبا على النجائب)ئەلێ ئەگەر کەسێك خۆشەویستێکی هەبێ لەسەر ئاگر بۆی بروا یەکێکیش بەسواری باشترین ئەسپەوە یاخود حوشتەرەوە بۆیی بروا کامیان خۆشەویستەکەی گەورەیە ؟! ئەوەی لەسەر ئاگرەکە بۆیی ئەروا ئەلێ بەخوا لەسەر ئاگر بۆت دێم بەومانایەی ئەوەندەم خۆش دەوێی .

ئەمەش ئاگرەکانە ئەم معاصی و شەهەواتانە ئاگرەکانە و مەیکە نەفسی خۆت بگرەوە (فهو سبحانه يبتلي عبده بالشهوات)بەئارەزووەکان ئێمە تاقی ئەکاتەوە (إما حجابا له عنه أو حاجبا له)[٢٤٨] ئەها دووشتە : یان حیجابە (له عنه)یانی ئەبێتە لەمپەر لەنێوان بینینی تۆ و الله تعالى ئەو شەهواتانە یاخود نا بەلکو ئەبێت بە حاجیب دەرگەوان ئەتبات بۆ لای الله تعالى . معاصیەکان و شەهەواتەکان دوو حالەتیان هەیە یان دەبێت بە حیجاب واتا ئەتگرێتەوە لەوەی الله تعالى ببینی چونکە ئەیکەیت ، یاخود ئەبێت بەدەرگەوانی خۆشەویستی الله و ئەتگەیەنێت بۆلای الله تعالى چونکە نایکەیت الله تعالى لەوانەمان بگێرێی .

## پێنجەم :

(مشاهدة بره وإحسانه وآلائه، ونعمه الباطنة والظاهرة. فإنها داعية إلى محبته.)براکانم ئەگەر بتەوێی خۆشەویستی الله تعالى لەدلتدا زۆر بێ سەیری چاکەکانی الله بکە بۆتۆ چاکەکانی الله تعالى بۆ ئەم بونەوەرە بۆتۆیی ئینسان سەیر بکە چەند چاکەی لەگەل کردووی چونکە بەراستی ئەگەر من لەکاتی موحتاجیدا بیت چاکەیەکت لەگەلدا بکەم هیچ کاتێك لەبیرت ناچێتەوە .

بۆنمونە کابرا پێویستی بە قەرز هەیە و قەرزارە و زۆرنارەحەتە یەکێك پارەی بداتێ لەو قەرزارییە رزگاری بکا تخوا هەتا هەتایە ئەم پیاوەی لەبەر چاو دەبێ یان نا هەرئەلێ یارمەتی دام لەو رۆژە رەشە ناخۆشە یارمەتی منی دایە زۆر موحتاج بووم الله تعالى جەزای بداتەوە یەك چاکەی لەگەلدا کردی هەتا ئەمری لەبیرت ناچێتەوە . بەرەستا نەهاتووە ! ؟ئەی ئەو خوایەی کە هەموو ژیانی ئێمەی چاکەیە کەس ناتوانی

[٢٤٨] : شرح الأسباب والأعمال التي يضاعف بها الثواب

بیژمێری ئەتوانی چاکەکانی الله تعالی بژمێریی ؟! الله تعالی دەفەرمووی (وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا)[٢٤٩] ئەگەر تۆ بتەوێی نیعمەتەکانی الله تعالی بژمێریی ناتوانی بیژمێریی .

جا بژاردن دووانە :

یەکەم : بلێت ئەمە و ئەوە و ئەمەیان .

دووەم : شوکری نیعمەتە .

بەئێمە ئەکرێی شوکری نیعمەتی الله تعالی !؟ دەوەرە بەس شوکری چاوکەت بکە چاوت کوێر بکە و دایخە هیچ دکتۆرێك نەتوانی بۆتی چاك بکاتەوە بەس چاوت ،ئینجا وەرە سەر نوقسانەکانی خۆت لەژیانتدا چۆن ئەچی بۆ سەر ئاو و چۆن خۆت پاك دەکەیتەوە .یاخود نیعمەتی بۆن بابەس بۆنت نەبێ بزانم لەزەت لەیەك خواردن ئەبینی لەژیانتدا ئەوەی کە تووشی پەسیو و هەلامەت دەبێ چ خۆشیەك لەخۆشترین خواردن دەکەی هیچ ناکەی ، تۆ بەبەردەوام لەزەت لەم بۆنە ئەکەی کەچی بیری لێ ناکەیتەوە  ئەم خوایە ئەم نیعمەتەی پێداویی . ئەی گوێچەکە ئێستا خۆت کەر و کوێر و لال بکە ئەی زمان ! پیاوێکم بینی لەحەیاتی خۆمدا کوێر و کەڕ و لاڵیش بوو ئێستا وەرن لەگەلمدا سەیری یەك بەیەکی ئەم هەستانە بکەن :

ئەگەر کەڕ بی هیچ ئەبیستی ؟!کەواتە تۆ لەژیانت قسەی هیچ کەس نابیستی نەژنەکەت نەکورەکەت نەکچەکەت نەدەرەوە نەتیرێك نەهیچ شتێك بیستی لەوشتانەی کەوا دەنگیان هەیە .

چاو :لەژیانت مندالەکەت نابینی هیچ کاتێك ژن و خێزان و مال و مندالت نابینی ئەوەی کە کوێرە و نازانی شێوەی خێزان و مال و مندال و خێزانەکەی چۆنە یاخود ئەم خەلکە چۆنە جوانیەکان چیە و جوانی هەمووی لێ حەرام کراوە.

زمان:دەبا زمانت نەبێ ئەتوانی قسە بکەی ناتوانی تەعبیر بداتەوە بۆتۆ ناتوانی مەرامەکانی بۆتۆ ئاشکرا بکا و ئەبێت بەپەنجە و ئیشارەت تێت بگەینێ .

پیاوێکی ئەوهام بینی ئەم پیاوە سبحان الله بەم حالەتەیەوە نوێژی ئەکرد بەدەست تێیان ئەگەیاند پیاوێك لەگەلیدا حەرەکاتی دەستی ئەکرد بەدەست پێ دەوت ئەمە کورەکەتە ئەوە فلان کەستە ئەی وت بە بۆن مندالەکەی خۆم ئەناسمەوە بۆنی مابوو ! ئەی ئەگەر بۆنیشی نەمێنێ تۆ بیر بکەرەوە !!

دەی الله تعالی دەفەرمووی کافران ئەوها ئەخاتە ناو جەهەنەمەوە (صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ)[٢٥٠]هەرسێکی لەمەکانێکی تەسکەوە ئەتسوتێنی لەناو جەهەنەمدا .

[٢٤٩] :سورة النحل اية : ١٨
[٢٥٠] :سورة البقرة اية : ١٨

تۆ لەدونیادا کە چەندێك نارەحەتە خۆ تووشی سزاش نابی بەئاگر بتسوتێنن لەوانەیە موراعاتیش بکرێی و خەلك بەزەیت پێدا بێتەوە بەلاّم لەناو جەهەنەمدا الله تعالی ئەتخاتە ناو شوێنێکی زۆر تەسك و تار و نارەحەت ئینجا ئەتسوتێنی بەم حالەتەوە . قورسە زۆر قورسە بابەتەکە .

کەواتە نیعمەتەکانی الله تعالی زۆرە لەسەرمان تۆ ناتوانی شوکریان بکەی واتا ناتوانی بەتەواوی شوکریان بکەی ! بۆیە الله تعالی دەفەرمووی : (**قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ**)[٢٥١] الله تعالی لەپێش ئەم ئایەتەدا باسی قورئان ئەکا لەدوایدا کە باسی قورئانی کرد سبحان الله یەکەسەر باسی ئینسان دەکا (**فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ (١٣) مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ (١٤) بِأَيْدِي سَفَرَةٍ (١٥) كِرَامٍ بَرَرَةٍ (١٦) قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ (١٧)**)[٢٥٢] الله تعالی دەفەرمووی : بەنەعەلت بی ئەی ئینسان بۆ بەقسەم ناکەی ئەی کافر ئەوە الله تعالی وامان پێ دەلێ ، من ئەو هەموو نیعمەتەم دایتێ تۆ بۆ کوفری نیعمەتی من دەکەی کێ تۆیی بەخێو کرد کێ تۆیی دروست کرد با هەموو سولتەی دونیا هەلسێ چاوێکت بداتێ کە لەدەستت دا ! ؟با هەموو سولتە و خۆشەویستانی دونیا هەلسێ شتێکت بداتێ لەوشتانەی کە لەدەست داوە لەوشتانەی کە موستەحیل بێ دکتۆرەکان بۆت بهێنەوە دەبا بیهێنێتەوە ؟!

کەواتە سەیرکردنی نیعمەتەکانی الله تعالی دەبێتە هۆی ئەوە ئینجا الله تعالی ت خۆش بوێی ئینجا ئەلێ بەراستی الله تعالی من تۆم خۆش دەوێی بەراستی کەس جێگەی تۆ ناگرێتەوە لەدلی مندا جگە لەتۆ بەراستی هیچ کەسێك ناتوانی ئەوە لەگەل مندا بکا نەمەلائیکە و نەپێغەمبەران و نە پیاوچاکان چ جای پیاو خراپان کە ئەمرۆ لەناو دلی خەلکەکاندان . پێغەمبەرێك ئەتوانی شتێك بدا بەتۆ مەلائیکەیەك ئەتوانێ شتێك بدا بەتۆ ناتوانی چ جای خراپکاران لەدلتدا بوون و بۆتە خواو بۆتە خۆشەویست و سەردارو سەکردەی تۆ چ جای نەفسەکەی خۆمان کە الله تعالی دەفەرمووی : (**أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ**)[٢٥٣] ئارەزووەکانی خۆیی ئەکا بە خوا و ئەیپەرستێ و بەقسەی ئەکا ، پیاو هەبووە لە رەمەزاندا ئەلێ من ناتوانم سەبر لەسەر خواردن و خواردنەوە بگرم کاکە لەبەر الله ئەگەر خۆشەویستی الله تعالی لەدلیدا بێ ئەتوانی بەس خۆشەویستیەکە نیە لەبەر ئەوە بەرۆژوو نابێ ، خۆشەویستەکەت پێت ئەلێ ئەمە مەخۆ ئی مەیخۆ خۆشەویست وتویەتی خوای خۆشەویست ئەو هەموو چاکەی لەگەل تۆدا کردوە و تۆ تاقی دەکاتەوە بزانێ بەقسەی دەکەی !

[٢٥١]:سورة عبس اية : ١٧
[٢٥٢]:سورة عبس
[٢٥٣]:سورة الفرقان اية : ٤٣

الله تعالى دەفەرمووی : (وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ)[٢٥٤] هەرچیەكتان داوا كرد دای بە ئێوە ، هەموو شتێكی بۆ ئێمە فەراهەم نەكردوە الله تعالى دواتر هەر لەم ئایەتە دەلیّ (وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا)بەلاَم ئەگەر بتانەوێی بیژمێرن یان شوكری بكەن ناتوانن ئەوە بكەن ، ئینجا بزانە لەدوای ئەمە ئایەتەكە چی دەلیّ : (إِنَّ الْإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ)بەراستی ئینسان زالمە و بەراستی كافرە ، كیّ كافری كردین ؟! الله قەولەكەی راستە الله تعالى .

زۆرجار باسی تەكفیر لەگەل ئێمەدا دەكرێی تەكفیر واتا كافر كردن .ئەگەر الله تعالى كەسێك كافر بكا حەقە یاخود حەق نیە !؟ ئەورۆ ئەلیّ نابیّ تۆ كەس كافر بكەی شەیطانیش تۆ ئەبیّ بەقوربانی بی ئەبیّ لەگەلیدا بژی ، ئاخر چۆن لەگەل شەیطان بژیم ، داوایّن پیسان و موجریمان و كافران و مولیحیدان و بێباوەران ئەلیّ ئەبیّ تۆخۆشت بوێی وئێمە هەموو براین ، نەوالله برام نیە ئەمە نەوالله یەكێك دووژمنی خۆشەویستەكەم بیّ منیش دووژمنی ئەوم . ئەو كەسەی وا دەلیّ با كەسێك دووژمنی خێزانەكەی بیّ یان كورەكەی یان كچەكەی بزانم خۆشی دەوێی بلیّ قەیناكە هیچ كێشە نیە و موشكیلە نیە ؟! تەحدا دەكەم هەركەسێك لەسەر ئەم زەمینە بژی و دەسەلاتدار بیّ كەسێك دووژمنایەتی بكا ئەو بۆمن بهێنێتەوە و بلیّ قەیناكە موشكیلە نیە ئەوە برامە لەئینسانیەتدا با دووژمنایەتیشمان بكا من هەر خۆشم دەوێی تەحدا دەكەم وابلیّ ؟!ئەی باشە بۆخۆت رازی نابیّ بۆ بۆ الله تعالى رازی دەبیّ بۆ الله !! دووژمنی خوا بیّ بلیّ والله با برات بیّ نابیّ الله تعالى ئەمەی دانەناوە (أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ)[٢٥٥] الله تعالى ئەمەی داناوە كە رێز لە خواكەم نەگرێی ئەوەتا الله تعالى خۆیی پیّ دەلیّ (إِنَّ الْإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ)كەواتە الله تعالى هەركەسێك كافر بكا كافرە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەركەسێك كافر بكا كافرە كە پێت دەلیّ داوات لەغەیری الله كرد تۆ موشریكی بەلی موشریكی هەتاوەكو ئێواری مەلا بلیّ موشریك نیە نەخێر الله و پێغەمبەر وتویەتی موشریكە (صلى الله عليه وسلم) بە ئەبو جەهلی وت موشریك مەلای دونیا هەموو هەلسیّ ئەتوانی بە ئەبو جەهل نەلی موشریك !؟موشریكە تەواو كافر بوو .

الله تعالى سەرنجمان رادەكێشیّ بۆ ئەو نیعمەتانە و لەقورئاندا دەفەرموویێ : (قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مِنَ الرَّحْمَٰنِ)[٢٥٦]كیّ ئێوە ئەپارێزی لە الله تعالى ، ئەگەر الله تعالى بیەوێی لەناوتان بەرێی و ناخۆشیتان بەسەردا بێنیّ كیّ یە ئەتوانی بتان پارێزێی !!الله تعالى دەیەوێی پێمان بلیّ ئادەی كیّ

[٢٥٤]:سورة إبراهيم اية : ٣٤
[٢٥٥]:سورة الفتح اية :٢٩
[٢٥٦]:سورة الأنبياء اية :٤٢

ئەتپارێزێی لەدەسەلاتی الله !؟ الله تعالی ئێستا لافاویك بهێنی بەسەر ئەم شارەدا الله تعالی پەنامان بدا کێ ئەتوانی لایبدا !؟بومەلەرزەیەك بنێری هەمووی تەخت بکا کێ ئەتوانی لایبدا !؟ ئەوە نیعمەت نیە ! کەواتە بوونی نیعمەتەکان هەر نیعمەتە لادانی زەرەرەکان لەسەرمان ئەویش هەر نیعمەتە لەدوای ئەم ئایەتە الله تعالی دەفەرمووێی : (**بَلْ هُمْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ**)[٢٥٧] دیقەت بدەنێ ئیشارەتی داوە بەزیکر و بەقورئانەکەی ، بەلاّم ئەمانە لەیادەکەی الله و لەقورئانەکەی الله و لەپەیامەکەی الله پشتیان هەلکردوە ، کەواتە ئەمە هەرەشەیە هەرەشە ،، خۆتان بگرن بۆ رۆژی قیامەت ،خۆ لەدونیاشدا تۆلە ئەسەنێ بەس لەقیامەت گەورەترێکە عەزابەکە الله تعالی پەنامان بدا . دەی برا و خوشکی موسلمانم هەلسە الله تعالی ت خۆش بوێی و نیعمەتەکانیت لەبەر چاو بێت و سوپاسی بکە و بەقوربانی بە هەرچی کەسێك قسەیەکی کرد هەتاوەکو خۆشت قسەیەکت کرد و مخالەفەی الله تعالی بوو بەقسەی خۆت و غەیری خۆشت مەکە ئینجا ئەبی بەبەندەی راستەقینە و ئەبی بەخۆشە ویستی الله تعالی وە ئینجا خۆشەویستی راستەقینەی الله تعالی دێت بۆ دلەکەت .

ئەبو موسای ئەشعەری (رەزاو رەحمەتی الله تعالی لێ بێت)ئەفەرمووێی :پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (ما أحد أصبر على أذى سمعه من الله، يدعون له الولد، ثم يعافيهم ويرزقهم)[٢٥٨] سەیری ئەم نیعمەتەش بکە ، یانی الله تعالی پەلە ناکا لە سزادانی تۆ ئەلێ هیچ کەسێك وەکو الله تعالی نیە صەبری هەبێ لەسەر نارەحەتیەکان کە بەرامبەری ئەکرێی ، ئێمە با هەموومان خۆمان تاقی بکەینەوە تا چ رادەیەك صەبر ئەگری ئەگەر نارەحەتیەك بەرامبەرت بکرێی یان جونێکت پێ بدرێی مالت بدزرێی و ئیهانە بکرێی بکوژرێی چەنێك صەبرت هەیە ؟! ئەی الله تبارك وتعالى سەیری بکەن ، ئەفەرمووی : هیچ کەسێك وەك الله تعالی صەبری نیە بەرامبەر ئەو خراپانەی کە بەرامبەری ئەکرێی یەکێك لە گەورەترین خراپەکان کە ئەرز و ئاسمان خەریکە شەق ئەبا ئەوەیە بلێ الله تعالی کوری هەیە !وەك ئەو گاوەرە کافرە بۆگەنانەی کە ئەلێن عیسا کوری الله یە ، ئەلێ لەکاتێکدا کە واش ئەلێن ئایەتەکانی قورئان پێمان ئەلێن خەریکە ئەرز و ئاسمان شەق دەبا لەداخی ئەم قسەیە هەتاوەکو الله تعالی بۆمان باس دەکا و دەفەرمووێی : ئاسمان لەداخی ئەم قسەیە دەکەوێتە خوارەوە الله تعالی دەیگرێتەوە ئەلێ راوەستە قەیناکە حیلم و صەبرم هەیە یارمەتیشیان ئەدا و بارانیشیان بۆ ئەبارێنی مندالیشیان ئەداتێ

[٢٥٧] : سورة الأنبياء اية :٤٢

[٢٥٨] : الكتب » صحيح البخاري» كِتَاب التَّوْحِيدِ» بَاب قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ...رقم الحديث :٦٨٥٤

وبەخێویشیان ئەکا حیلمیان لەگەل ئەگرێی هەتاوەکو بگەرێنەوە ئەمە نیعمەتی گەورەی الله تعالی یە (ثم یعافیهم ویرزقهم)ئیشەکەیان زۆر زۆر تاوانێکی قورس و گرانە بەس الله تعالی صەبر ئەگرێی حیلمی هەیە لەبەر دەمی بەندەکانی بۆ ئەوەی بگەرێنەوە ئەمەش گەورەترین نیعمەتە ، تۆخۆت جاری وایە دەکەویتە ناو گوناهێکەوە خۆت رقت لەخۆت هەلدەستێ گەر بەدەست خۆتبێ جاری وا کە دەگەرێتەوە خەریکە خۆت ئینتحار بکەی و خۆت بکوژی لەتاو ئەم تاوانە و ئەلێ خۆزگە ئەم کارەم نەکردبایە ، کەچی الله تعالی صەبری لێ گرتووی و سەیریشت ئەکا یارمەتیت ئەدا بۆ ئەوەی تەوبە بکەیت .

نیعمەتەکانی الله تعالی زۆرە لەسەرمان دە ئەو نیعمەتانە لەبەر چاو بگرن بۆ ئەوەی خۆشەویستی الله تعالی زۆر بێ لەدلەکانمان .

تەوبە کردن : نیعمەتی الله تعالی یە کە تۆ ئەگەرێتەوە بۆلای الله تعالی و الحمدلله تەوبەت کردوە بەروێکی سپی ئەگەرێتەوە بۆلای الله ئەمە نیعمەت نیە ! ؟لەسەر شیرك و کوفرو ئیلحاد ناگەرێتەوە بۆلای الله هەتا هەتای بیت لەجەهەنەمدا . کێ یارمەتی دایت ئەم تەوبە بکەیت کێ ؟ کێ دلەکەی نەرم کردی ؟ ئەوە نیعمەت نیە ؟!.

الله تعالی لەبەشی ئاخیری شەودا دێتە خوارەوە ئەلێ کێ داوای شتێکم لێ دەکا تاوەکو بیدەمێ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تاوەکو لێخۆشبم !کێ دوعایەك ئەکا قبولی بکەم .

ئالەو کاتەدا هەلسە و بلێ یا الله من دوات لێ دەکەم داوای بینینی تۆ ئەکەم داوای بەهەشتەکەت لێ دەکەم داوا ئەکەم لەدوینا و بەهەشت چاکەم لەگەلدا بکەی داوای ئەوەت لێ دەکەم کە بمکەیت بە بەندەی خۆت نەك بمکەیت بە بەندەی خۆم و بەندەکانیتر ، ئەمە داوا بکە لە الله تعالی .

یەکێکیتر لەگەورەترین ئەوشتانەی کەوا نیعمەتی الله تعالی تێدا بخوێنیتەوە وسەیری بکەی ئەوەیە کەوا هەلت دەبژێریی کەوا ببی بەخۆشەویستی الله تعالی خۆیی ئەتداتێ خۆی یارمەتیت ئەدا دەست پاك و چاو پاك بی دوایش ئەجرت ئەداتەوە خۆی یارمەتیت ئەدا تاعە بکەی بەقسەی الله تعالی بکەی دوایش لەولاوە خۆیی یارمەتیت ئەدا وە خۆیی پاداشتت ئەداتەوە ئەمە نیعمەتی الله تعالی یە .

کەواتە لێرەدا سەیر ئەکەین لەخوێندنەوە نیعمەتەکانی الله تعالی الله تعالی ت لا خۆشەویست دەبێ ، دەبا باسی بکەین لەنێوان یەکتریدا ، الله تعالی دەفەرمووی : (وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ)[٢٥٩] دەی نیعمەتەکانی الله تعالی باس بکەن کەچویەتەوە لەگەل خێزانت بلێ الحمدلله ئافرەت الله تعالی پێش هەموو شتێك ئیمانی داوینەتێ الحمدلله واز لە فەقیری و ئەوشتانە بهێنە ئەمەش نیعمەتە بەسەرمان کێ دەلێ

[٢٥٩] :سورة الضحى اية : ١١

ئەگەر دەولەمەند بوويانە طوغيانمان نەئەكرد كێ ئەلێ ئەگەر دەولەمەند بوويانە ئەرەق خۆرێك نەئەبووين گوێمان لە عيبادەت و خوا ناسی هەر نەدەبوو دلی يەكتری بدەنەوە نيعمەتی الله لەنێوان خۆتاندا باس بكەن الحمدلله كە بەچكە يەهودی نين الحمدلله كە بەچكە گاور نين الحمدلله كە بەچكە بوزی و دار پەرست و بەرد پەرست و هەوا پەرست نين الحمدلله لەنێوان خۆتان ئەم نيعمەتانە بلاو بكەنەوە هەر باسی الله تعالی بكەن الله تعالی زۆری پێ

خۆشە.

**شەشەم:**

(مطالعة القلب لأسمائه وصفاته، ومشاهدتها ومعرفتها، وتقلبه في رياض هذه المعرفة، فمن عرف الله بأسمائه وأفعاله، أحبه لا محالة.)لەدوای ئەوە وتمان ئەگەر سەيری ئەوچاكانە بكەی كە الله تبارك وتعالی لەگەل ئێمەدا كردويەتی كەبێ پايانە بێگومان ئەمە رات ئەكێشێ بۆ ئەوەی الله تعاليت خۆش بوێی وە خۆشەويستی الله تعالی لەدلتدا زۆر زۆر ئەكا وە وتمان دلەكان لەسەر ئەوە رەهەم كراون هەركەسێك چاكەيان لەگەلدا بكرێی تۆ خۆشت ئەوێی بەلام ئەمرۆ شتێك ئەخەينە پالێ ئەوە .

ئەگەر هەركەسێك چاكەت لەگەلدا بكا هەتاوەكو كەسەكە خراپكاريش بێ بۆنمونە (مطعم بن عدی)خۆی و ئەولادەكانی ئەوكاتەی كە پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم) لە طائيف بەردەباران كرا لێدراو عەزاب درا و

هاتەوە بۆمەککە ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیجرەتی کرد بۆ طائیف بۆ ئەوەی لەویدا دەعوە بکا بەلام لەوێدا دەریان کرد بەقسەیان نەکرد کە هاتەوە لەوێی بێتەوە بۆ مەککە مەککەیەکانیش نەیان هێشت بێتەوە بۆ مەککە وتیان تۆ تازە نابێت بێتەوە نێو شاردا چەند ناخۆشە ! کەسێکی کافر ناوی مطعمی کوری عدی بوو خۆیی و ئەولادەکانی بەزەییان بەپێغەمبەردا هاتەوە (صلى الله عليه وسلم) کافریش بوو کەچی ئەم پیاوە هەلسان چونە دەرەوە و پێغەمبەریان هێنایەوە (صلى الله عليه وسلم)وتیان: نابێت کەس دەستکاری بکا ئەوە لەژێر حیمایەی ئێمەدا دەبیٚ و ئەگەرێتەوە بۆ مەککە بەمەرجێکیش ئەم خێزانە کافربوون ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەمەی لەبەر چاو گرت ئەو کاتەی چوو بۆ مەدینە و هیجرەتی کرد شەری بەدر روویدا لەکافران ٧٠ کەس کەوتە دەستیەوە و بەدیل گیران فەرمووی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئێستا ئەگەر مطعم بمابایە ئەم دایە دەستی .

ئەمە نمونەیەك بوو هێنامەوە بۆ ئەوەی ئەگەر کافرێکیش چاکەت لەگەلدا بکا تۆ لەبەر چاوی را ئەگەریی نەك لەبەر ئەوەی کوفرەکەیت خۆش دەوێی چاکەکەی کە کردویەتی بەرامبەرت تۆش مەوقیفت دەبیٚ لەبەرامبەری .

ئەی ئەگەر ئەو کەسەی کە چاکەت لەگەلدا دەکا کەسێکی زۆر بەرێز و بەحورمەت رێك و پێك و بەئیمان و چاکەکاربیٚ بۆ نمونە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چاکەت لەگەلدا بکا لەکاتێکدا خۆی چەند پاك و چاك و بەرێز و هەلبژێردراوی الله تعالى یە چاکەشت لەگەلدا بکا دووشت ئەچێتە پال یەکیتریەوە ئەو ئەخلاقە جوانەی ئەو هەیبووە لەگەل ئەو چاکەی کە لەگەلت دەکا . باشە ئەی ئەگەر الله تعالى بیٚ ! کە بەندە هەرچیەك بیٚ هەر نوقسانە هەتاوەکو پێغەمبەرانیش کەم و کوریان هەر هەیە بەشێوەی خۆیان ،

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسی خۆی ئەکا داوای لێخۆشبوون لە الله تعالى دەکا ، بەس الله تعالى خاوەنی ئەسمائ و صیفاتی زۆر زۆر کامیل و جوان و رێك و پێکە ئەو چاکەت لەگەلدا بکا .

کەواتە تۆ وەرە ئەسمائ و صیفاتەکانی دیراسە بکە ئەلیٚ (مطالعة القلب لأسمائه وصفاته)پێویستە ئێمە برۆین کتێبی عەقیدە بکەینەوە بزانین الله تعالى چەند ناوی هەیە چەند ناو سیفەتی هەیە تەبعەن ناو و سیفەتی زۆر زۆرە و بیٚ پایانە بەلام ئەوانەی بۆ ئێمە باسکراوە کە شتێکی کەمی بەئێمەداوە و بۆی باسکردووین الله تعالى لەقورئاندا وەرە تۆ سەیری بکە بۆ نمونە تۆ سەیری (الرحمن الرحيم)سەیر بکە ئەمانە هەردووکیان ناون سیفەتی الرحمن الرحيم رەحمەتە واتا الله تعالى رەحمەتی هەیە کاتێك کە تۆ دێت و دیراسەی ئەم ناو و ئەم سیفەتە دەکەی کە الله تعالى بەزەیی و میهرەبانی هەیە بە بەندەکانی لەکاتێکدا کە ئەم هەموو چاکەی لەگەلدا کردووین و خاوەنی ئەم هەموو سیفەتە بەرزانەشە ئەبێتە هۆی

ئەوەی کە تۆ خۆشت بوێی دیراسەکردنی ناو و سیفەتەکانی الله تعالی ئەبێتە هۆی ئەوەی کە تۆ الله تعالی ت زۆر زۆر خۆش بوێی ، کە ئەزانی الله تعالی کەریمە و واسیعە .

الله تعالی لەناوەکانی کە تۆ دیراسەی دەکەی ئەوەیە کە تۆ هیدایەت ئەدا ئەوەیە کە بەندەکانی خۆیی خۆش دەوێی ئێستا مەجالی ئەوە نیە یەك یەك باسیان بکەین بەس لێرە ئاماژە بەوە دەکەین کە دیراسەکردنی ناو و سیفەتەکانی الله تعالی مەحبەتی الله رادەکێشێ بۆ دلەکەی تۆ ( وهذا الباب إنما يدخل منه إليه خواص عباده وأوليائه)[260] بەلاّم ئاگاداربە ئەم دەرگایە هەموو کەسێك لێ ناچێتە ژوورەوە إلا خوێندەواران و ئەوانەی کە تایبەت مەندن بە الله تعالی وە ، وە ئەولیای الله تعالی ن و دەرجەی ولایەتیان گەورەیە (وهو باب المحبين حقاً الذى لا يدخل منه غيرهم)ئەمانە نەبێ لێ ناچێتە ژوورەوە زۆربەی عەوام ئاگایان لەمە نیە (لا يشبع من معرفته أحد منهم، بل كلما بدا له منه علم ازداد شوقاً ومحبة)هەرکاتێك ناو و سیفەتێك دیراسە دەکا حەزدەکا ناو وسیفەتێکیتر دیراسە بکا لێ تێر نابێ .

هەر إبن القيم دەفەرمووی (فإذا انضم داعى الإحسان والإنعام إلى داعى الكمال والجمال لم يتخلف عن محبة من هذا شأنه إلا أردأ القلوب وأخبثها وأشدها نقصاً وأبعدها من كل خير،)[261] ئەگەر بێتوو ئەم دووشتە بکەونە پال یەکیتری یانی چاکە کردن لەگەل تۆدا وەکو کەسێك چاکە بکا لەگەل تۆدا ئەویش ناو و سیفەتێکی زۆر و جوان و کەمالی هەبێ والله ئەو کەسەی ئەوی خۆش نەوێی خراپترین دلی هەیە وە خراپترین بەندەی هەیە ئەوەی ئەو کەسەی خۆش نەوێی کە ئەو دوو سیفەتەی تێدایە.

هەتاوەکو لە ئینسانەکاندا ئەگەر کەسێك چاکەیەکت لەگەلدا بکا و خاوەنی ئەخلاقێکی جوان بێ و تۆ بلێ والله هەر خۆشم ناوێی خەلك چیت پێ دەلێ ئەلێن بەخوا ئینسانێکی لەئیمی بەخوا ئینسانێکی بەد سیفەتی بەخوا ئینسانێکی خراپیت تۆ سەیری بکە ئەو هەموو چاکەی لەگەل کرد کەچی دەلی خۆشم ناوێی ئەی ئەگەر ئەوە الله بێ جل وعلا .

ئەگەر الله تعالی ببەخشێ ئەوە بە فەزلی خۆیی ئەبەخشێت بەرەحمەت و بەنیعمەتی خۆیی ئەبەخشێ ئەگەر مەنعیش بکا و عیقاب بکا بەعەدلی خۆیی ئەبەخشێ .

تۆ سەیری ئەم دوو شتە بکە یانی زوولم لە الله تعالی نابینی هیچ کاتێك و ئەبد (**وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا**)[262] لەبەر ئەوە بەندەکان با ئاگاداربن هەر موسیبەتێك و هەرشتێك کە دێت لەژێر دووشت دایە حیکمەتی الله تعالی و رەحمەتی الله تعالی بەو کەسە یان عەدلی الله تعالی بەو کەسە زولمی لێ نەکردوە حیکمەتی وایە

[260] :طريق الهجرتين باب السعادة ، ج:١\٣١٧
[261] : طريق الهجرتين باب السعادة ، ج:١\٣١٨
[262] :سورة الكهف اية : ٤٩

کەوا عەزابی بدا ئێستا پێغەمبەران گوناهیان چیبووە لەکاتێکدا تووشی ئەو هەموو ئازار و نارەحەتییە بوونەتەوە و کەتووشیان هاتووە ئەوە الله تعالی دەیەوێی دەرجەیان بەرزبکاتەوە و حیکمەتی تێدایە لەوە ئەیەوێی ئەو کەسانە تاقی بکاتەوە ئەیەوێی پێغەمبەرەکەی تاقی بکاتەوە ئەیەوێی ئەو خەلکە تاقی بکاتەوە الله تعالی یە ، یانی ئیشەکانی هەرچیەك لەم بوونەوەرەدا روودەدا هەموو بەحیکمەت و بەعیلمە هەمووی بەزانیاری و بەرەحمەت و بەعەدلە زولمێك نابینیتەوە وشیاری خۆمان بین الله تعالی زۆر لەوە گەورەترێکە کەوا زولمێك بکا .

إبن القيم دەفەرمووی : شاعیرێك ئەم شیعرەی وتوە (ما للعباد عليه حق واجب)هیچ بەندەیەك لەسەر الله حەقی نیە بۆیە ئەلیٚ تۆ مەلیٚ خوایە بۆخاتری پێغەمبەر و بۆ خاتری فلان و فلان چونکە کەس خاتری لەسەر الله تعالی دا نیە .

ئەها زۆر جار پرسیارمان لیٚ دەکریٚی بەچی دوعا بکەین ئەلیٚ کەسی وایە هەیە ئەلیٚ خوایە بۆخاتری پێغەمبەران و پیاوچاکان ؟

ئەلێن :ئەمە هەلەیە ئەم قسەیە بیدعەیە و الله تعالی نافەرمووی لە قورئاندا بۆخاتری پێغەمبەران و پیاو چاکان بەلکو الله تعالی دەفەرمووی بلیٚ بۆخاتری ناوەجوانەکانی خۆت کە مەبەست پیٚ الله تعالی خۆیەتی (وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا)[٢٦٣] جا ئەمە ئەعلی عیلم تیٚ دەگا عەوام تیٚ ناگا هەتاوەکو ئێوارە قسەی بۆ بکە ئەلیٚ ئەوە رقی لەپێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)نەخێر ، خاتر یانی حەق کەس حەقی لەسەر الله هەیە ؟!نەخێر بەلکو هەمووی بەندەیە هەموومان چاوەری ئەو رەحمەتی ئەوین حەد مان چیە بلێن حەقمان لەسەر الله یە الله حەقی لەسەر ئێمەیە کەواتە هەلەیە بلیٚ خوایە لەبەر خاتری جاهی پێغەمبەر یان لەبەر جاە و خاتری فلان وفلان واتا بەبەندەکان داوا لەخوا مەکە بەلکو بلیٚ یا الله لەبەر خاتری خۆت . دوای ئەوە بۆ ئێمە بلێن بلیٚ لەبەر خاتری الله خۆیی تۆ رازی نەبی بەمە بەس بلێن لەبەر خاتری مەخلوق تۆ بەمە رازیبیت ئەمە چ عەقلێکە ئەم عەقلە یانی خوا گەورەترە یان بەندە !؟ هەمووتان ئەلێن : خوا !دەی بلیٚ خوایە بۆ خاتری خۆت تەواو لەوە گەورەتر دەبیٚ .

جا ئەلیٚ هیچ کەسێك و هیچ بەندەیەك حەقی نیە لەسەر الله (كلا ولا سعى لديه ضائع) نەخێر وە هیچ هەول و تێکۆشانێك و عەمەلێکی صالح لەلای الله تعالی بزر نابیٚ لەلای الله ون نابیٚ هەمووی نوسیوەتەوە زولم ناکا (إن عذبوا فبعدله، أو نعموا ... فبفضله، وهو الكريم الواسع)[٢٦٤] ئەگەر ئەوانە عەزاب بدرێن الله

[٢٦٣] :سورة الأعراف اية :١٨٠
[٢٦٤] : طريق الهجرتين باب السعادة ، ج:١\٣١٨

بەعەدالەتی خۆیی عەزابی ئەدا ئەگەر بەهەشت و نیعمەتیان بەسەردا ببارێنی ئەوە ئەو کەسانە شایەن و موستەحەقی ئەوە نەبوونە بەلکو بە فەزلی خۆیەتی .

کەواتە ئێمە هەر هەموومان لەدووشتدا ئەسوڕێنەوە لەم بونەوەرەدا لەژێر عەدلی الله داین وە لەژێر فەزلی الله داین عدل و فضل ئەم دووکەلیمەیە زۆر لێ ورد ببنەوە هەرچیەك بکا لە عقوبات عەدلە و حیکمەتی تێدایە هەرچیەکیش بکا لەچاکە لەفەزلی خۆیەتی چونکە هیچ عەمەلێك ناتوانی بگاتە بەوەی تۆ ڕەزامەندی الله تعالی بەدەست بهێنی وەکو وتمان کێ ئەتوانی هەلسێ بەشکوری الله و هەلسێ بەژماردنی نیعمەتەکانی الله تعالی کەواتە بەهەشتێکت ئەداتێ هەتا هەتاییە دار مێوەکانی دونیا کات و مەوسیمی خۆیان هەیە مێوەکانیش بۆگەن دەبن بەلأم هی بەهەشت وانیە کات و مەوسیمی نیە بۆ هەموو کاتێکە وە بۆ گەنیش نابن ئاوی دونیا بۆ بگەن دەبێ الله تعالی لەقورئاندا باسی ئاوی بەهەشت دەکا و دەلێ بۆ بگەن نابێ (**مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ**)[٢٦٥] خۆشیەکانی بەهەشت نابرێتەوە بەلأم لەدونیادا ئەبرێتەوە لەدونیادا مردن هەیە بەلأم لەویدا مردن نیە لێرەدا لەتاقیکردنەوەدایت و ئەبێ شەو ورۆژ بترسی لەوێی تاقیکردنەوە نەما و تەواو چی ئەکەی بیکە چی ئەخۆیت بخۆ چی لەبەر ئەکەیت لەبەری بکە لەسەرووی هەمووشیانەوە بینین و ڕەزامەندی الله تعالی .

ئادەی چ عەمەلێك بەتەقای ئەمەیە ! ؟شەو و ڕۆژ بخەرە سەر یەکتری ئەتوانی بلێ ئەوە بەرامبەر بە وەیە ! ؟کەواتە ئەمەنەکەی فەزلی الله یە نەك کارەکەی تۆ بەلأم بەم عەمەلەش نەبێ نارۆیت باش ئاگاداربە نابێ بلێ واللە مانای وایە کەسی بەرامبەر ئەوها نیە الله تعالی پێویستی بە عەمەل نیە نەخێر بەلکو داوای لێکردوویت (**لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ**)[٢٦٦] ئێمە بۆیە ئێوەمان هێناوە بەدوای خەلکیتردا بۆ ئەوەی بزانین چی دەکەن ئا بەم عەمەلی تۆ تۆ ئەچیتە ئەم بەهەشتە بەلأم نەك لەبەرامبەری بێ الله تعالی جاری وایە بە عەمەلێکی کەم فەزلێکی زۆر ئەرژێنێت بەسەرتدا لەبەر ئەوەی زۆر بە ئیخلاصەوە کردوتە بۆ الله تعالی .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو : (لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ)[٢٦٧] من ناتوانم شوکری تۆ بکەم ئەناو مەتحی تۆ بکەم زمان لاڵە لەئاستی شوکری تۆ ئەی الله تعالی مەگەر بەوە نەبێت کە خۆت شوکری خۆتت کردوە واتا خوایە من حەمدی تۆ دەکەین بەو الحمدلله یانەی کە لە قورئاندا خۆت وتووتە کە فەرمووتە (**الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**)[٢٦٨] کە فەرموویەتی (**الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ**

[٢٦٥] :سورة محمد اية :١٥
[٢٦٦] :سورة يونس اية : ١٤
[٢٦٧] : صحيح مسلم عن عائشة
[٢٦٨] :سورة الفاتحة اية : ٢

عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ)[٢٦٩] هەر ئایەتێکی تر کە حەمد و سەنای خۆی دەکا الله تبارك وتعالی خوایە ئێمە حەمدی تۆ دەکەین بەو حەمدەی کەخۆت کردوتە بۆخۆت .

جا ئەم ناو و سیفەتانە ئەلێن ئەبێ ئاگاداربین پێ (إنما تظهروا هذه المحبة صیفات بإثبات أولا)ئەبێ ئاگاداربی هەر ناو و سیفەتێك الله و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دایناوە بۆ خوا ئەبێ تۆش دایبنێی بەس نابێ کەسیتر تداخولی ئەم بابەتە بکا نابێ تۆ ناو و سیفەت بۆ الله دابنێ چونکە ئێمە هیچ نازانین لەقورئان و سونەتی صەحیح وتی ئەمە ناوی خوایە ئەلێن ئەمە ناوی خوایە ئەمە سیفەتی خوایە ئەمە سیفەتی خوایە تەواو بۆت نیە شتێك زیاد بکەی خوای تعالی هێنای وتی ئەمە ناو و سیفاتی الله تعالی یە تۆش دانی پێ دابنێ و قسەی تێدا مەکە کە تۆ ماناکەی نازانی کەیفیەتەکەی تۆ نایزانی لەعەقلی تۆدا نیە لێ گەرێی .

(ومعرفة ثانیا)بزانی و دیراسەی بکەی .

(ونفي وتحریف وتعطیل وخصوصها ثالثا )نابێ ئەو ناو و سیفەتانەی لەکار بخەی .

(ونفي تمثیل وتکیف عن معنها رابعا)نابێ بیشوبهێنی بەخەلکدا ئێستا بۆنمونە هەمووتان ئەزانن الله تبارك وتعالی ئەبیستێ بەس بیستنی وەکو ئێمە نیە جیاوازە لەنێوان ئەم دوو بیستنە زۆر زۆرە ، الله تعالی هەموو سەوتێك ئەبیستێ هیچیشی لێ تێك ناچێ دەبیری لێ بکەرەوە هەر دەبێت بلێ سبحان الله بەس تۆ ئەگەر گوێچکەت وابوایە تێك ئەچووی دەوەرە ئێستا با الله تعالی قوەتێك بدا بەم گوێچەکەیت هەموو سەوتەکان ببیستی هی جادە و حەیوانات هەمووشتەکان هی ملائیکە و هی جن ئی هەموو شتێك مێشکت چی بەسەر دێت هیچ لەهیچ جیاناکەیتەوە لەبەر ئەوە تۆ میقدارێکی تایبەتیت دراوەتێ بای ئەوەندەی کەوا هەزمی بکەیت باشترین بەلگە لەسەر ئەوە ئەوەیە بێت و چوار کەس لەبەر دەمتا قسە بکا ئەلێت بەسە کاکە یەکێکتان من تێناگەم لەهەمووتان یەکسەر تورە دەبی بەم حالەتە ، یاخود دووکەس بێتە بەردەمت دوای شتێك بکا ئەلێ کاکە یەك یەك وەرن من ناتوانم إستجابە بۆ هەمووتان بکەم یەکەسەر لاوازی خۆت دەر ئەخەیی بەس الله تعالی وانیە کەواتە بیستنەکان جیاوازی هەیە ، تۆ بیربکەرەوە چاوی تۆ حدودی هەیە پیشتی دیوارەکان نابینی الله تعالی هەموو شوێنێك ئەبینی ئاسمان و ئەرز و بەحر و بەر هەمووشتێك ئەبینی هەرچیەکیش هەیە لەو ئەرزە وەکو دەنکە نیسکێك وایە لەکەونی الله تعالی دا ئەو هەموو مەلائیکە و ئەوهەموو جن و ئینسانە ! ئەو هەموو زمانە لەهەموویان تێ دەگا بیر بکەنەوە بزانە ئەمە چەند گەورەیی الله تعالی بۆتۆ دەردەخا ئینجا لێ ئەترسی ئینسان هەیە بگاتە ئەمە،

[٢٦٩]:سورة الکهف ایة : ١

بۆیە الله تعالی لەقورئاندا دەفەرمووی : ئەو کەسانەی ئێوە ئەیان پەرستن و بەقسەیان ئەکەن ئەوانیش هەر بەندەن وەکو ئێوە خۆ ناتوانن کەس دروست بکەن ، ئەتوانن کەس دروست بکەن، دەوەرە هەموو دونیا کۆبکەوە با یەك مێش دروست بکا کە مێشێك قیمەتی نیە لای ئێمە دەوەرە تۆ دروستی بکە ؟! الله تعالی دەفەرمووێی : ئەوەی کە دروست دەکا ئەبێ بپەرسترێی و بەقسەی بکرێی نەك ئەوەی کە دروستکراوە تۆ دروست کراوی دروستکراو ئەبێ دروستکارەکەی خۆیی بپەرستێ ، لەبەرئەوە وەلامتان بۆ هەموو ئەو کەسانە وابێ کە شتێکتان پێ دەلێن غەیری فەرمانەکانی الله تعالی بلێ تۆشتێکت دروست کرد الله تعالی ئەوەمان فێر دەکا بۆ وەلامدانەوەی ئەم جۆرە کەسانە.

ئادەی وەرە خۆت بناسە ئەی ئینسان تۆ هیچت دروست کرد هەتاوەکو من بلێم تۆ خوایت و ئەبێ بەقسەت بکەم خالق دەبێ بپەرستێ بەقسەبکرێی رێنمایەکانی بخرێتە سەرچاو نەك مخلوق مخلوق دەبێ هەمووی خالق بپەرستێ لەبەر ئەوە ئەو هەموو ناو و سیفەتەی هەیە تۆ بەس بیری لێ بکەیتەوە هەر ئەوەندە بلێ سبحان الله ما أعظمك ئەوە لەعقلی ئێمەدا نیە .

بۆیە ئەمانەمان باس کرد چونکە ئەهلی بیدعە زۆرن لە ئەشعەریەکان و ماتوریدیەکان لەوانە هەمووی کە ناو و سیفەتەکان دەلێن نیەتی هەبوو لەجەهمیەکان دەیانوت نەخێر بەس الله ناو و سیفەتەکانی هیچی نیە لە موعتەزیلەکان بەس ناوەکان دائەنێنن و بەلاَم سیفەتەکانی لائەبەن لە ئەشعەرییەکان حەوت سیفەتی بۆ دائەنێن و ئەوانیتر لائەبن و نەفی دەکەن .

ئەوسیفەتەی ئێمە کەباسی دەکەین محیبەتی الله تعالی لەلای ئەشعەرییەکان نابێ تۆ بلێ خوای تعالی بەندەکەی خۆش دەوێی ئەلێن ئەمە هەلەیە ، ئەی چی راستە ؟!ئەلێن نەخێر سیفەتی ئیرادەی هەیە ئیرادەی خێری بەتۆ هەیە !بابەتەکە خۆشەویستی و رق لێبوونەوە نییە ئەوە لەئینساندایە و لە خوادا نیە !

وەلامی ئەمانە بەم شێوەیە ئەدرێتەوە : ئەلێن بۆتۆ ئەم سیفەتەت شوبهاند بە سیفەتی مخلوقەکانەوە ؟! الله تعالی زاتێك ئیمانت پێ هەیە ؟! ئەلێن : بەلی ، ئێمەش کەسێکین جیاوازیمان زۆرە یاخود نا ؟! ئەلێن : بەلی ، دەتۆش جیاوازی بکە لەنێوان ئەم ناو و سیفەتە بلێ بەلێ الله تعالی ئەم ناو و سیفەتانەی هەیە بەس من نازانم چۆنە.

لەبەر ئەوە دەربارەی ناو و سیفاتی الله تبارك وتعالی و کەیفیەت و چۆنیەتیەکەی ،چۆنیەتیەکەی لە عەقلی خۆت بخەرە دەرەوە بلێ نازانم هەرئەمەندەیە ، بلێ بەلی خوای تبارك وتعالی هەرچی ناو و سیفاتێکی هەیە من باوەرم پێی هەیە بەس نازانم چۆنە .

بۆنمونه : كه باسی هاتنه خوارەوەی الله تعالی دەكەین تۆ نابێت وەكو ئینسانێك بێته عەقلت لەشاخێك دێته خوارەوه یان لەبینایەك دێته خوارەوه نابێت بەم شێوەیه بێته عەقلت بەس ئەبیٚ بلیٚ بەلیٚ هاتنه خوارەوەی الله تعالی ئیسپاتی دەكەم و دەزانم الله تعالی دێته خوارەوه بەس نازانم چۆنه چۆنیەتیەكان لابه ئێمه الله تعالی مان هەر نەبینیوه نازانین الله تعالی چۆنه و زاتی چۆنه وه سیفاتی چۆنه بەس ئەبیٚ بلیٚ وایه چونكه خوای گەوره خۆیی وای داناوه .

هەر بەندەیەك بیەوێی بەكەمالی بروا بەم دوو خالەیه بریتیه له قوتی عیلم و قوەتی خۆشەویستی .

عیلمت به الله هەبیٚ خۆشەویستی الله تعالی ت ئەبیٚ بەم دوو خاله ئەم كەسه خۆیی كامل دەكا بەكەمالی دەروا وه باشترین عیلم عیلمه به الله تعالی وه باشترین خۆشەویستیش خۆشەویستی الله تعالی یه .

هیچ خۆشەویستیەك گەورەتر نیه لەخۆشەویستی الله تعالی .

*خۆشكاندەنەوەی دلەكانی بەندەكان لەبەر دەمی گەورەی الله گەورەدا خۆت بەكەم بزانی ئەم خاله زۆر زۆر گەورەیه،،.

هیچ شتێك لەلای الله تعالی ئەوەندە خۆش نیه لەوەی بەندەكەی خۆی بشكێنتەوه لەبەر دەمی خۆیی بەومانایەی تەكبور نەكا كه تەكبورت كرد ئەشكێی لەبەر دەمی الله تعالی دا لەبەر چاوی خوای تبارك وتعالی ئەكەویی شەیطان باشترین نمونەیه ئەم شەیطان عیبادەتی خوای تبارك وتعالی دەكرد هەمووی سرییەوه لەبەر ئەوەی تەكبوری كرد برۆ تەواو (أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ)[270] یارەبی خوایه لەبەر چاوی تۆ نەكەوین هەر زەلیل بین ئەگەر بێتوو مەعصیەتیشمان هەبیٚ بلیٚ خوایه ئێمه گوناهبارین لێمان خۆشبه وەكو باوك و دایكمان كه لەخوای گەوره پارانەوه (رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ)[271] نەك خۆمان هەلدەیەن بلیٚ كەس لەمن باشتر نیه بەس نیه من نوێژ دەكەم ئەوه پیاو دەكوژێی نەخێر وانیه تۆش وامەبه لوت بەرز مەبه موتەكەبیر مەبه بلیٚ ئەبوایه زیاترم بكردایه .

حەدیسێكمان هەیه پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : لەدین سەیری لەخۆت گەورەتر و بەرزتر بكه لەدوینا سەیری خوارووی خۆت بكه .

مەلیٚ كورەكەم الحمدلله وایه و وایه كورەكەت قورئانی هەمووی لەبەره ؟! كورەكەت هەموو پێنج فەرزەكان بۆ نوێژەكه لەمزگەوتەكەدایه كورەكەت شەو نوێژ دەكا ؟!كەكاتێك وا سەیر دەكا دەلیٚ نەخێر ، دەلێت والله كەم و كوری هەیه . ئەما تۆ بیكێشیت بەمانەی ئێستا لەبازارەكاندا و بەولا و بەولا

[270] :سورة البقرة اية : ٣٤
[271] : سورة الأعراف اية : ٢٣

نازانی خوا چیە و پێغەمبەر چیە دەلێ والله کاکە بەس نیە کورەکەم ئارەق ناخواتەوە هەر دەلێ بەس نیە بەس نیە ، نەخێر وانیە بەلکو لەدین سەیری سەرووتر خۆت بکە لەدونیاش سەیری خوارتر بکە ئەمرۆ هەردووکی پێچەوانە بوویتەوە لەدونیا ئەلێن فلان کەس ئەمەی هەیە ئەبێ منیش ئەمەم هەبێ ئەوەندە دەفتەری هەیە ئەلێ منیش ئەبێ هەم بێ ، بۆ نالێت نەوالله کابرا فەقیرەی کرێچیە و پارەکەشی نیە بۆی دەفع بکرێی بۆ نالێت کابرا نەخۆشە و نیەتی و کرێچیشە و لەمانگێکدا گۆشتێك ناخوا بۆ سەیری ئەمە ناکەیت !سەیری ئەمە بکە ئینجا دواتر شوکوری الله تعالی دەکەی .

جاخۆ شکاندەوە بەم شێوازە لەلای الله تعالی زۆر زۆر خۆشەویستە وە تەسلیم بوونە بە الله تعالی وە هەر کەسێك ئەگەر ئەوها بێت خوای تبارك وتعالی کەم و کورییەکانی پردەکاتەوە ، باسمان کرد وتمان کەسێك عیبادەتێکی زۆر زۆر ئەکا و ئەنازێت بە عیبادەتەکانی کەسێکیش عیبادەت دەکا و هەندێك گوناهی هەیە هەر شکاوەتەوە بەسەری و هەر دەگریی بەسەر گوناهەکانیدا و هەر دەپارێتەوە کامیان لەلای الله تعالی گەورەترە ؟! ئەلێ :ئەمەی کە خۆیی ئەشکێنێتەوە ئەمەی کە دلی شکاوە ئەوە کە ئەپارێتەوە و ئەگریی و فرمێسك ئەبارێنی لەبەسەرگوناهەکانی ، وە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە بچین گوناه بکەین و بگرێن نەخێر مەبەستمان ئەوە نیە ، مەبەستمان ئەوەیە کەوا تەکبورت نەبێ و موتەکەبیر نەبی .

إبن القيم دەفەرمووی :(احب القلوب الى الله)خۆشەویسترین دلێك لەلای الله تعالی (قلب قد تمكنت هذه الكسرة ، وملكته هذه الذلة)[٢٧٢] ئەگەر بێتوو ئەو خۆشکاندنەو و زەلیلیە لەدلەکەدا هەبێ لەلای الله تعالی زۆر زۆرخۆشەویستە.

جا ئەلێ ئەم زەلیلیە جۆری هەیە :

*جۆرێکی زەلیلی کەسێکی خۆشەویست بۆ خۆشەویستەکەی ، دائیمەن کەسێك کەسێکی خۆش بووێی خۆیی بۆ زەلیل ئەکا .

*جۆرێکیتر کەسێك بەندەی سەیدێك بێ خۆیی بۆ سەیدەکەی زەلیل دەکا .

*جۆرێکیتر کەسێك تاوانبارێ لەبن دەستی سەیدەکەیدا گوناهێکی کردبێ ، بۆنمونە ئێستا بەندەیەك و سەیدێك بێنین ئەم بەندەیە هەلەیەکی کردوە بەبەرامبەر بە بەندەکەی چۆن ئەچێتە بەردەمی سەیدەکەی بەزەلیلی دەچێ .

*جۆرێکیتر بێ دەسەلاتی کە ئەم بێ دەسەلاتیە لەدوو شتدا خۆیی ئەنوێنێی :

١- حەزدەکا ئەو کەسە سودی بۆ بێنی.

[٢٧٢] : مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين-٣٩٩

٢- ناخۆشیەکانی لێ دوور بخاتەوە داوای لێ دەکا ئەلێ کاکە ئەو شتەم بەرێی بەزەلیلیەوە داوای لێ دەکا وەکو دەلێ فلان کەس وام لێ دەکا بەزەلیلیەوە داوای لێ دەکا تاوەکو ئەم ناخۆشیەی لەسەر لابەرێت .

ئەم جۆرانە لەزەلیلی ئەگەر بەندە بۆ الله تعالی جێ بەجێ کرد وەکو پێویست ئەوە ئەوکاتە بەراستی الله تعالی خۆشە دەوێی وە خوای تعالی ئەوی خۆش دەوێی ئەگەرچی کارو عەمەل صالح و ئیشەکانیشی کەم بوو الله تعالی عەمەلێکی کەمی ئەو ئەخاتە بەر عەمەلێکی زۆر کە کەسانێك کردویانە بەس ئەم زەلیلیەیان تێدا نیە .

ئەگەر ئینسان بەم شێوەیە بوو (فتصيروا خطرات المحبة مكان خطرات المعصية)تەبعەن لەدلی ئێمەدا بیر لەگوناهکردن ئەکەیتەوە ئەگەر تۆ ئائەم زەلیلیانەت تێدا بوو لەجیاتی بیر لەگوناه بکەیتەوە بیر لەتاعەتی الله تعالی دەکەیتەوە بۆنمونە تۆ خراپەت لەگەل کەسێك کردوە داوای لێ ئەکەیت لێت خۆشبێت ئالەو کاتەدا کەداوای لێ ئەکەیت لێت خۆشبێت هەول دەدەی خراپەیتری بەرامبەر بکەیت ؟!یان بەهەمووشتێك حەز دەکەی رازی بکەیت ، بۆنمونە کەسێك هەلوێستێکی خراپی هەبووە لەگەلتدا ئەو کەسە کاتێك بێتە پێشەوە بۆنمونە تۆ سەیارەکت پێ یە تۆ لەکەسێك ئەدەیت چۆن ئەچیتە بەردەمی کەس و کارەکەی بەزەلیلی ئەچیت بیر ئەکەیتەوە کەسێکیتر بکوژیت و بیکەیت بەژێرەوەی سەیارە !؟ نەخێر بەلکو دەلێت ئەوە من هاتووم چی دەلێن بەسەرچاو و بەزەلیلیەوە دائەنیشی .

کەواتە لەو حالەتەی کە ئینسان زەلیلیەکی تووش دەبێ بیر لەخراپیتر ناکاتەوە بەلکو بیر لەوەدەکاتەوە کەوا بەرامبەرەکەی رازی بکات بۆیە ئەگەر ئینسان ئاوەها زەلیل بوو لەجیاتی خطراطی گوناهە خطراطی چاکە بەدلیدا دێت بۆ ئەوەی زیاتر چاکە بکات .

(وإرادات التقرب إليه وإلي مرضاته مكان إرادة معاصيه ومساخطه)رازیبوونی الله لەبەر چاوە نەك الله تعالی لەخۆیی زوویر بکا (وحركات اللسان والجوارح باطاعات مكان حركاتها بالمعاصي)[٢٧٣]جموجۆلی ئەندامەکانی لاشەت بەتاعەت ئەبیەت بەرێوە نەك بەمعاصی و سەرپێچی .

کەواتە ئەم خۆشکاندنەوە و زەلیلییە ئەتباتە بەردەمی دەرگایی خۆشەویستی الله تبارك وتعالی ، وە ئەم دەرگایە بۆ هەموو کەسێك ناکرێتەوە إلا بۆ زەلیلەکان ئەکرێتەوە .

[٢٧٣] : تهذيب مدارج السالكين،ص: ٢٠٩

حەوتەم:

*خۆتەنها کردن لەگەل الله تعالی دا لەکۆتایی شەوەکاندا لەوکاتەی کەوا خەلکی خەوتوونە (الخلوة به وقت النزول الإلهي لمناجاته، وتلاوة كلامه)لەگەل الله تعالی دا بەتەنها بی لەوکاتەی پێش نوێژی بەیانی بەسەعاتێك یان دوو سەعاتێك کە پیێ ئەوترێی (سەحەر)بەتەنیا بە لەگەل الله تعالی دا قورئانەکەی بخوێنەرەوە

(، والوقوف بالقلب، والتأدب بأدب العبودية بين يديه)لەبەر دەستی الله تعالی دا خۆت زەیلیل بکە و بپارێرەوە (، ثم خَتم ذلك بالاستغفار والتوبة.)دوای ئەو ئیشانەی کە کرد لە زیکر و لەقورئان خوێندن و نوێژکردنەوە دەست بکە بە ئیستغفار کردن و بەداوای لێخۆشبوون لەوکاتەدا .

(فإنه وقت قسم الغنائم وتفريق الجوائز)ئەوکاتەیە کە الله تعالی جائیزەکانی خۆیی دابەش دەکا بەسەر بەندەکانیدا ، بۆنمونە بلێن سەعات دووی شەو هەلسن دەفتەرە دۆلار دابەش ئەکرێی !کەس ناخەوێی ! هەلسن رەزامەندی و مەغفیرەتی الله دێتە خوارەوە قوەتی ئیمانەکە و خۆشەویستیەکە کەمە خەوەکەی لای خۆشترە ئەگەر یەقینێکی باشی هەبێ یەقینی هەیە بەس کەمە ئیمانێکی بەهێز ئیمانی هەیە بەس کەمە خۆ هەموومان ئیمانمان بەمە هەیە بەلاّم نەگەیشتۆتە ئەو رادەیەی یەکەسەر راپەریت و بلێت من ئەوەم ئەوێت ئەوە هەرکەس با سەیری خۆیی بکا ئەوەی هەیەتی الحمدلله ئەوەشی نیەتی با هەولبدا هەیبێت ، ئەمە مەحەبەتی الله تعالی رادەکێشی بۆتۆ لەوکاتەدا .

ئاگادارین سیفاتەکانی الله تعالی نابێ بشوبهێنی بەسیفاتی ئینسانەکان ، بۆنمونە هەندێك کەلام باسکراوە یەکێك لەوانە إبن تيمية ئەو زانایانەی سەلەفی ئومەت کەوا إتهام کراون بەوەی کەوا مجسیمەن بەداخەوە زۆر مەلایانی مەنتیقەی خۆمان بە إبن تيمية دەلێ مجسيمة و مشبهە نازانن زۆر بەداخەوە ! ئەلێن خوای

تجسیم کردوە خوای کردوە بە ئیسنان چونکە إبن تیمیە دەلێت خوا دێت خوارەوە ئەوان دەلێن نابێ وابلێ ! باوەریان بەمە نیە لێیان بپرسە ئەلێن هاتنە خوارەوە نیە بەلکو رەحمەتی خوا دێتە خوارەوە نەك خۆیی .!! ئێ حەدیسەکە بۆخۆیی وادەلێ (ینزل ربنا)[٢٧٤] خوادێتە خوارەوە ، بەس نابێ تۆ بیشوبهێنی بەهاتنە خوارەوەی ئینسانێك لەشوێنێکەوە بۆ شوێنیکیتر لەمەلابە لەخەیالای خۆتدا ،. ئەمە تشبهە و تجسیم کردن نیە کەوا ئەوان ئەم تۆمەتە ئەخەنە پالْ إبن تیمیە.. نازانین چۆن و چۆن نیە هاتنە خوارەوەکە بەس الله تعالی وای وتوە وە پێغەمبەر وای وتووە (صلی الله علیه وسلم) الله جل وعلا دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی یەکەم لەبەشی ئاخیری شەودا دەفەرموویێت : کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تاوەکو لێخۆشبم ، کێ داوای شتێکم لێ دەکا تاوەکو بیدەمی ، وەکێ دوعا ئەکا تا گیرای بکەم و لێ وەربگرم .

ئالەوکاتەدا تۆ کە خەریکی مەشغول بوونی عیبادەتی الله تبارك وتعالی تۆ گەورەترین پاداشت وەردەگریی ،

الله تعالی دەفەرمووی : (تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ)[٢٧٥] باسی بەندە صالحەکانی خۆیی دەکا و دەفەرموویێ ئەوانە ناخەون (جُنُوبُهُم)یانی تەنیشتەکانیان لەجێگەی خەو بەرز دەبێتەوە نالکێی بەجێگەی خەودا و بەرز دەبنەوە نوێژ دەکەن و قورئان دەخوێنن شەویان بەعیبادەت ئەبەن سەر (يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا)لە خوای خۆیان داوا دەکەن وە عیبادەتی بۆ دەکەن بەترسەوە وە لێی ئەترسن وە تەماعیشیان هەیە بە بەهەشت ورەحمەتەکەی وە بەبینینیەکەی داوای بینینی الله تعالی و بەهەشتەکەی دەکەن وە پەناش ئەگرن لە الله تعالی لە سزا و عەزابەکەی ئەپارێنەوە هەتاوەکو بەرە بەیان هەتا کاتی نوێژی بەیانی (وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ)هەرچیەکیش لەوەی کە ئێمە پێمان دابوون لەتوانایاندا هەبێ ئەبەخشن وە دەست ناگرنەوە ، جا بزانە الله تعالی چی بۆ داناون (فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)[٢٧٦] هیچ کەسێك نازانی ئەمانە الله تعالی چ شتێکی بۆ داناون لەوەی چاو پێی خۆشە ببینیێ ، یەك جائیزەی وای بۆ داناون پاداشتی وای بۆ داناون هیچ نەفسێك نایەت بەدلیدا یەچاویش نەیبینیوە (جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)لەپاداشتی ئەو کردەوە چاکانەی کەوا ئەنجامی داوە ، رەنگە لەشەوانی هاویندا زۆربەمان نەخەوین چونکە شەوەکەی کورتە بەلام لەشەوانی زستان کە شەوەکەی درێژە ١٢

[٢٧٤] : الكتب » كتاب الاستذكار» كتاب القرآن» باب ما جاء في الدعاء» حديث أبي هريرة ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى السماء الدنيا

[٢٧٥] :سورة السجدة اية : ١٦

[٢٧٦] : سورة السجدة اية : ١٧

سەعاتت شەوە ئالەو کاتەدا بەشێکی باشی بۆ الله تعالی دابنێ بەئیمانەکەت پێداچوونەوە بکە بزانە ئەبیت بەچ ئینسانێك .

هەر الله تعالی لەقورئانەکەیدا دەفەرمووێ : (إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ)[٢٧٧] ئەوانەی تەقواکارن و لە الله ئەترسن وە بەقسەی ئەکەن الله تعالی ئەیانخاتە ناو بەهەشتەکانی ناو کانیاوی بەهەشتەکانیەوە ئەیانداتێ (آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ ۚ)[٢٧٨] ئەو پاداشتەی کە الله تعالی بەوانی بەخشیوە ئەوان وەریی ئەگرن پێیان خۆشە و لە الله تعالی رازین (إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ) پێش ئەوە لەدونیادا محسین و چاکەکاربوون ، چیان دەکرد ؟!( كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ)[٢٧٩] لەشەودا زۆر بەکەمی دەخەوتن (وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ)[٢٨٠] لەپێش بانگی بەیانی بەپێش سەعاتێك داوای لێخۆشبوونیان لە الله تعالی دەکرد .

هەروەها مەتحیان دەکا ئەوانەی کەوا شەو نوێژ دەکەن الله تعالی دەفەرمووێ : (وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا (٦٣) وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا (٦٤))[٢٨١] لەپێشدا دەفەرمووێ (وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ)بەندەکانی رەحمان وەسفت دەکا بەبەندەی خۆیی کە یەك لەناوەکانی رەحمانە زۆر گەورەیە بلێ بەندەی ئەو خوایە بەبەزەییە و میهرەبانە تۆ بەندەی خوای بەبەزەیی و میهرەبانەی هەر لەخۆوە دلت خۆش دەبێ بە رەحمەت وبەزەییەکەی الله تعالی کێن ئەوانە ئەی الله تعالی ؟! ئەوانەن کەکاتێك لەسەر زەویی دەرۆن ئەگەر جاهیلەکان قسەی خراپیان لەگەلدا بکەن بەسەلامەتی لە گوناه و لێدانیاندەر ئەچن بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لەدەستی ئەو موجریمانە ، پاشانیش ئەگەر بێتوو شەوهات بە سوجدە و رکوع دەیبەنە سەر و شەو نوێژدەکەن .

هەر الله تعالی لەقورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرمووێ : (أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا)[٢٨٢] ئایا کافرێك لەولا دابنێ کە ئاگایی لە عیبادەتی الله تعالی نیە کەسێکیش دابنێ کە خاوەن ئیمان و باوەرە لەبەشەکانی شەودا تاعەتی الله تعالی دەکا بە پێوە و لەسجودەدا دەبێ نوێژ دەکا (يَحْذَرُ الْآخِرَةَ)لەترسی ئاخیرەت خۆیی دەپارێزێ داوا لە الله تعالی دەکا کە بیپارێزیی (وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ)رجایی رەحمەتی الله تعالی هەیە وە ئەگریی و ئەپارێتەوە (قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ)ئەی محمد تۆ بلێ ئەمەی کە ئەم عیبادەتانە دەکا و شەو نوێژ بۆ الله تعالی دەکا وەك ئەو

[٢٧٧] :سورة الحجر اية : ١٥
[٢٧٨] :سورة الذاريات اية :١٦
[٢٧٩] : سورة الذاريات اية :١٧
[٢٨٠] : سورة الذاريات اية :١٨
[٢٨١] :سورة الفرقان
[٢٨٢] :سورة الزمر اية :٩

کەسە وایە کەوا تێری خواردوە و بێ ئاگایە لە ئیمان و نوێژ و عیبادەت و خوا پەرستی و داوای لێخۆشبوون و خوێندنەوەی قورئاندا نیە ! ؟کافر غەدارە ئەم دووانە وەك یەك وان لەلای الله تعالى ؟! (**إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ**)بەلاَم بەراستی کەسێك پەند لەمە وەردەگرێی کەخاوەنی عەقل بێ نەخێر وەکو یەك وانین .

جا هەموو جارێك من لەخوێندنی ئەم ئایەتەدا ئیشارەت بەشتێك ئەدەم وە ئەمەوێت هەموو جارێك ئیشارەتی پێ بدەمەوە ، ئەم ئایەتە زۆر جار بەهەلە بەکار دەهێنرێی بەتایبەتی ئەم فەقرەیی کە باسی عیلم دەکا لەکتێبەکاندا کاتی خۆیی زەمانی زوو لەبیدایەت دا ئێستا تا ئێستا ئەم شتانەش نەماوە ئەچوون ئەم ئایەتەیان لەسەرەتای کتێبەکاندا ئەنووسی (**هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ**)یعلمون و لایعلمون یەیان ئەکرد بەهی مەکتەب جەبر و هەندەسە و کیمیا و فیزیا ! ئەوە باسی ئەمە ناکا (یعلمون الاخرة والذین لایعلمون الاخرة) ئەمە باسی ئەمە ئەکا وە باشی شەو نوێژ دەکا باسی عیبادەت و گریان و پارانەوە دەکا ئەوەی ئەمە دەزانی و لەخۆشەویستی الله تعالى ئەمە قەرار ئەدا و ئەنجامی ئەدا لەشەودا وەکو ئەوە وایە کەوا ئەنجامی نەدا ئەصلن ئەم مانایەیان فرێداوە لەکتێبەکانیدا هەر بۆخەلکی باس ناکەن ! یانی کەسێکی بەتەقوا و بەئیمان فرێدراوە بەس کەسێك ئەگەر موهندیس و دکتۆر بێ باکافریش بێ لای خەلك زۆر مقبولە هەتاوەکو لەلای خەطیبەکان وەسفی دەکەن ئەلێن ئەها چ عالمێکی گەورەیە نابینی ئێستا وەسفی ئەوروپا چۆن دەکەن با ئەوروپا هەمووی زێر بێ با هەر هەموویان خاوەنی گەورەترین مەملەکەت بن کە ئاخیرەتیان بروا چ سودی هەیە ،!! باتۆش هەموو ژیانت ناخۆشی بێ کەتۆ بەیانی چویتە بەهەشت و الله تعالى ت بینی و بەدیداری شاد بووی هەتا هەتایی لەم نیعمەتەدا بووی با لەدونیادا لەناخۆشی بیت ، من نالێم دونیات ناخۆشیی بێ بەس کێ ئەم ناخۆشیەی بەسەر ئێمەدا هێناوە بەواستەی کارەکانی خۆمانەوەیە وامان لێ دێی دونیا و ئاخیرەتمان ئەروا پەنا ئەگرین بە الله تعالى .

ئەبی دەرظ (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لێ بێت) ئەفەرموویێ : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله : « ثلاثة يحبهم الله ويضحك إليهم ويستبشر بهم الذي إذا انكشفت فئة قاتل وراءها بنفسه لله عز وجل ، فإما أن يقتل وإما أن ينصره الله ، ويكفيه ، فيقول : انظروا إلى عبدي هذا كيف صبر لي بنفسه ، والذي له امرأة حسنة ، وفراش لين حسن فيقوم من الليل ،

فيقول : يذر شهوته فيذكرني ولو شاء رقد ، والذي إذا كان في سفر ، وكان معه ركب فسهروا ثم هجعوا ، فقام من السحر في سراء وضراء)[٢٨٣]

سێ کەس هەن الله تعالى ئەم سێ کەسەی خۆش دەوێ وە الله تبارك وتعالى لەروویاندا پێ دەکەنێ ، ئەمەش یەکێکە لەسیفەتەکانی الله تعالى کە پێ دەکەنی و پێکەنینە ،پێکەنین بڕوامان پێ هەیە کە الله تعالى پێ دەکەنێ بەس وەك ئێمە ئاگاداربن کە باسی سیفاتی الله تعالى دەکەین کەیفیەت و چۆنیەتی لەخەیالی خۆت بخەرە دەرەوە وە ئەم سیفەتەش تەئویل مەکە فرێی مەدە و مەلێ وانیە چونکە ئەهلی بیدع بەزۆری وا ئەلێن ئەلێن ئەگەر خوا پێ بکەنێ ئەوا یانی لێو و دادان وەك بەشەرە وایە ئەمەش خوا دوورە لەم شتانە ئەبێ خواپاك بکەینەوە لەم شتانە ! ئەم قسەیە هەلەیە بلێ بڕوام هەیە کە الله تعالى پێ دەکەنێ بەس نازانین چۆن تەواو ئیمانەکەت سەلامەت بوو ، ئەفەرموویێ : الله تعالى پێیان پێ دەکەنێ واتا لەروویان پێ دەکەنێ لەخۆشەویستیان ، چۆن تۆ خۆشەویستێکی خۆت ئەبینی خۆ بەرووی گرژەوە ناچیت بەرووی ! جا لەسەر ئەمە دەچینە سەر حەدیسێکیتر ئینجا دەگەرێنەوە سەر ئەم حەدیسە .

بزانە ئەگەر کەسێك الله تعالى لەروویدا پێ بکەنێ چ مەنزیلەیەکی هەیە لەلای الله تعالى !

لە نعیم ی کوری عمارەوە(رەزا و رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (وإذا ضحك ربك إلى عبد في موطن فلا حساب عليه)[٢٨٤] هەرکەسێك ئەگەر الله تعالى لەروویدا پێ بکەنێ ئەو کەسە حیسابی لەسەر نیە لەرۆژی قیامەت رزگاری ئەبێ .

(ويستبشر بهم)الله تعالى باسی ئەم سێ کەسە دەکا و دەفەرمووی : (الذي إذا انكشفت فئة قاتل وراءها بنفسه لله عز وجل)کاتێك کە دەچێتە ناو غەزا وە دەچێتە شەر دژی کافرانەوە لەپێناوی الله تعالى دا ئەجەنگی بەنەفسی خۆیی جا یان ئەکوژری یاخود الله تعالى سەری دەخا ،وە پێ دەلێ سەیری بەندەکەم بکەن چۆن صەبری گرت خۆی دا بەکوشت لەبەر من ، ئەمە یەکەمیان ، دووەم کەسیان (والذي له امرأة حسنة ، وفراش لين حسن)ژنێکی جوان و رێك و پێکی هەیە وە ئەم پیاوە لەجیاتی ئەوەی کەوا خەریکی ئارەزووی خۆیی بێت بەشەو (فيقوم من الليل)هەلدەسیتێ لەشەودا واز لەئارەزووەکەی خۆیی ئەهێنێ یادی الله تعالى دەکا ، الله تعالى دەفەرمووی :واز لە ئارەزووەکەی خۆیی دەهێنی لەبەر من وە ئەگەر بیویستایە بۆخۆیی ئەخەوت رائەکشا بۆخۆیی لەگەل خیزانی خۆیدا ئەبوو بەس لەبەر من واز دەهێنێ و دەروا ، ئەمە مانای ئەوە نیە کە ئینسان ئارەزووی خۆیی جێ بەجێ نەکا بەلاَم نابێ هەموو کاتەکانت بەمە بەسەر بەریت ،سێ یەم کەس (والذي إذا كان في سفر)ئەو کەسەشی لەسەفەرێکدا بوو بزانە ئەمە

[٢٨٣] : رواه الحاكم في "المستدرك" (٦٨) والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٩٣١) – وهذا لفظه - .
[٢٨٤] : قال المنذري: رواه الطبراني بإسناد حسن، انظر: ((الترغيب والترهيب)) (٣١٩/٢) .

هەرسێکی ناخۆشیه نەفس لەسەر ئەم سێ شته خۆیی بۆ ناگیرێی کێ خۆی ئەدا بەکوشت ! کێ لەوکاتەدا هەلدەستێتەوە کە خێزانێکی باش و رێك و پێك و مالێکی خۆشی هەبێ ! سەفەر خۆیی قەطعەیەکە لەعەزاب ، هەر وەکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : (عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال السفر قطعة من العذاب)[٢٨٥] تۆ لەسەفەردا هەتاوەکو ئەحکامت بۆ ئاسانکراوە لەنوێژ و رۆژوو هەتاوەکو نوێژەکانت بۆ کورتکراوەتەوە کەچی ئەم کەسە هەلدەستێ لەشەودا شەو نوێژ دەکا ،پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) عادەتی وا بوو لەسەفەر و لەغەیری سەفەردا هیچ کاتێك شەو نوێژی واز لێ نەدەهێنا .

(وکان معه رکب)برادەرەکانی (فسهروا ثم هجعوا)ئەمانە خەوتن بەلأم ئەم (فقام من السحر في سراء وضراء)لەکاتی بەشی ئەخیری شەودا هەلدەستێ لەم سەفەرە دەست دەکا بەعیبادەتی الله تعالی ئەگەر چی خۆش بێ یاخود ناخۆشبێ حالی خۆش بێ یاخود ناخۆشبێ .

ئەم کەسەی کەوا شەو نوێژ دەکا دەچێتە ریزی ئەو کەسانەی کەوا الله تعالی خۆشی دەوێی وە بەروویدا پێ دەکەنێ وە خۆشەویستی الله تعالی بۆ دلەکەی رادەکێشی ئەم شەو نوێژە دەبێتە هۆکار بۆ ئەم راکێشانە .

عبدالله کوری عومەر (رەزای الله تعالی لێ بێت)ئەفەرمووێی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی : (نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّى مِنَ اللَّيْلِ)[٢٨٦] باشترین پیاو عبدالله کوری عومەر ، عبدالله کان لەزەمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوار عبدالله مندال هەبوون تەمەنیان مندال بوو پێیان ئەوترێی (العبادلة الاربعة)چوار عبدالله بچوکەکە ، عبدالله کوری عومەر ، عبدالله کوری عەباس ، عبدالله کوری زوبێر، عبدالله کوری عەمری کوری عاص،ئەمانە هەموویان تەمەنیان مندال بوون ، عبدالله کوری مسعود ئەمیان گەورە بوو بەس ئەمانە بچوك بوون وایان پێ دەوترێی.(رەزا و رەحمەت و بەرەکەتی الله تعالی یان لێ بێت).

یەك لەمانە کە عبدالله کوری عومەرە (رەزای الله تعالی لێ بێت)صەحابی کوری صەحابی وە خوشکەکەشی خێزانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) کە ناوی حفصەیە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێت) ئەلێ :پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویی : (نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّى مِنَ اللَّيْلِ)باشترین پیاو عبدالله ئەگەرهەلسێ شەو نوێژ بکا ، بەس بزانین مناسەبەی ئەم حەدیسە چیە ؟!

[٢٨٥] الكتب » صحيح البخاري» كتاب العمرة» باب السفر قطعة من العذاب،،، رقم الحديث: ١٧١٠
[٢٨٦] :البخاري ١١٢١، ٣٧٣٨، مسلم ٢٤٧٩.

زۆرکەس ئەم حەدیسە ئەخوێنێتەوە بەلاّم مناسەبەکەی تێناگا ، مناسەبەکەی لەحەدیسێکیتردا هاتووە عبدالله کوری عومەر خۆیی بۆمان دەگێرێتەوە و دەفەرمووی : (عن ابن عمر رضي الله عنهما قال كان الرجل في حياة النبي صلى الله عليه وسلم إذا رأى رؤيا قصها على النبي صلى الله عليه وسلم)ئەلیٚ هەرکەسێك لەزەمانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) خەوێکی بینیبایە ئەی گێرایەوە بۆ پێغەمبەر وە عادەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وابوو بەیانیان دائەنیشت لەدوای نوێژی بەیانی دوای ئەوەی زیکرەکانی تەواو دەکرد دەیفەرموو : دەی کێتان خەوتان بینیوە بۆم بگێرنەوە ئەوانیش ئەچوون بۆیان ئەگێرایەوە ئەویش بۆی لێك ئەدانەوە ،تەبعەن عیلمی خەو لێکدانەوە و تەعبیر یەکێکە لەعیلمە گەروەکان لە دینی ئیسلامدا هەتاوەکو سورەتی یوسف خۆی هەمووی باسی خەوێکە خەو حەقە ئاگاداریش بن خەویش هەیە لەشەیطانەوەیە ئاگادارین ئەم عیلمە عیلمێکی زۆر گەورەیە هەموو کەسێك نابیٚ دەستی بداتیٚ تەعیبری خەو قەواعیدی خۆیی هەیە نابیٚ بچیت بۆلای جادوو گەران بلیٚ خەوەکەم چیە ،

کە بۆیان دەگێرایەوە تەبعەن ئەمیش پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) قسەکانی هەمووی راستن و وەحییە هەروەکو الله تعالى دەفەرموویی : (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤))[٢٨٧] حەزی دەکرد بزانی ئەم خەوە تەعبیرەکەی چیە (فتمنيت أن أرى رؤيا)ئەلیٚ منیش بەم مندالیەی خۆم حەزم دەکرد خەوێك ببینم بچم خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تاوەکو بلێم ئەو خەوەم بینیوە و بۆم لێکبدەرەوە (أقصها على النبي صلى الله عليه وسلم وكنت غلاما شابا أعزب)ئەو کاتە مندالێك بووم (وكنت أنام في المسجد)لەمزگەوتدا ئەخەوتم ئەمەش دەلیلە لەسەر ئەوەی دەلێن جائیزە لەمزگەوت بخەوێی بەلیٚ جائیزە ، ئەوەتا حەدیسمان هەیە و صەحابە ئەم کارەیان کردوە ،( وكنت أنام في المسجد على عهد النبي صلى الله عليه وسلم فرأيت في المنام)ئینجا خەوی بینیوە لەمزگەوت خەوتوە و خەوێکی بینی بەلاّم لەخەوەکەیدا چی بینیوە ؟! (فرأيت في المنام كأن ملكين أخذاني فذهبا بي إلى النار)لەخەومدا دوو مەلائیکە منیان برد و بردمیان بۆ ئاگر (فإذا هي مطوية كطي البئر)ئاگرەکە وەکو بیر چۆن سەرەکەی هەلدەچیٚ بەرز ئەکرێتەوە ئەوها بەم شێوەیە (وإذا لها قرنان كقرني البئر)لەدوولاوە بەرزکراوە (وإذا فيها ناس قد عرفتهم) کەسانێکی تێدا بوو لەناو ئەم ئاگرەدا ئەمناسین ئەوانە کێن که لەناو ئاگرەکەدا بوو (فجعلت أقول أعوذ بالله من النار أعوذ بالله من النار)منیش لەخەوەکەمدا یەکەسەر ئەم وت خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەم ئاگرە (فلقيهما ملك آخر)لەخەوەکدا مەلائیکەتێکیتر هات (فقال لي لن

[٢٨٧] :سورة النجم

تراع)بەمنی وت تۆ ترست لەسەر نیە (فقصصتها علی حفصة)کەلەخەوەکە خەبەرم بوویەوە چووم بۆلای خوشکم حەفصە بۆم گێرایەوە ئەویش لەبەر ئەوەی خێزانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) (فقصتها حفصة علی النبي صلی الله علیه وسلم)ئەویش رێك چوو بۆ پێغەمبەری گێرایەوە (صلی الله علیه وسلم)وتی :عبدالله ئەم خەوەی بینیوە ئینجا فەرمووی : (فقال نعم الرجل عبد الله لو کان یصلي باللیل)باشترین پیاو عبدالله بەس بەمەرجێك شەو نوێژ بکا و شەونوێژ بکاتن ، ئیشارەتی بە شەو نوێژدا (فکان عبد الله لا ینام من اللیل إلا قلیلا)[٢٨٨]عبدالله کوری عومەر شەو نەئەخەوت إلا کەمێك نەبێ ئا لەوکاتەدا هەتاوەکو مردن خەریکی شەو نوێژ کردن بوو شەو بەکەمی ئەخەوت ، تەبعەن ئەمە عبدالله کوری عومەر بوو .

عبدالله عەمری کوری عاص (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێت)ئەمیان زۆر عجائیب بوو شەو هەر نەئەخەوت هەروا بوو شەو نوێژی ئەکرد بەرۆژیش بەرۆژوو ئەبوو لەشە و رۆژەکەشدا چی قورئان نازل بووبایە هەمووی دەخوێندەوە تاوەکو ئەوێی کەدابەزیوە ! باوکی ژنی بۆ هێنا هەر حالی وابوو باوکەکەی لێ پرسی وتی لەبوکەکەی وتی کچم وەزعت چۆنە لەگەل عبدالله کورمدا ، واتا عەمری کوری عاص بەبووکەکەی خۆیی ئەلێ ، ئەلێ بوکەکەی لەوکاتەی منی هێناوە نەدێتە سەر جێگا هەر ئاگای لەمن نیە ئەویش دەچێ بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شکاتی لێ دەکا ، پێ دەلێ شتێکی وا دەکا ، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بانگی کرد وتی عبدالله وامەکە لەمانگێکدا قورئان خەتم بکە لەریوایەتێکدا دەلێ لەچل رۆژدا دواتر دەلێ لەمانگێکدا دواتر دەلێ لەوە کەمتر ئەتوانم لەهەموو رۆژیکدا خەتم ئەکەم وتی نا لەوە مەکە تاوەکو وتی لەسێ رۆژ کەمتر خەتم مەکە بەسێ رۆژ خەتم بکە ، دواتر وتی شەویش بخەوە وشەو نوێژیش بکە بەرۆژیش بەرۆژوو بە وە بەرۆژووش مەبە بیشکێنە ئەوها بەم شێوازە واتا بەبەردەوام وامەکە .
ئێوە سەیری سەلەفی ئومەت بکەن لەچی دا مونافەسەیان ئەکرد !؟ لەعیباداتدا ، ئەمرۆ بەداخەوە لەغەیری عیبادات منافەسە دەکەن ، ئینجا ئەمە فەزلی شەو نوێژە کە گێرامانەوە.

لەسەهلی کوری سەعدەوە (رەزای الله تعالی لێ بێت) دەفەرمووێی : پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی : (جاء جبریل – علیه السلام – إلی رسول الله – صلی الله علیه وسلم –)ئەلێ جوبریل هات بۆ لام ، تەبعەن جوبریل کە دێت بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)لەسەر شێوەی پیاوێك دەهات

[٢٨٨] : الکتب » صحیح البخاري » کتاب فضائل الصحابة» باب مناقب عبد الله بن عمر بن الخطاب رضي الله عنهما، رقم الحدیث : ٣٥٣٠

بۆلای پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)( فقال: يا محمد، عش ما شئت فإنك ميت)ئەی محمد چەنێك ئەژی بژی بەس والله هەرئەبێت بمريت مردن بۆ هەموو کەسێکە إلا خوا نەبێت حی لایموت بەس الله تعالی نامرێت جا چەنێك ئەچی بژی بزانە کۆتاییەکەت مردنە (وأحبب من شئت فإنك مفارقه)کێشت خۆش ویست خۆشت بوێی بەس والله هەر ئەبێت بەجێ بهێلی ، تەبعەن پێغەمبەر لێیان پرسی لە ژیانی خۆیدا (صلى الله عليه وسلم) کێت خۆش دەوێی ؟ صەحابەیەك لێ پرسی بۆئەوەی مەنزیلەی خۆیی بزانی لای پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، تەبعەن پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) خوایان لەهەموو کەسێك و شتێك زیاتر خۆش ویستووە وە هیچ بەس لەئینساندا داوایان لێ کرد پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) فەرموویی : عائیشە ، لەهەموو کەسێك زیاتر لەخێزانەکانی عائیشە لەهەمووان زیاتر خۆشتر دەوویست ئەمیش خۆشەویستی دل کە ناگیری ، پاشان وتیان کێتر وتی :ئەبو بکر .

ئێمە بۆیان باسی ئەوەمان کرد جوبرایل (عليه السلام) دەفەرموویێ :کێت خۆش دەوێی خۆشت بوێی بەلأم هەر بەجێدەهێلی (واعمل ما شئت فإنك مجزي به)چی ئەکەی بیکە لە چاکە و خراپە ئەوە چاکەکان ئەوەش خراپەکان چی دەکەی بیکە !بەلأم ئاگادار بە پاداشت و سزای لەسەرە .

لێرەدا ئیشارەت بە بابەتێکی زۆر گرینگ و حەساس ئەدەین ، بەداخەوە زۆرێك لەوانەی کەوا داعین بۆ ئیسلام بەحیسابی خۆیان ئایەتەکان زۆر بەهەلە بۆ خەلکی تەفسیر دەکەن بۆنمونە ئەم ئایەتەی کە الله تعالی دەفەرمووی : (فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ)[٢٨٩] ئەلێ ئازادییە بەکەیفی خۆت ئەوەتا الله تعالی حوریەتی داناوە ! الله تعالی حوریەتی دانەناوە بەلکو ئەترسێنی ئەلێ چی ئەکەی بیکە دواتر دێتەوە بەردەمی من ئەوە حورییەتە !؟ پرسیارێك لەخۆتان بکەن ئەمە حوریەتە ؟! تۆ بەندەی یان حوریی !دواتر الله تعالى لەدوای ئایەتەکە راستەوخۆ باسی عەزابەکە دەکاتن دەفەرموێی : ئاگرێکم بە ئەلقاو ئەلق بەدەوریاندا داناوە هاواری ئاو دەکەن ئاو نیە بەئاگر لەدەمو چاویاندا ئەدرێی ! ئاخر ئەمە کەی حورییەتە . ولله مثل الاعلی وەکو ئەوە وایە مندالەکەت دەلێ بابە دەچم بۆ فلان شوێن باوکەکەش دەلێ مەچۆ کورەکەم ، مندالەکەش هەر دەلێ دەچم ، باوکەکەش دەلێ ئەچی دەبچۆ کەیفی خۆتە بەس بزانە چیت لێ دەکەم گەر بچیت !ئەمە حورییەت بوو باوکەکە دایی بەکورەکەی !؟ ئەمە هەرەشەیە .

جا لێرەدا جوبرایل پێ دەلێ : (واعمل ما شئت فإنك مجزي به)چی ئەکەی بیکە بەلام ئاگاداری پاداشت و سزا بە چاکە بکەی پاداشتە خراپە بکەی سزایە ! .

[٢٨٩]:سورة الكهف اية : ٢٩

(واعلم أن شرف المؤمن قيامه بالليل)ئەمەیە باسەکەمان لە حەدیسەکەدا فەرمووی : بزانە شەرەفی ئیماندار گەورەیی و رێزی ئیماندار لەلای الله تعالی شەو نوێژەکەیەتی ، ئالەوێدا شەرەفی تۆ دەر دەکەوێی لەلای الله تعالی دا (وعزه استغناؤه عن الناس)[٢٩٠] وەعیزەتی ئەوکەسەش ئەوەیە کەوا دەست لەکەس پان نەکاتەوە عەزیزیەتی تۆ و گەورەیی تۆ ئەوەیە کەوا دەست لەخەلك پان نەکەیتەوە ، سەیرتان کردوە ئەوەی وا دەکا چی بەسەر دێی زەلیل دەبێ .

بێنە سەر کەلیمەی شەرەف ، ئەلێ لە لوغەتدا یانی بەرزایی ، (الشرف فی اللغة هو العلو ، ویقال: إذا الشرف أی ذا العلاء والرفعة)شەرەفی هەموو شتێك بەرزایەکەیەتیەتی (لما وقف في الليلة وقت صفاءي زكري متذليلا متخشعا بين يدي مولاه لا إذا بعز جنابه وحماية شرفه بخدمة ورفع قدره عند الملائكة)کەشەو هەلدەستێ و خۆیی زەلیل دەکا بۆ الله تبارك وتعالی ئالەو کاتەدا کە خۆیی زەلیل دەکا و لەالله تعالی ئەترسێ پەنا ئەگرێی بەعیزی الله تبارك وتعالی الله تعالی ئەیپارێزی و شەرەف و عیز و کەرامەتی ئەداتێ وەلەلای مەلائیکەتەکانی باسی دەکا وە قەدری را ئەگرێی الله تعالی وە الله تعالی ئەیکات بە تایبەت مەندترین بەندەکانی خۆیی ، ئەمە هەر لەباسی شەو نوێژ کە خۆشەویستی الله تعالی ت ئەداتێ و ئەتگەیەنێ بەم دەرەجەیە وە الله تعالی ش تۆیی خۆش دەوێی .

لەبیلالەوە (رەزای الله تعالی لێ بێت )پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (إنه دأب الصالحين قبلكم، وقربة إلى الله تعالى، ومنهاة عن الإثم، وتكفير للسيئات)[٢٩١] شەو نوێژ بکەن ئەمە عادەت و شەئنی پیاو چاکانی پێش ئێوەش بووە ، چونکە شەو نوێژ هەر بووە لەئومەتەکانی پێشوش دا ، وە ئەمە لە خواتان نزیك ئەکاتەوە وە واتان لێ ئەکات گوناهە نەکەن وە گوناهەکانیشتان ئەسرێتەوە .

ئەبو هورەیرە (رەزای الله تعالی لێ بێت )دەفەرمووێی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (ینزل رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا)الله تعالی هەموو شەوێك دێتە ئاسمانی یەکەم (حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ)کە بەشی سێ یەکی ئاخیری شەو دەمێنی لەوکاتەدا دێتە خواری (يَقُولُ : مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ)دەفەرمووێی : کێ دوعا دەکا تاوەکو وەلامی بدەمەوە و قبولی بکەم (مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ) کێ داوای شتێکم لێ دەکا تاوەکو بیدەمێ(مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ")[٢٩٢] کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تاوەکو لێ خۆشبم .

[٢٩٠] : مستدرك الحاكم (٥/ ٤٦٣) برقم (٧٩٩١)
[٢٩١] : وقد صححه الألباني في صحيح الجامع، وضعف ما بين القوسين في ضعيف الجامع.
[٢٩٢] : أخرجه البخاري في صحيحه (١١٤٥) ومسلم (١٢٦١)

زۆربەی خەلکی لەم کاتەدا بیّ ئاگایە دوای بزانە خۆشەویستانم . ئەلیّ : (أبعد هذا ترغیب وتشویخ نتکاسل )لەدوای ئەو هەموو ئایەت و حەدیسانەی کە باسمان کرد کە زۆریتر ماوە دەبارەی شەو نویّژ بەس ئەوەندە بەسە ئەلیّ لەدوای ئەمە ئیتر ئیّمە تەمبەلی بکەین لە شەونویّژ دەبیّ !! (اعلم أن قیام اللیل صعب إلا من وفق للقیام بشروطه المیسرة له)لیّرەدا بابەتیّکی گرینگ دیّتە پیّشەوە ئەویش ئەوەیە قورسە یان قورس نیە ؟! واللە قورسە شەونویّژ زۆر قورسە کە تۆ لەخەودا و لەناو جیّگادا هەلسیتەوە سەعاتیّك لەگەل اللە تعالی دا خەریکی نویّژ و تاعەت و قورئان خویّندن و دوعا و پارانە و تەوبە و گەرانەوە بی بەتەنها لەگەل اللە تعالی دا بەلی قورسە ، بەلاّم اللە تعالی لەسەر کەسیّك ئاسانی دەکا زانایان باسی ئاسنکارییەکانیان کردوە ، چونکە تۆ پرسیارت بۆ دروست دەبیّ ئەلیّ من چی بکەم تاوەکو ئەمەم لەسەر ئاسان بیّ و ئەم قورسایەتیەم لەسەر نەمیّنی ریّنمای ئەم خالانە بکە :

ئاسانکارییەکان:

١-(فمن الاسباب ظاهرا وباطل) لەهۆکارەکان هەیە لەبەر چاوە وە هەشە دیار نیە .

بەر چاوەکان باس دەکەین (ظاهرا):

أ-(أن لا یکثر أکل)شەو زۆر خۆری مەکە ، دائیمەن ئەوەی زۆر خۆر بیّ لەشەودا کیّشەی هەیە و موشکیلەیە چونکە خەبەری نابیّتەوە ، ناتوانیّ و لەشی گران دەبیّ تووشی ئیّش و ئازار دەبیّ لەش سوك نابیّ ، بەلاّم بەداخەوە ئەمرۆ سەیر دەکەی خواردن گرینگیەکی زۆری پیّدراوە بەم شیّوەیەش وادەکا لەشەکانمان گران و قورس بیّ و هەلنەستین بۆ شەو نویّژ.

ب-(ان لا یتبع نفسه باالنهاري بأعمال شاقة )لەرۆژ خۆت ماندوو مەکە بەئیشی قورسەوە هەر ئیش لەبەیانیەوە هەتاوەکو ئیّوارە هەر ئیش ، ئەوکاتە کە وات کرد ئەچیتە مالەوە ئەبیّ بخەویت هەلنەستی هەتاوەکو ئیّوارە نویّژەکەی بەیانیشت ئەروا ، لەلای خەلك کار و ئیشەکە گرینگە وەزیفە و کارەکەی نابیّ بروا بەس نویّژ و تاعەت و عیبادەت ئەروا کەیفی خۆیەتی هەمووی ئەکا بەقوربانی ئەو .

ج-(أن لا یتکر قیلولة بالنهار)نیّوەرۆ پیّشی یان پاشی خەویّکی کەم بەجیّنەهیّلیّ واتا نیوەرۆ خەویّك بکا ئەمەش سونەتی پیّغەمبەر بووە (صلی الله علیه وسلم)ئیّستا باسی خەوەکان ئەکەین :

پیّغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)عادەتی وابووە بەیانیان لەدوای نویّژی بەیانیان نەخەو تۆتەوە هەتاوەکو گەیشتۆتە کاتی پیّش نیوەرۆ ئینجا سەعاتە خەویّکی کردوە ئەمە پیّ وتراوە قەیلولە ئەمە بەعەرەبی وای پیّ دەلیّن زۆر گرینگە ئەمە ئیسراحەتت ئەداتیّ . دوای ئەوە پیّغەمبەری خوا (صلی الله

علیه وسلم)دوای عصران نەخەوتۆتەوە لەدوای عیشا زوو خەوتوە نیوە شەو هەلساوەتەوە ئەمە ژیانەکەی بووە .

ئێمە واناکەین بۆیە شەو نوێژمان لا گرانە .

د-(أن یجتنب الأوزار)ئەمە زۆر گرینگە گوناه واز لیٚ بێنە بەهۆی گوناهەوە الله تعالی بیٚ بەشت دەکا بۆ ئەوەی لیٚ نزیك بیتەوە ،ئێستا ئێوە سەیری خۆتان بکەن کەسێك هەلەیەکت بەرامبەر بکا حەز دەکەی لێت نزیك بێتەوە !؟حاشا لەرووتان کەسێك ئەگەر جوێنێکت پیٚ بدا یان حەقێکت بفەوتێنی یاخود بەقسەت نەکا یان شتێك لەوبابەتانە کە ئەیبنی رووی لی لائەدەی ئەلیٚ بانەیبینم ولله المثل الأعلی الله تعالی حەزناکا بەندەکەی ببینیٚ ئاوا بەردەوام بیٚ لەسەر گوناه ئەلیٚ بانەیەت بۆ لای من شەو نوێژەکەیشم ناوێی ناتوانی بیکەی ،

نمونەیەکی زۆر ئاسان دەهێنینەوە : یەکیٚ لەزانایانی پێشوو ناوی ثوری بوو ئەلێت : (حرمت قیام اللیل خمسة أشهر بسبب ذنب أصبته.)[٢٩٣] گوناهێکم کرد پێنج مانگ شەو نوێژم پیٚ نەکرا ، ئێمە با لەخۆمان بپرسین لەسالەکەدا چەنێك شەو نوێژ دەکەین !؟ لەنێوان خۆمان و الله دا با قسە بکەین و داوای لێبوردنی لیٚ بکەین و بلێن خوایە داوای لێبوردن دەکەین کە تۆ وات وت ئینجا الله تعالی تۆیی خۆش دەوێی دیسانەوە یارمەتیت ئەدا بۆ شەو نوێژ و عیبادەت ئیعتراف بە گوناه وە زەلیلی بۆ الله تعالی وە پارانەوە و گریان ، نەك گوناه بکا و ئەرق ئەخوا کەچی ئەلیٚ من باشم ئەلیٚ بۆ خراپم کاکە !! کەتۆ بەس کە نوێژ ناکەی وەکو ئیبلیس وایی لەلای الله تعالی ئەوە لەلای الله وایت تۆ خۆت بەباش دەبینی بەس وانیت ، ئەگەر حیسابی لای الله تعالی بکەی وەکو ئیبلیس وایت ، الله تعالی وتی بۆ سوجدەت نەبرد کە پێم وتی ؟! ئەها چەندە پیٚ ناخۆشە الله تعالی سەجدە نەبەی ! بەس ئەمرۆ وا ئەزانی مەلائیکەتە ئەلیٚ کاکە حاجی دەست و قۆلی خەلك ئەبرێی خۆمن قۆلی خەلك نابرم ئەو حەجیشی کردوە ئینجا واخراپە من خۆ لەو باشترم !دلی خۆیی بەمە خۆش دەکا ، ئیٚ کاکە حاجی حەجی کردوە قۆلی خەلك دەبرێی تۆ وەکو ئەو مەکە بەس لەو باشتربە بۆ لەو خراپتر ئەبی کە نوێژ ناکەی خۆ بەلایەنی کەمەوە ئەو نوێژەکە دەکا تاوانێك ئەخاتە ملی خۆیی بەس تاوانی کوفر ناخاتە ملی خۆیی ، تۆ تاوانی کوفرەکە ئەخەیتە ملی خۆت خۆت پیٚ لەو باشترە !؟ والله ئەوەی نوێژ نەکا کافرە (بین الرجل وبین الکفر والشرك ترك الصلاة)[٢٩٤] .

ه-(أن یبکر فی النوم)دوای عیشا زوو بخەوێی ، ئێوە بەس سەیری شەوەکانی زستان بکەن شەش سەعات دوای عیشا ئەمێنێتەوە دوایش ور دەبیٚ ، کەسێك بۆی باس کردم دەیوت لەنەخۆشخانەیە دەیوت ئەو

[٢٩٣] : (حلیة الأولیاء، لأبي نعیم (٧/١٨))
[٢٩٤] : رواه مسلم في الصحیح عن جابر بن عبدالله الأنصاري ▯ وعن أبیه

هەموو گەنجە ئەهێنن هەمووی وەکو خەلەفاوی لێهاتووە بەدیار فیسبوکەوە ١٦ سەعات دانیشتووە ١٦ سەعات تۆ سەیری شاشەیەك بکەی ئاخر لەکوێی مێشکت ئەمێنی ، ئینجا ئەیوت هەمووی تووشی نەخۆشی نەفسی بوون ، بابەتەکەش هەمووی جنسە ، سەیری کچان و کوران بکە هەردەلی خۆشم دەوێی دەی با بەیەکتری بگەین دایك و باوك ئاگای لێ نیە نیوە شەو تەلەفۆنی بۆ کچە کردوە باوکەکەش ئاگای لەکچەکەی نیە ، ئەم پیاوە چ پیاوێك دەردەچێ ،

مۆبایل و فیسبوك و ئەنترنێت هەمووی بۆ جنسە ، ئی کاکە کچەکانتان زوو بەدەن بەشوو وە کورەکانیشتان زوو ژنیان بۆ بهێنن با ئەم کێشەیەمان نەمێنی لەسەرخێر و لەسەر دین و تەقوا و پیاو چاکی و لەسەر ئەخلاق جوانی ، نەك لەسەر بەرەلایی و پارەکان و شوێنە خراپەکان بلێن ئەمە حوریەت و ئازادییە دوایش تەق تەق بنێن بەسەری کچەکەدا و بلێن ئیسلام هەلەی کرد ، نا ئیسلام هەلەی نەکرد جەنابت هەلەت کرد رێنمای ئیسلامت وەرنەگرت ئەم هەموو کوشتن و کوشتارە دروست دەبێ بەواستەی تۆیە کە شوێن شەیطان و خکواطەکانی شەیطان کەوتوە ئەگینا الله تعالی زۆر لەوە گەورەترە الله تعالی بەرنامەیەکت بۆ دابنێ تۆ لەدوای بەرنامەکە نەبێ کەچی بلێ بەهۆی ئەم دینەی خواوە وام لێهاتووە .

لەم بابەتی زوو خەوتنەدا سەیری دایکمان عائیشە بکەین (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێت)کە ئاگای لە پێغەمبەر بووە (صلى الله عليه وسلم)ئەفەرمووێی: (كان ينام أوله ويقوم آخره فيصلي)[٢٩٥]ئەخەوت لە سەرەتای شەوەکە نیوە شەو هەلدەستا و دەستی ئەکرد بە شەو نوێژ ، ئەمرۆ ئێمە نا دائەنیشین هەتا ئەگاتە بانگی بەیانی داوی بخەوە و نوێژەکەشت لەدەست دەرئەچێ هەلەیە بەلکو زوو بخەون .

لەحەدیسێکیتردا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێی : (نهى عن سمرى بعد العيشط )نەهی کردوە لەوەی تۆ لەداوای عیشا دابنیشی و وتو وێژ بکەی باسی دونیا بکەی إلا بۆ زەروورەت نەبێ بۆ پێویستی هەتاوەکو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتاری نەئەدا لەدوای عیشایانەوە إلا بۆ پێویستی نوێژەکەیان ئەکرد و ئەچونەوە بۆ مالەوە ئەخەوتن بۆ ئەوەی بۆ شەو نوێژ خەبەریان ببێتەوە ئیسراحەتێك بکە .

و–(أن ينام علي طهارة ذاكرا لله رب العالمين)رجاتان لێ دەکەم ئەمە زۆرئاسانە بەس شەیطان قورسی دەکا لەسەرمان ! چی تێ دەچی تۆ پێش ئەوەی بخەویی دەست نوێژێك بگریی ، دەست نوێژێك بگرە ئینجا بخەوە ، یادی الله تعالی بکە لەسەر دەست نوێژ و یادی الله تعالی بخەوە زۆر ئاسانە زۆر ، بەس کێ

[٢٩٥] : الكتب » صحيح البخاري» كتاب التهجد» باب من نام أول الليل وأحيا آخره،،،،، رقم الحديث :١٠٩٥

ئەیکا ؟!بەدەگمەن خەلك هەیە بیکا ، ئاگای لەهیچ نیە و ئەخەوێت و ئاگای لەهیچ شتێك نیە ، ئەمە واقیعی خەلك بەزۆری وایە .

٢–هۆکارە داخیلییەکان :

أ–(أن ینوي عند نوم قیام اللیل )کە چویتە سەر جێگا بیرت بێ بلێ خوایە بۆ شەو نوێژ خەبەرم بکەیتەوە ، بیرت بێ بۆ ئەمە ، تۆ ئێستا کاتێك سەفەرێکت ئەبێ بەیانی ئەچێت بۆ فلان شوێن ئەلێت مال و مندال ئاگادارین خەبەرم بکەنەوە ئەگەر خەبەریشم نەبوویەوە خەبەرم بکەنەوە ! یانی هەموو کەسێك تێ ئەگەیەنێ کەوا سەفەرێکی هەیە بۆی بروا ، تۆ سەفەری شەو و کاروانی بروادارانت هەیە بۆلای الله تعالی ئەو کاروانە لەم کاروانەی دونیا گەورەترێکە دەی خۆتی بۆ ئامادە بکە بالەنیەتت دا بێ بۆ ئەوەی هەلسی ، خۆ ئەگەر بێتوو خەبەریشت نەبێتەوە الله تعالی بەنیەتەکەی خۆتت بۆ ئەکا ،ئەی ئەگەر نیەتت نەبوو ئەوە بۆت نانوسرێی هەروەکو پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرمووێی : (إنَّما الأعمالُ بالنِّيَّات)[٢٩٦] .

ئەبو دەرئا (رەزای الله تعالی لێ بێت)دەفەرمووێی : پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (من أتى فراشه)هەرکەسێك بچێتە سەرجێگای شەو و بخەوێی (وهو ینوي أن یقوم یصلي من اللیل)نیەتی هەبوو کەوا شەو نوێژ بکا (فغلبته عیناه حتى أصبح)بەلآم چاوی چووە خەو تاوەکو نوێژی بەیانی ، نوێژی بەیانی نەرۆیشت بەس تاوەکو نوێژی بەیانی هەلنەستا ، تەبعەن ئەم شتە لەلای صەحابە زۆر سەیر و عەجیب بووە چۆن تا نوێژی بەیانی خەوتووی !! لەلای ئەوان نوێژی بەیانی حەتمەن ئەبوایە لەمزگەوت بووبایە ، ئەبوایە پێش نوێژی بەیانی هەلبستایە ،،،، ئەلێ ئەگەر وابێ (حتى أصبح كتب له ما نوى)بەلآم الله تعالی ئەوەی بۆ دەنوسێ کە لەنیەتەکەیدا هەیەتی کە چەند خۆی ئامادە کردبێ بۆئەوەی بیکا (وكان نومه صدقة علیه)[٢٩٧]الله تعالی ئەم خەوەی بۆی ئەکا بەصەدەقە بۆیی بشخەوە ئەوە بۆشم حیساب کردی بە موجەرد نیەتەکەی ، یانی ئێمە ئەو نیەتەشمان نەبێ .

ب–(سلامة القلب للمسلمین وخلوه من البدع وإعراض عن فضول الدنیا)دلت سەلامەت بێ لەبەرامبەر موسلمانان غەیبەتیان مەکە کە سەر ئەخەیتە سەر سەرینەکەت دلت پاك بێ و رقت لەهیچ موسلمانێك نەبێ لەگەل الله تعالی دا بیت و پەیوەندیت بەدونیاوە نەمێنی ، رقت لەهیچ کەسێك نەبێ کە موسلمانە إلا لەبەر الله تعالی نەبێ رقت لێیان بێت ، لەبەر دونیا رقت لەهیچ کەسێك نەبێ ، برۆ خۆت ئاشکەرەوە ،

[٢٩٦] : أخرجه البخاري، كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله -صلى الله علیه وسلم-؟ (٦/١)، رقم: (١).
[٢٩٧] :صحیح البخاري : ١٧٨٧

خۆشەویستانم بابەتی تێکچوونی نێوانی دوو کەس کە لەسەر دونیایە  وە لەسەر دینە جیاوازی هەیە !
لەسەر دونیا لەسێ ڕۆژ زیاتر بۆت نیە لەگەل برای موسلمان و خوشکی موسلمان ئیتر ناسیاو بێ یاخود نەناسیاو بێ تۆ دەنگ دابرێی و پەیوەندیت نەمێنی .
پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : بۆهیچ موسلمانێك نیە لەسێ ڕۆژ زیاتر لەسەر دونیا دەنگ لەیەکتری دابرێی ، ئەبێ إلا برۆن ئاشت ببنەوە ئەگەرنا تاوانبار ئەبن باشترینیان ئەو کەسەیە کە تەوقە لەگەل براکەی دەکا و پێ دەلێ (السلام علیکم )باشترینی ئەم دوانە ئەوەیانە کە یەکەم جار دەچێتەوە لای ، جا با شەیطان عاسیت نەکا لەخوای تعالی ، بلێ چۆن من برۆم ، تۆ برۆ تۆ باشترینەکەیت .
ئەمەش ڕێنمایە بۆئەوەی لەناو کۆمەلگاکەماندا رق و کین و دووبەرەکایەتی نەمێنی ، بەس ئەمرۆ هەمووی لەسەر دونیایە ، بابزانین کێ لەسەر دین لەگەل کەسێکدا دلی خۆیی عاجز دەکا ! هەزار جوێن بەخوا بدرێی و هەزار ئەحکامی الله تعالی پێشێل بکرێی هەزارجار بێ شەرعی فەرمانەکانی الله تعالی بکرێی گوێی لێی نیە ، موشکیلەی نیە و بەقوربان و بەساقەی دەبێ دەچی و کەبابیشی لەگەل دەخوا . بەس جوێنێکی پێ بدە یان پارەیەکی لێ بخۆ ، پێ ئەلێ قەت قەت قسەت لەگەلدا ناکەم ئەگەر دەهەزارەکەشم نەدەیتی ، بەس هەزار جوێن بەخوای گەورە بدرێی پێ دەلێ تۆ برای گەورەمی کێشە نیە ، لەسەر دونیا ئاوایە وە لەسەر دینیش ئەمە حالمانە !، بەعکسەوەیە لەسەر دین صەحابە فەرموویانە بەزیندوویەتی و مردوویش قسەت لەگەل ناکەین واتا نایمە سەر گۆرەکەشت لەسەر دین وابوون بەس لەسەر دونیا وانەبوون
.
جا کەخەوتی با ئەو دلەت پاك بێ لەسەر ئاستی موسلماناندا لەسەر دونیا گوێیی مەدەرێی هەر دەبرێتەوە دونیا .
ج–(خوف غالب یلزم قلب مع قصر الأمل ) زۆربترسە لە الله تعالی وە هیواشت کەم بێ ، یانی ئاواتەکانت مەگەینە ٥٠ سال و ٦٠ سال حیسابی ئەوەندە بۆخۆت بکەی بەلکو بلێت رەنگە ئەم شەو و لەم رەحەزەیەدا خەبەرم نەبێتەوە و هەناسم بۆ نەیەتەوە جارێکیتر ، لەوانەیە ئەم شەو هەر لەخەوەکەدا بمرم ، لەوانەیە نەگەمە بەیانی بترسە دائیمەن ئەوە بۆخۆت دابنێ  ئەوکاتە سەیر ئەکەی و ئەترسی و شەو نوێژ ئەکەی ئەلێ من مادەم مردن لەبەر دەمم دایە با خێرا ئەم عیبادەتە پێش بخەم بۆخۆم .
باتاقی بکەینەوە هەریەك لەئێمە ئەگەر لەلایەنی وەحییەوە ئەگەر پێغەمبەرێك هەبێ پێمان بلێ ئێستا تۆ سەعاتێکت ماوە لەدونیا ئیتر ئەمری ، تەبعەن لەلایەنی وەحییەوە هەبووە نمونەیەك ئەهێنینەوە بە پێغەمبەر موسا (علیه السلام)لەصەحیحدا هاتووە ئەلێ : پێغەمبەر موسا (علیه السلام) ملك الموت هات

بۆلای بەس لەسەر شکلی پیاوێك نەیوت من ملك الموتم هات وتی ئەمەوێی رۆحت دەرکەم ئەویش وای زانی ئینسانە یەك دانەی دا بەچاویدا و چاوی کوێر کرد ، پێغەمبەر موسا (علیه السلام) بەهێز وبەقوەت بووە هەتاوەکو خۆتان ئەزانن لەقورئاندا باس کراوە بۆکسێکی دا لەکەسێك بەبۆکسەکە کوشتی (فَوَكَزَهُ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ)[٢٩٨] ماشاء الله بەهێز و بەقوەت بوو بەردەکەی هەلگرت هی سەر بیرەکە مەرو مالی ئافرەتەکانی ئاودا ، تەبعەن ملك الموت(علیه السلام) نەیوت من ملك الموتم ئەویش لێدا چاوێکی کوێر کرد چوەوە بۆلای الله تعالی وتی خوایە تۆ منت ناردوە بۆلای کەسێك کەمردنی ناوێی وتی: برۆ پیێ بلیێ ئەگەر ئەتەوێی با دەست خاتە سەر گایەك چەند مولەژێر دەستی دا بوو ئەوەندە سالیتری ئەدەمەوە ، هات بۆلای وتی : من ملك الموتم ئەوەهاتم بۆ رۆح کێشانت ئەمجارە خۆیی پیێ ناساند ، وتی الله تعالی وای وتوە !موسا (علیه السلام)وتی ئەی دوای ئەوە کە ئەوەندە مووە دەچێتە ژێر دەستی ؟! لەوانەیە چەندەها مو بکەوێتە ژێر دەستی ، وتی هەر مردنە . وتی : دەی ئێستا بمرێنە .

مەبەستمان لێرە ئەوەیە ئەگەر بەوەحیەك بۆت هات بلیێ ئێستا یان لەحزەیکیتر تۆ ئەمرێی . یان بۆچی زۆر دوور برۆین ئەوانەی کەوا ئەخرێنە ژووری لەسێدارەدانەوە پێیان ئەوترێی ١٠ یان ٥ سەعاتی تر ئەمری چی دەکا ئەم کەسە ، ئەگەر ئیماندار و بەتەقوا بیێ خێرا دوعا ئەکات و ئەپارێتەوە یانی لەحزات نادۆرێنی ،! دەتۆش ئاوای دابنیێ هەریەك لەئێمە وابزانین ئێستا ئەمرین دوای سەعاتێکتر ناگەین بەشەو ، بەلاَم لەبەر ئەویە ئەوەندە هیوامان زۆرە ئاگامان لەم شتانە نیە ونەماوە .

د-(أن يعرف فضل القيام الليل )برۆ ئەو حەدیس و بابەتانە بخوێنەوە لەسەر شەو نوێژ تاوەکو لات شیرین بیێ تاوەکو بیکەیت .

هـ-(ومن أشرف بواعث على ذلك الحب لله تعالى)لەمانە هەمووی گەورتر ئەوەیەخۆشەویستی الله تعالی لەبەر خۆشەویستی ئەو ، خۆشەویستەکەت زۆر زۆر بکەرەوە ئەمانەت هەمووی لا ئاسان دەبیێ بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەهەموو کەسێك زیاتر عیبادەتی دەکرد لەهەموو کەسێك زیاتر .

و-(وقوة لما يإن إذا قام نجا ربه أنه حاضروا ومشاهدوا فحميل المونا‌جات علي طول القيام )ئالەو کاتەدا کە هەست دەکا لەگەل الله تعالی دا قسە ئەکا موناجات ئەکا وای لیێ ئەکات درێژیشی بکاتەوە ، قسەکردن لەگەل الله تعالی دا خۆشە یاخود نا ، ئێستا بیکەن بەیەقین ئەگەر تۆ الله تعالی ببینی یانی الله تعالی خۆیمان لیێ نەشارێتەوە ، الله تعالی تەبعەن مەوجودە ئەبینرێی لەرۆژی قیامەت بەس ئێستا خۆیی نیشانی

[٢٩٨] سورة القصص اية : ١٥

کەس نادا ، بۆتاقیکردنەوە هەتا تاقی مان بکاتەوە ، بەس ئەگەر ببیبنی بەچاوی خۆت تێر ئەبی لەقسەکردن لەگەلیدا ! حەز دەکەی بەجێبێلی نەوالله ! .

ئینجا ئەم یەقینەت هەبیٚ لەم کاتانەدا .

ت–(فلنحمل على قيام الليل ودعاء والإستغفار باالأسحار الذي اخر أوقات نزول الاهية متضميمل الإستعراض عوائج السائلين واستغفار المذنبين وتوبة تائبين)بەتایبەتی بەشە ئاخیرەکەی ئاگاداری داوای لێخۆشبوونەکان بکەین لە ئەسحار ، بزانن چۆن الله تعالی وەسفی ئینسانی ئیماندار دەکا .

الله تعالی دەفەرمووی : (**لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ**)بۆ ئەوکەسانەی کەوا تەقوا کارن الله تعالی چەندەها بەهەشتیان ئەداتیٚ (**تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ**)کەپریەتی لە جۆگە و رووباری خۆش (**خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ**)هەتا هەتای تێدا ئەژین وە ژنی خاوێن وپاکیان ئەداتیٚ وەك دونیا نیە لەدونیا هەموومان ئەزانین ئێمە چۆنین و چۆن نین !پێویستیمان بەپاك بوونەوە هەیە بەلاٚم لەقیامەت وانیە پیاو ژن خاوێنە هیچ پیسایەتیەك نابینی (**وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ**)لەدوای ئەوە الله تعالی لێت رازی دەبێت (**وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ**)[٢٩٩] الله تعالی بینایە بە بەندەکانی خۆیی کامانە ؟! (**الَّذِينَ يَقُولُونَ**)ئەوانەی کە دەلێن (**رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ**)[٣٠٠] خوایە ئێمە ئیمانمان هێنا خوایە لێمان خۆشبە خوایە لەعەزابی ئاگر بمان پارێزە (**الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ**)[٣٠١] الله تعالی چۆن وەسفی کردن تێبینیتان کرد ، ئەوانەی صەبر و ئارامی دەگرن لەسەر تاعەت وە لەسەر نەکردنی تاوان وە لەسەر ناخۆشیەکان ئەوانەی کەوا راستگۆن ئەوانەی کەوا تاعەتی الله تعالی دەکەن وە ئەوانەی کە دەبەخشن لەپێناوی الله ئەوانەی کە لەکاتی پاشێودا داوای لێبوردن لە الله تعالی دەکەن و تەوبە و ئیستغفار دەکەن . بەتایبەتی لەمانگی رەمەزاندا زۆر ئاگاداری ئەم کاتە بە لەکاتی نانخواردنەکەشدا هەر داوای لێخۆشبوون لە الله تعالی بکە چونکە بەراستی ئەم مانگە دەرسە بۆئێمە وشیارمان دەکاتەوە .

لەعەمری کوری عبسەوە (رەزای الله تعالی لیٚ بێت) دەفەرمووێ : گوێی لە پێغەمبەر بووە (صلی الله علیە وسلم)( أقرب ما يكون الرب من العبد في جوف الليل الآخر)نزیکترین کاتێك کە الله تعالی لەبەندەکانی نزیك بیٚ لەبەشی ئەخیری شەودایە (فإن استطعت أن تكون ممّن يذكر الله في تلك الليلة فكن)[٣٠٢] ئەگەر دەتەوێی

[٢٩٩] :سورة ال عمران اية :١٥
[٣٠٠] :سورة ال عمران اية : ١٦
[٣٠١] :سورة ال عمران اية : ١٧
[٣٠٢] : الكتب » سنن الترمذي» كتاب الدعوات» باب في دعاء الضيف ،، رقم الحديث :٣٥٧٩

یەکێك لەوانەی کەوا یادی الله تعالی دەکەن وە عیبادەتی الله تعالی دەکەن تۆ یەکێك بە لەوکەسانە لەوکاتەدا .

**هەشتەم:**

ئیمامی إبن القیم دەفەرمووێ : (مجالسة المحبين الصادقين، والتقاط أطايب ثمرات كلامهم كما ينتقي أطايب الثمر، ولا تتكلم إلا إذا ترجحت مصلحة الكلام، وعلمت أن فيه مزيدا لحالك، ومنفعة لغيرك.)لەم خالەدا باسی ئەوە دەکەین ئینسان بەبەردەوام لەگەل کەسانێکدا دابنشێ کەکەسی راستگۆ و لەخواترس و ئیماندارابن ، مەجلیسی مەجلیسی ئەوکەسانە بێ کەوا دائیمەن ئاگاداری قەبر و قیامەتەکەی خۆیان هەن دوورکەوێتەوە لەمەجلیسە دونیاویەکان .

ئەم هۆکارە زۆر گرینگە کە لەچەند حەدیسێکدا باسی دەکەین کە ئینسان لەناو ئەم مەجلیسانەدا کە دائەنیشی و گوێی ئەگرێی وە ئەو شتە چاك و باشانەی کەوا لەمەجلیسەکەدا باس دەکرێی لەفەرموودەی الله تعالی وە لەفەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)یان لەنەسیحەتی باش و پەند و ئامۆژگاری باش وەریبگرێی سودی بۆخۆیی و غەیری خۆیی لێ بکا وە قسە نەکا إلا مەگەر بزانی قسە کردن لەمەصلەحەتیەتی وە بزانی بۆخۆیی باشە وە مەنفەعەتی بۆ غەیری خۆیی تێدایە .

ئەبو ئیدریسی خۆلانی (رەحمەتی الله تعالی لیٚ بیٚ ) کە ناوی عائیضی کوری عبدالله بوو سەیدی قورای ئەهلی شام بوو لەزەمانی خۆیدا ئەمەمان بۆ ئەگریٚتەوە و دەلیٚ : (دَخَلْتُ مَسْجِدَ دِمَشْقَ، فَإِذَا فَتًى بَرَّاقُ الثَّنَايَا، وَإِذَا النَّاسُ مَعَهُ)لەمزگەوتی دیمەشق چوومە ژورەوە سەیرم کرد کوریٚکی گەنجی دەم و چاو جوان خەلك لەدەووری کۆبوبویەوە (إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيءٍ أَسْنَدُوهُ إِلَيْهِ، وَصَدَرُوا عَنْ رَأْيِه أو قوله)ئەگەر هەرشتیٚك باسبکرایە کیٚشەیەك یاخود خیلافیٚك دروست بووبایە خۆیان ئەدا پالْ ئەو قسەی ئەویان وەرئەگرت ئەیان کرد بە حەکەم لەنیٚوان خۆیاندا ،

(فَسَأَلْتُ عَنْهُ،)پرسیارم کرد ئەمە کیٚ یە ؟

(فَقِيلَ: هَذَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ)وتیان : ئەمە موعاذی کوری جەبەلە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیٚ بیٚت)هاوەلی پیٚغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ هَجَّرْتُ، فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَبَقَنِي بِالتَّهْجِيرِ، ووَجَدْتُهُ يُصَلِّي)رۆژی ئایندە وتم من لەپیٚش ئەودا ئەرۆم بۆ مزگەوت سەیرم کرد ئەو لەپیٚش مندا رۆیشتبوو ! سەیرم کرد وا نویٚژ دەکا (فَانْتَظَرْتُهُ حَتَّى قَضَى صلاتَهُ)تا نویٚژەکەی لیٚبوویەوە منیش چاوەریم کرد (ثُمَّ جِئْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ)هاتم لەبەرووی دانیشتم و سەلام لیٚکرد (ثُمَّ قُلْتُ: وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ لِلَّهِ،)وتم :سویٚند بیٚ بە الله من لەبەر خاتری الله تعالی تۆم خۆش دەویٚی ،

(فَقَالَ: آللَّهِ؟)ئەویش وتی : لەبەر الله منت خۆش دەویٚی ؟!

(فَقُلْتُ: آللَّهِ،)ئەویش وتی : ئەری والله لەبەر الله تۆم خۆش دەویٚی .

جاریٚکیتر وتی تخوا لەبەر الله منت خۆش دەویٚی ؟

ئەویش دیسانەوە وتی : ئەری والله لەبەر الله .

(فَأَخَذَنِي بِحَبْوَةِ رِدَائي، فَجَبَذَنِي إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَبْشِرْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول)ئەلیٚ : بەرۆکی گرتم وتی : گویٚبگرە موژدە بیٚ لیٚت پیٚغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گویٚم لیٚبووە فەرموویەتی : (قالَ اللَّهُ تَعَالَى)[٣٠٣] واتا الله تعالی فەرموویەتی : (وَجَبَتْ مَحبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، والمُتَجالِسِينَ فِيَّ، وَالمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ، وَالمُتَباذِلِينَ فِيَّ)[٣٠٤] خۆشەویستی من واجب بوو بۆ ئەو کەسەی کەوا لەبەر خاتری من یەکیتریان خۆش بویٚی ، وە لەبەر خاتری من دائەنیشن لەگەل یەکدا وە سەردانی یەکیتری دەکەن لەبەر خاتری من وە ئەبەخشن بەیەکتری لەبەر خاتری من ئەوە مەحەبەتی من بۆ ئەوانە .

[٣٠٣] : ئەمە حەدیسی قودیسەیە ، ئەوەیە کەوا پیٚغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بفەرمووی :الله تعالی وای وتوە

[٣٠٤] : حديث صحيح رواه مالك في الموطأ بإسناده الصحيح

جا ئەم خالە زۆر گرینگە هەموو کار و کردەوەکانتان کۆبکەنەوە لەبەر خاتری الله تعالی ، لەبەر ئەوەی الله تعالی بێ ئاگا نیە باش بزانە الله تعالی لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێ : بێ ئاگا نیم لەخەلکەکەی خۆمان ، بۆیە الله تعالی ئاگای لەهەر هەموومانە . کێ لەبەر چی لەگەل یەکدا کۆدەبێتەوە ، ئەوەی بۆ باشە کۆدەبێتەوە ئەوە لەلای الله تعالی بەم شێوەیە کە باسمان کرد ، ئەوەشی بۆ خراپە کۆدەبێتەوە ئەبێ حیسابی خۆیی بکا .

ئەلێ با ئێمە ئاگاداربین : (فالنحرص على أن تكون مجالس ربناية مجتمدة على مايلي)با مەجلیسەکانی خۆمان وا لێ بکەین ئەم خالانەی باسی دەکەین با پێك بێت لەم خالانە :

١-(الأمر بصدقة والمعروف والإصلاح بين الناس)هەر کۆر و کۆبونەوەیەکی ئێمە با بریتی بێ لەوەی ئەمر بکەین بە خێرو خێرات ، چوار کەس دائەنیشن بلێ ئەرێی کاکە ئاگات لەفلان کەسە ؟ ئاگاتان لەفلان کەس هەیە !؟ ئەو مەجلیسانە زۆر پێویستیە ، لەوانەیە لەهەر گەرەکێك چەند کەسی تێدا بێ بێ باوك و بێ نەوا بێ ، کەسی وا هەبوو وتویەتی : والله نیمە ، ئەگەر ئێمە چوار پێنجێك دابنیشین بەتایبەتی ئەوانەی کەوا دەست رۆیشتوو و دەولەمەندن . لەمزگەوتەوە دەست پێ بکەین .

خۆی مزگەوت چگای ئەمانەیە خۆشەویستانم :

ئەبێ پێك بێت لەشوێنێك کە تەنها الله تێدا پەرستراوە لەبەر خاتری الله تعالی ئەوەی دەیلێن جێ بەجێ بکەین قەبر و قیامەتەکەمان بپارێزین .

ئادەی وەرن کاکە ئەو مالانەی فەقیرن با بەسەریان بکەینەوە کێ تان لە هەر شوێنێك دەولەمەندە با هەولدا کاری وا بکا ، چونکە زۆر جار کەسی وا هەیە ئەلێ نازانم بیدەم بەکێ ! ، یان کەفارەتی سوێند هەیە ئەلێ نازانم بیدەم بەکێ !

ئەگەر ئێمە هاریکاری و هاوکاری یەکتری بکەین مالە فەقیرەکان دیاری بکەین هەر مزگەوت و مامۆستای مزگەوتێك لەچواردەوریی خۆیدا وە فەقیر و نەبووی گەرەکەی ئاگایی لێییان بێ وە ناو نوسیان بکا لەلای خۆیی ، ئینجا دواتر هەر کەسێکی دەست بەخێر هات بلێ ئەوە مالی فلان یارمەتیان بدا مەجلیسەکانمان ئاوا بێ .

نەك هەر دێنە ژوورەوە حاشا لەرووتان نازانن نوێژیش چیە هەر دەلێن دووجار ئەچەمینەوە و ئەرۆینە دەرەوە !! تەواو وەکو ئەوە وابێ هیچ شتێك نیە لەم دونیایە ئاخر هەر بۆ ئەوە نەکراوە مزگەوت بۆ ئەوە نەکراوە بەتەنها .

یەکەم رۆحی نوێژەکەت فەوتاند کە نوێژ بەم شێوەیە نیە کەتۆ لێ تێگەیشتوی ، من زۆر بەی نوێژکەران ئەبینم هەتاوەکو رکوع و سجودیان تەواو نیە ! ئێوە بەس لەسونەتەکاندا سەیر بکەن خشوع و متمئنینە

له ركوع و سوجودياندا نيه بەماناى نوێژەكەيان بەتاله . نوێژەكەش نازانن كەواته كەهاتۆته ناو مزگەوتەوە ، ئينجا بۆ نوێژه بۆ صەدەقاته بۆ خێرو خێراته بۆسەردانى يەكيترييه بۆ سەردانى نەخۆشانه ! بائاگامان لەيەكترى بێت .

با مەجليسەكەت پێك بێت له ئەمركردن به خێر و خێرات بەكارى چاكه ، ئەزانى كاكه مالى فلان كەس منالەكەيان كارى وا و وا ئەكا هەر گەرەكەكەى تێكداوه وەره با هەمووماڻ بەيەكەوه بچين سەردانێكيان بكەين و منداڵەكەشيان ئامۆژگارى بكەين ، يان بلێ ئەزانى فلان فيتنه هەيه لەگەرەكەكەماندا بابچين بيكوژێنەوه و نەيهلێنن ! كەس بەكەس نيه و دەرگاى خۆيى دائەخات و ئەچێته ژوورەوه وماڵەكەى خۆيى يانى وەكو ئەوروپامان لێهاتووه لەتەنيشتەوه بمرێى و بۆگەن كا دوو هەفتەش ئاگاى لێ نييه !وا بۆ ئەوه ئەرۆين ئێمه كوا جاران وابووين !

الله تعالى دەفەرمووێى : (لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ)[٣٠٥] نەجوا بەماناى قسەى سرى و دانيشتەكانيان دێى لەمەجليسەكانياندا الله تعالى دەفەرمووێى هيچ نەفع و خێرێكى تێدا نيه ئەو خەلكه إلا مەگەر (مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ)ئەوەى ئەمر بكا به صەدەقه و بەخێرات (أَوْ مَعْرُوفٍ)ئەمر بكا بەچاكەيەك (أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ)يان دووكەس تێك چوون ئاشتيان بكەيتەوه . دوو دراوسێمان تێك چوون قسەيان نيه بەيەكەوه كەس ئاگايى لێ نيه و كەس حەقى نيه بەسەريەوه ئەلێ باشەريان لەمن دوور بێ ! ئێ وەره كاكه دوايه شەركەى ئەويش تۆش دەگرێتەوه هەرنا لەبەر خاترى الله تعالى با پێكيان بهێنينەوه با ئەم رۆحەمان تێدا بێ .

هەتاوەكو له ئيصلاحكردن لەنێوان خەلكيدا ، پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێى : تەنانەت درۆش حەلال كراوه ، يانى بلى كاكه فلان كەس تۆيى زۆر خۆش دەوێى بەويش بلێ ئەزانى لەمەجليسدا چەند رێزى گرتووى باسى تۆى بەباشه كردوه دليان نەرم دەبێ بەيەك وه بۆيەك ئەچێتەوه ، بەلأم ئەمرۆ بەپێچەوانەوه زياتر ترش وخوێى پێوەدەكەن ئەلێن ئەزانى چەند رقى لێته هەر حەزناكا بت بينى ئەمرۆ واى لێهاتووه لەجياتى قسەى خێر كه قسەى خێريش ناكەى بێ دەنگ به .

(وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا)[٣٠٦] هەركەسێك لەپێناوى الله دا ئەمه دەكا الله تعالى ئەجرێكى گەوره و عەزيمى ئەداتێ ، گەورەترين ئەجرى ئەدەمى الله تعالى وا دەفەرمووێى .

[٣٠٥] :سورة النساء اية : ١١٤
[٣٠٦] : سورة النساء اية : ١١٤

ئینجا ئەمە خۆشەویستی دروست دەکا ئەمە هۆکارە بۆ راکێشانی خۆشەویستی الله تعالی ، چەند خۆشە ئاوا هەموومان ئاگامان لەیەکیتری بێ .

٢–(أن تواصی بالحق والصبر)با ئامۆژگاری یەکیتری بکەین بەو ئیسلامە کە حەقەکەیە سەبریشی لەسەر بگرین ، بزانم کەس بیر لەوە دەکاتەوە !

دینمان چیە ؟ بێ دینین یان دینیمان هەیە ؟! دینی یەهودیمان هەیە وە نەصرانیمان هەیە و بوذیمان هەیە دار پەرستیمان هەیە چ دینێکمان هەیە ئێمە ؟دینی الله پەرستیمان هەیە دینەکەمان ئیسلامە تەسلیم بوونە بە الله تعالی . کەواتە با بیزانین پاشان لەسەر ئەم دینە زۆرمان پێ دەکرێ و ئەزیەتمان ئەدەن ئەبێ بەیەکتری بلێن ئارام بگرە قەینا رۆژی قیامەت دێت .

الله تعالی دەفەرمووێ : (وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣))[٣٠٧] چوار خال لەحەیاتی ئینساندا نەبێ ئەو ئینسانە هەموو حەیاتی لەخەسارەت مەندیدایە !

لێرەدا با ئاماژە بەخالێکی زۆر گرینگ بدەین ئەویش ئەوەیە هەرکەسێك هەلدەستێ دەفەرمووێ الله تعالی رێزی لەئینسان ناوە ئەوەتا الله تعالی دەفەرمووێ (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ)[٣٠٨] برۆ شەیطان پەرستت خۆش بوێ گاورت خۆشبوێ و جولەکەت خۆش بوێ هەرچی فاجر و فاسق هەیە خۆشت بوێ چونکە ئینسانە ! خوای تبارك وتعالی واناڵێ ئەم ئایەتە مانای ئەوە نیە ئەم ئایەتە کاتێك الله تعالی دەفەرمووێ : ئێمە رێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە بەلاَم کام نەوەی ئادەمە ؟!

رێزی لە ئەبو جەهل گرت ؟!رێزی لە فیرعەون گرت ؟!رێزی لەقارون گرت ؟! رێزی لە شەیطان گرت ؟!نەوالله کە شەیطان لەحدودی دەرەوەی نەوەی ئادەمەیشە کە جنۆکەیە !

هەرکەسێك بێ ئەگەر بێتوو رێزی خۆیی نەگرێت و بەقسەی الله تعالی نەکا لەلای الله تعالی رێزی نیە و بێ قیمەتە ، الله تعالی دەفەرمووێ : (قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا)[٣٠٩] الله تعالی دەفەرمووێ : ئەی ئینسانەکان هیچ قەدر و قیمەتان نیە هیچێکتان رێزتان نیە ئەگەر عیبادەت نەکەن بۆ الله تعالی ، قەدر و قیمەتت نیە و بێ قیمەتی لەلای من هیچ رێزت نیە ،

ئەها لەئایەتی پێشووتردا فەرموویی : (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ)[٣١٠] بەس لێرە جیایی دەکاتەوە پێت دەلێ کێ یە ئەوەی رێزی لێ گرتووە .

[٣٠٧] :سورة العصر
[٣٠٨] سورة الإسراء اية : ٧٠
[٣٠٩] :سورة الفرقان اية : ٧٧
[٣١٠] سورة الإسراء اية : ٧٠

ئەمرۆ دەلێ نا هەرقسەیەك دەكەی دەلێ وانیە ، یانی كوفر بكا و جوێن بە الله بدا ئەلی كاكە ئینسانە ئینسان براتە ئەلێ برای ئینسانیتە !! رێزی لێ بگرە خوا وتویەتی (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ) !! ئاخر الله تعالی واناڵێت جل وعلا !
ئەها وتی چی (إن الانسان لفی إكرام )؟ یان وتی (إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ)خەسارەت مەندە كەواتە بەچی لەم خەسارەت مەندییە دێتە دەرەوە بەچوار خاڵ :
١–ئیمان .
٢–عەمەلی صالح.
٣ئامۆژگاری كردنی یەكیتری لەسەر ئەم دینە .
٤–داوای صەبر گرتن لەسەر یەكیتری لەسەر ئەم دینە.
باشە صەبر لەسەر چی داوا دەكرێی دوو ژمنێك هەیە نایەلێت تۆ بیبەیت بەرێوە تۆ ئەلێ صەبر بگرە كەواتە دووژمنایەتی ئەو دووژمنە ئەكەیت .
پاشان الله تعالی دەفەرموێی (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ (١) وَطُورِ سِينِينَ (٢) وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ (٣) لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤))[٣١١] هەتا ئێرە باش ئەی دوایی ؟! (ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ)بۆناخی جەهەنەم برۆ ئەی ئینسان ! ئەی كێ یان دێتە دەرەووە لەمانە (إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ) والله ئیماندار بەحیاتی حەیاتت بەهەشت و رەحمەتی الله تعالی نابینی لەقیامەتدا" .
ئیماندار ئەیبنی ئینجا (وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ)ئەبێ كاریشی پێ بكەی (فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ)كەواتە ئاگاداربین لەئایەت و حەدیسەكان نەیاندەین بەیەكدا بێن كافرو  مونافق و بەدفەر و خراپ كار هەمووی بلێن ئەوە الله  تعالی رێزی لێگرتوون چونكە لەنەوەی ئادەمن ! نا وانیە ! ئەی خۆشەویستی لەپێناوی الله و رق لێبوونەوە لەپێناوی الله چیە ؟!
گەورەترین پلەی ئیمان ئەوەیە لەبەر خاتری الله تعالی یەكێكت خۆش بوێی وە لەبەرخاتری الله تعالی رقت لەیەكێك بێ ئەی رقمان لەكێ بێ ؟! ئەمرۆ پێچەوانە كراوەتەوە رقت لە ئیماندار بێ وە كافرت خۆش بوێی !! ئەمرۆ وای لێهاتووە وایان لێكردوە !
كەواتە ئاگاداربین با مەجلیسەكانمان بەوە بێ كەوا ئامۆژگاری یەكیتری بكەین لەسەر  ئەم ئیسلامە ، ئیسلام زۆر بەی زۆری خەلكی نایزانێ ئەوە لایەنی عقیدەكەیەتی وەرە باسی عقیدەی ئیسلامم بۆ باس بكە ئیمان هێنان بەمەلائیكە و بەكیتاب و هەتاوەكو دووایی پاشان وەرە فروعی ئەم ئیمانەم بۆ باس بكە وەرە عیباداتم بۆ باس بكە .

[٣١١] :سورة التين

زەكاتی فیطر هەموو سالێك دووبارە دەبێتەوە و دێتەوە واللە كەسی وا هەبووە وتویەتی نازانم چیە ! دەی بۆم باس بكەن دەكرێی ! تخوا ئەمە راستە ! دوای ئەوە هەر ماناكەی زۆربەی موسلمانان هەرنازانن یانی چی زەكاتی فیطر یانی ئەو بەشە خێرەی كە لەرۆژی جەژن دابەش دەكرێی پێش جەژن و لەرەمەزاندا خەلك دابەشی دەكا ئەوە وایە !؟ هەموو زانایان لەسەر ئەوەن ئێستا بیدەیت ئەبێ دووبارەی بكەیتەوە وەكو ئەوە وایە بلێ هەلسین با نوێژی مەغریب بكەین هێشتان كاتیشی نەهاتووە ئەبێ بیكەین لەوكاتەدا كە نەبوە ؟! ئەی ئەگەر كردمان كە بانگی دا ئەبێ دووبارەی بكەیتەوە لەبەر ئەوەی دروست نیە ، دوای ئەوە دەیەوێی بەم زەكاتە كەمە زەكاتێكی فیطر زەكاتێكی كەمە ئاخر ئەتەوێت بچیت تفضول بەسەر خەلكدا بكەی !بەپارە چەند دەكا !! هەر بەپارە نیمان باش بزانن ئەصلەن زەكاتی فیطر بریتیە لە خواردن (صاعاً من طعام)[312] هەر كەسێك ساعێك ساعێك چوار مشتە نیزیكەی دەكاتە دوو كیلۆ و نیو خواردن بۆ هەر كەسێك لەئەندامانی خێزانەكەت كۆدەكەیتەوە لەخواردن لەوەی دەیخۆیت ئەیدەیت بەمالە فەقیرێك لە رۆژی جەژندا پێش نوێژی جەژن نێوانی نوێژی بەیانی و نوێژی جەژن پێشت ناكرێی لەم كاتەدا ئەتوانی لەمزگەوتێك كۆیبكەیتەوە ئەوانەی مزگەوت هەلسن بەمە رۆژێك دوو رۆژ پێش ئەمە پاشان كورە گەنجانی ئەم مزگەوتە ئاگاداربكەنەوە مالە فەقیرەكان دەست نیشان بكەن یەكی دوو فەردە سێ فەردە برنجیان بۆ ببەن چونكە زۆر كۆدەبێتەوە .

سێ هەزار نیە ! تۆ برنجێك دەخۆی بە ١٠ بۆ ١٥ هەزار ئەچی ٣ هەزارئەدەیت !؟ كابرای فەقیریش برنجی بایەع بخۆ بچین ئەوەندی بۆ دابنێن !؟ بلێم ئەوەندە دەر كا !بەپارە تەقیم ناكرێی بەلكو هەر كەس حالی خۆیی ئەوە زەكاتی فیطرە مەبەستم لەوە یانی هەتاوەكو ئیسلامەكەی خۆمان ناناسین نوێژەكەی خۆمان نازانین .

سونەتەكان وموكەدەكان وراتبەكان و نوێژەكان و زەكاتەكان و حەجەكان و عومەرەكان هەر هەمووی پاشان وەرە بۆ مەسائیلی معامەلات كرین و فرۆشتن و ریبا ، وەرە بۆ مەسەلەی زەواج و نیكاح تەلاق ، یانی نایەوێی بزانی ئەوكورە كێ یە و كێ نیە عقیدەكەی چیە ! ئەلێ بەخوا پارەی هەیە الحمدلله ئیش كەرە ! بیستوتانە بلی الحمدلله والله ئینسانێكی زۆر رێك و پێك و بەئیمان و بەتەقوایە !؟ هەر دەلێن پارەی باشی هەیە و ئیش كەرە كچكەكەم زەرەر ناكا ! ئەی دینەكەی ؟! ئەلێ كیشە نیە ! ئێ ئەو عقدە بەتالە ئەگەر ئەو كەسە ئیماندار نەبێ موحید و یەكخوا پەرست نەبێ حیساب بكە تۆ كچەكەت داوە بەكەسێكی كافر ئەبێ وریابیت و ئاگادار بیت !

[312] : رواه البخاري في (الزكاة) باب صدقة الفطر برقم ١٥٠٦، ومسلم في (الزكاة ٩ باب زكاة الفطر على المسلمين برقم ٩٨٥.

تەلاقەکەی تەلاق نازانی هەتاوەکو تەلاق دەخوا دوای دێت دەڵێ مامۆستا والله وام وتو و وام کرد و وا هەلەم کرد ئێ بۆنایەت لەپێشدا فێری تەلاق بیت بزانی تەلاق چیە بزانی بەشەکانی نیکاح و تەلاق و خولع هەر یەك لەوبابەتانەی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد چیە وەرە سەیری بکە عەلاقاتی نێوان ژن و مێرد چ حەلالە وچ حەلال نیە !

یانی ئەمە دینە ئەبێ تۆ بیزانیت لەسەرتە بیزانی ئەی الله تعالی بۆچی ئەم ریسالەی ناردۆتە خوارەوە بۆ ئەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوە ئەوە(وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر)ئەگەر ئەمەت کرد لەلای الله تعالی خۆشەویست دەبی چەند مەجلیسمان هەیە وابێ !؟ چەندتان کتێبێکی فقهتان تەواو کرد ! کتێبێکی تەفسیرتان تەواو کرد چەندتان کتێبێکی عقیدەیتان تەواو کرد ! خۆ هەر بەوە نابێ نوێژێکی میکانیکی بکەین و تەواو من ناوم ناوە نوێژی میکانیکی چونکە رۆحی تێدا نیە ، زۆربەشی وایە ئەڵێ بۆ فەقەراتی پشت باشە نوێژ کابرای مامۆستای ئاینی دائەنیشی باسی نوێژ دەکا لەجیاتی باسی تەوحید و ئیمانەکەم بۆ بکات ئەڵێ ئەوروپا وای وت دکتۆر فلان وتی ئەم نوێژە ئاوا باشە وا تەندروستت دەکا ! رۆژوو بۆ زەعیف بونەوە باشە ! کاکە باش بزانە هەمووی عیبادەتە لەپێش هەموو شتێکەوە عیبادەتی الله تعالی یە ، بەومانایەی هەتاوەکو عیبادەتەکانیش ناهێنەوە سەر ئەوەی بلێن خۆمان بۆ خوا زەلیل کرد بۆیە ئەیکەم بۆنوێژ ئەکەی بۆ سوجدە ئەبەیت ؟! بلێ خۆم بۆ خوا زەلیل کرد ، بۆ بەرۆژوو ئەبی ؟ خۆم بۆخوا زەلیل کرد . ئاو حەلالە لەکاتی رەمەزاندا نایخۆم ئاوەکە حەرام دەبێ خۆ ئارەقیش نیە بۆ چی نایخۆی ؟ لەبەر ئەوەی الله تعالی وتی مەیخۆ !نایخۆم تەواو ، شتە حەلالەکانت لێ حەرام کراوە بۆ ئەوەی فێربی حەرام ئەولاتر لەلات حەرام بێ یارەبی خوایە وامان لێ بکەی .

سری رۆژوو ئەوەیە (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)[٣١٣] ئاو حەلالە مەیخۆ خواردن حەلالە مەیخۆ خۆت بگرە ئەوکاتە لە حەرامەکانیش خۆت ئەپارێزیی .

٣-(أن تعاونوا علي الذكر والإستغفار قال الله تعالي حكاية عن موسا عليه السلام)ئەڵێ : ئەبێ ئینسان یارمەتی یەکیتری بدا لەسەر زیکر کردن بەبەردەوام دانیشن و کۆر ومەجلیسی زیکر دروست بکەن و بکەن ، مەبەستمان لە کۆر و مەجلیسی صۆفیەکان نیە ئەوەی کەوا دەفێك لێ دەدەن بەلای راست و چەپدا سەر با ئەدەن ئەوانە نا .

گەورەترین زیکر نوێژە هەروەکو الله تعالی دەفەرموی : (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي)[٣١٤] نوێژ زیکرەوە لەهەموو زیکرەکان گەورەترە نوێژ !! کێتان بە پێوە خۆیی با ئەدا ! لەکاتی نوێژدا ؟! کێتان

[٣١٣]:سورة البقرة اية : ١٨٣

لەتەحیاتدا خۆیی بائەدا بەپێچەوانەوە الله تعالى دەفەرمووی : (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (٢))[٣١٥] خاشع : ئەو کەسەیە دلی ئەترسی وچوار پەلەی وەستاوە و ناجولێ لەجێگای خۆیی .

یانی من سەیرم لێ دێی پیاوە پیرەکان بەتایبەتی هەندێك شت قورس قورس ئەکەنەوە کەچی هەندێك شت بەرەلاً ئەکەن ئەلێن ئەگەر سێ حەرەکە بەکەیت لەناو نوێژدا نوێژەکەت بەتال دەبێتەوە !هەتاوەکو ئەم رادەیە ! کەچی شتی واشمان نیە لەحەدیسدا بلێ سێ حەرەکیی نوێژ بەتال ئەکاتەوە  بەس ئەوان ئەوەندە بەتوندی گرتویانە ئەلێن ئەگەر لاشەشت خوار نابی بیخورینی لەناو نوێژدا ئەبێ بەقیتی رابوەستی ! باشە تۆ لەم زیکرەدا وا راوەستی ئەی بۆ لەدوایدا ئەکەویتە رەقص کردن و هەلپەرکێ و داپەرکێی وەکو دەروێشەکان !.

بزانین زیکر چیە علقەی لێخۆشبوون و داوای ئیستغفار باسی دەکەین :

الله تعالى بۆمان باس دەکا و دەفەرموێ : پێغەمبەر موسا ئەم دوعایانە دەکا دواتر الله تعالى دوعاکانی لێ قبول دەکا دەفەرمووی (قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَىٰ)[٣١٦]دوعاکانت هەموی لێ قبول کرا بزانین کام دوعایانەی کردوە موسا (علیه السلام ) وتی :

(رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي)خوایە سینگم فراوان بکەی بۆ وەرگرتنی دینەکەی تۆ خوایە تێم بگەیەنیت و عیلمم بدەیتی (وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي)کارم بۆ ئاسان بکەی (وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي)فەسیحم بکەی بتوانم خەلك تێ بگەیەنم (يَفْقَهُوا قَوْلِي)هەتاوەکو تێ بگەن لە قسەکانم (وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي)یارمەتی دەرێکم لەکەس و کارەکەی خۆم بۆ دروست بکەی خوایە (هَارُونَ أَخِي)ئەویش هارونی برام بێ هارون بکەیت بە یارمەتی دەرم لەو پێغەمبەرایەتیە بیکە بەپێغەمبەر (اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي)بەقوەتم بکە بەهۆی ئەمەوە ، ئەگەر دووکەس یان سێ کەس یان چوارکەس کۆببنەوە لەسەر ئەمر بە معروف و نەهی لە منکر هێزیان بەقوەت ئەبێ ، تۆ سەرنجت نەداوە ئەگەر بەتەنها خۆت بی لەشوێنکدا خراپەیەك بکرێی زاد ناکەی قسە بکەی یان ناتوانی بەس ئەگەر دوو کەس یان سێ کەس یان چوار کەس بی بەهەمووتان ئەلێن ئەوە هەلەیە یارمەتی یەکیتری ئەدەن (وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي)بیکە بەشەریکی ئەم پێغەمبەرایەتیەی من ، بۆچی؟! هەمووی لەبەرخاتری (كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا)بۆ ئەوەی سبحان الله تۆ زۆر بکەین ئەی خوایە یانی تۆ پاکی لەشەریك و تۆپاکی لەعەیب ئەی خوایە . ئێمە مخلوقین تۆ خالقی تۆ پاکی ئێمە هەموو سبحان

---

[٣١٤]:سورة طه اية : ١٤
[٣١٥]:سورة المؤمنون
[٣١٦]:سورة طه اية : ٣٦

---

الله تۆ دەکەین چونکە هەموو ئاسمانەکان سبحان الله تۆ دەکەن (يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ)[٣١٧] .

(كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا (٣٣) وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا (٣٤))[٣١٨]بۆئەوەی من و هارون زۆر یادی تۆ بکەین ئەی خوایە ، ئەها زیکری الله تعالی چەند گەورەیە .

وەهەروەها الله تعالی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : (وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ)[٣١٩]ئەی محمد صەبر بگرە لەگەل ئەو صەحابە فەقیرانەی کەوا خەریکی زیکر و ئیمانن دابنیشە لەگەلیان بەیانیان و ئێواران لەمەجلیسانیادا دانیشە پێ ئەلێ سەیری دونیامەکە دابنیشە لەگەل ئەواندا خەریکی زیکر و تەقوا الله تعالی بن .

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای الله تعالی لێ بێت)حەدیسێکمان بۆ دەگێڕێتەوە لەمعاویەوە باسی دەکا ئەویش دەلێ ؛ معاوییە ئەلێ : (إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ)پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) جارێك سەیری کرد کۆمەلێك صەحابە کۆبوونەتەوە دانیشتوون چوو بۆلایان فەرمووی : (فَقَالَ : " مَا أَجْلَسَكُمْ ؟) فەرمووی ئەوە بۆ دانیشتوون ئێوە بۆ کۆبونەتەوە ئەوانیش وتیان : (قَالُوا : جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِلإِسْلامِ)والله دانیشتووین یادی الله تعالی دەکەین ئەلێن سوپاس بۆ تۆ خوایە بەس نیە ئێمەت بەموسلمان دانا بەس نیە موسلمان بووین الحمدلله سوپاس بۆتۆ کە هیدایەت داین بۆ ئەم ئیسلامە چونگە ئەگەر ئەوە نەبووینایە مال وێرانی دونیا وقیامەت دەبووین (وَمَنَّ عَلَيْنَا بِكَ)الله تعالی منەتی کرد بەسەرماندا ئەم دینەی پێ بەخشین .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویی : (آللَّهُ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلا ذَلِكَ ؟)وتی تو ئەو خوایە لەبەر خاتری ئەوە دانیشتوون ؟!

(قَالُوا : وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلا ذَلِكَ)ئەوانیش وتیان : ئەری والله لەبەر خاتری الله ئێمە دانیشتووین . و لەبەر خاتری الله یادی الله ئەکەینەوە ئەوشتانە باس دەکەین بەس مەبەستمان الله .

(قَالَ : أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ)وتی من خۆ گومانی خراپم پێ نەبردن بلێم لەوانەیە بۆ شتێکیتر دانیشتبن بەس بۆیە ئەمەم وت (وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ فَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللَّهَ يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلائِكَةَ)[٣٢٠] بۆیە ئەمەم پێوتن بۆ ئەوەی بزانن الله تعالی لەئاسمان فەخرتان پێوەدەکا لەلای مەلائیکەتەکان (يُبَاهِي

[٣١٧] :سورة التغابن اية : ١
[٣١٨] :سورة طه اية : ٢٥-٣٤
[٣١٩] :سورة الكهف اية : ٢٨
[٣٢٠] رواه مسلم

بِكُمُ الْمَلائِكَةَ) یانی مفخره ، بەفەخرەوە باستان دەکا لەلای مەلائیکەتەکان ، ئەها بەندەکانم چۆن یادی من دەکەن لەلای مەلائیکە ئەوها باسی ئێوە دەکا .

دەبا مەجلیسەکانمان بەم شێوەیە بێ الله تعالی ئێمەی خۆش دەوێی ئەوکاتە نەك مەجالیسەکانمان بریتی بێ لەغەیبت و قسە گێرانەوە و وە تەقریر و راپۆرت لەسەر یەکتری نوسین و قسەی خراپ بەیەکتری وتن و وە گومانی خراپ بەیکتری بدرن . دەلێن ئەها فلان کەس ئەمەی لەکوێی بوو وەرە دانیشە باباسی بکەین کورە ئەوە لەکوێی بوو ئەگەردزی نەکردایە !! ئی تۆ عیلاقەی ئەم شتانەت چیە بۆدلی خۆت پر دەکەی لەژەهر و ژار و غەیبەت و رق لێبوونەوەی یەکتری ، کوا بەشی الله لەمەجلیسەکەتدا !؟ کردی خۆی زەرەری کرد ، ئەی بۆ باسی ئەو مالە ناکەی کە بلێ ماشاء الله چەند بەئیمان و بەتەقوان با ئێمەش هەولدەین ئاوا بین ، یان ئەو کە خراپە کە خراپەیەکت لێ بینیوە وەرە کاکە با بەهەمووومان چاکی بکەین .

ئەبو هورەیرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێت) دەگێرتەوە کە پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)فەرموویەتی : (إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ)مەلائیکەی زۆرە الله تعالی کەس نازانی ژمارەیان چەندە هەریەکەی وەزیفەی خۆیی هەیە بەلاّم هیچی لەتاعەتی الله تعالی دەرناچێ هیچیان نفسێکی نیە خوارن و خواردنەوە و ئارزووو ! بەس الله تعالی دایناون بۆ جێ بەجێ کردنی کارەکانی خۆیی ، لەوانە کۆمەلێکی هەیە ئیشیان ئەوەیە کەوا لەرێگە و بانەکاندا ئەسورێنەوە ، تەبعەن ئاگاداربن مەلائیکە بەبێ ئیزنی الله تعالی کەسیان نایەنە خوارەوە (وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ)[٣٢١] جارێك پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) بەجوبریلی فەرموو : وتی حەز دەکەم لەلامان بیت چونکە جوبریل ئەهات و ئەرۆیشتەوە ئیشی جوبریل سەر ئەرز نەبوو ئەی وت حەز دەکەم لەلەگەلمان بیت : ئەیوت ئێمە ناوێرین الله تعالی ئەمرمان پێ نەکا ناتوانین بێنە سەر ئەرز (وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ)ئیشی ئەوان هەمووی جێ بەجێ کردنی ئەمرە و ئەمریان پێ دەکرێی وە عصیانیش نیە لەژیانیدا .

بۆیە لەشەوی الیلة القدر ئەگەر سەیری ئایەتەکە بکەن دەفەرمووێی (تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ)[٣٢٢] لەوشەودا دێنە خوارەوە لەشەوەکانیتر نایەن ئەو هەموو مەلائیکە لەشەوی قەدر دێنە خوارەوە کەدێنە خوارەوە خەریکی سەلام کردنن لەخەلکی ئێوەش لەژیانتاندا ئەم شەوە بەفیرۆ مەدەن .

[٣٢١] :سورة مريم اية : ٦٤
[٣٢٢] :سورة القدر اية : ٤

جا ئەلیٚ (إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ)ئەم مەلائیکەتانە ئەچن بەشوێن ئەهلی زیکردا دەگەڕێن ئەوانەی یادی الله تعالی دەکەن لەبەر خاتری الله تعالی خەریکی قورئان و زیکر و حەدیس و سبحان الله و أستغفرالله و علیم و بیرهێنانەوە و تواص بەحق و بەصەبر (فَإِذَا وَجَدُوا قَوْمًا)ئەگەر هەر کۆمەلەك ببیننەوە (يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَنَادَوْا)کەبزانن یادی الله تعالی دەکەن نەوەکو یادی دونیا بەلکو یادی الله تعالی بکەن لەبەر خاتری الله تعالی بانگ لەیەکتری دەکەن لەوانەشی کەهاتوون و ئەگەڕێن (هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ)وەرن کۆببنەوە ئەمەیە شوێنەکەمان شوێنی خۆمانمان دۆزیەوە (فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا)هەموویان کۆدەبنەوە و چوار دەوریان ئەدەن بەبالەکانیان هەتا ئاسمان ، ئێمە نایبنین بەس ئەمە قەولی پێغەمبەرە ئیمانمان پیٚ هەیە (صلی الله علیه وسلم)وە ئێمەش وەکو ئیماندار یەك لە ئەصلی ئیمانەکەمان ئیمانە بەمەلائیکە تۆ ئیمانت بە مەلائیکەیە  بەلام نایبنی وە ئەشزانی لەگەلت دایە بەلام بەزۆری لێی بیٚ ئاگایین !

تخوا یەك پرسیاردەکەم ئێستا ئەگەر بەیەقین و بە ١٠٠٪ ئەو ئیمانەمان هەبوایە هەلەمان ئەکرد !؟ نمونەیەك کەسێك لەگەلت دێت بۆ هەموو شوێنێك کامیرەیەکی پیٚ یە وێنەت ئەگرێی بچیتە هەر شوێنێك وێنەت ئەگرێی یەك هەلە ئەدۆزێنی ئەلی کاکە ئەوە بلاوی دەکاتەوە بەو مەرجەی بلاوی بکاتەوە و بیدا بەچاوی خەلکی لەترسی ئەوە نایکەی ، بەلاّم ئەگەر بەنهێنی بو ئالێرەدا حیسابی خۆمان بکەین چەند مقسیرو کەم و کورین لەبەردەمی الله تعالی دا ، پێت بلێن ئاگاداربە تۆ ئەم سال تۆ لەژێر چاودێریدایت هەموو ژیان و خۆی دەخاتە پەلە پەل بۆ ئەوەی دەرنەکرێی لە کارەکەی بەمەرجێکیش چاودێریەکە بەو شێوەیە نیە ، ئەی ئەگەر چاودێرییەکەی الله تعالی لەهەموو کاتێکدا لەگەلت دا بوو جا مەبەستم لە ئیمانەکەمانە وە لەوە سەرووتر مەلائیکە خۆ بەندەی الله ئەی الله تعالی خۆی بەبیٚ مەلائیکە نازانی ئێمە چی دەکەین ! والله مەگەر هەر بگرین و بکروزێنەوە بلێن والله خوایە بەس لەتۆ لێخۆشبوون و مغفیرەت لەلای ئیمەش گوناه داوای لێخۆشبوون دەکەین  هەمووومان دەبیٚ وابلێن نەك لووتمان بەرز بکەینەوە و متکبیر بین و بلێن من باشم من وام ، والله الله تعالی نامەی کردەوەت بخوێنێتەوە بیدا بەخەلکی حەیا و ئابروت ئەچیٚ هی من و هی تۆ و هی هەمووومان ،

یەك لەشاعیرەکان دەلیٚ :

("والله لو علموا قبـيح سـريرتي *** لأبـــى السـلام علي من يلقـاني)[٣٢٣]

[٣٢٣] ": عبد الله بن محمد القحطاني، نونية القحطاني

والله هەركەسێك بیزانیایە سیرەکەم چی تێدایە والله کەس سەلامی لیٚ نەئەکردم لەبەر بۆ گەنی کارەکانم ، هەریەك لەخۆی با بیر بکاتەوە ئیشە خراپەکانی خۆیی بهێنێتە بەر چاوی تۆ مار کراوە وە الله تعالی إلا لیٚ دەپرسێتەوە ئینجا سەر شۆر بکە لەئاستی خوای تعالی سەر بەرز مەکەوە .

جا ئەلیٚ ئەم مەلائیکانە هەتا ئاسمان ئەرۆن ئەگەر چی ئێمە نایانبینین بەلاّم الله تعالی دەیان بینی ،الله تعالی پێیان دەلیٚ : (قَالَ : فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ) الله تعالی پرسیاریان لیٚ دەکا بەس الله تعالی لەوان عالم ترە و ئەزانی بەندەکانی کۆبونەتەوە ئەو هەموویان ئەبینی بەس پرسیار ئەکا ئەمە بۆ ئێمەیە تاوەکو تیٚ بگەین ،( مَا يَقُولُ عِبَادِي ؟)ئادەی مەلائیکەتەکان ئەوانە چی دەلێن ئەو بەندانەی من ئێوە لێیان کۆبونەوە لەسەریان تاوەکو ئاسمان ؟

(قَالُوا : يَقُولُونَ يُسَبِّحُونَكَ ، وَيُكَبِّرُونَكَ ، وَيَحْمَدُونَكَ ، وَيُمَجِّدُونَكَ)خوایە ئەوە سبحان الله تۆ ئەکەن ئەلێن تۆ پاکی لەشەریك تۆ پاکی لەعەیب خوایە ئەوە ئەلێن بەس تۆ گەورەی تۆ گەورەی ئێمەی کەس گەورەمان نیە لەتۆ زیاتر بەس بەقسەی تۆ ئەکەین ، خوایە ئەمە حەمدی تۆ ئەکەن لەسەر هەموو نیعمەتەکان نیعمەتی ئیمان و هەموو مادەکان ، خوایە ئەوە ئەلێن مانەوە هەربۆتۆیە (وَيُمَجِّدُونَكَ)یانی (البقا لك)هەموومان ئەمرین بەس تۆ ئەمێنیتەوە ئەی خوایە ئەوە ئەوشتانە ئەلێن .

(قَالَ : فَيَقُولُ : هَلْ رَأَوْنِي ؟)الله تعالی بەمەلائیکەتەکان دەفەرمووێی : باشە ئەوان منیان بینیوە ؟! ئەو قسانە لەگەل من دەکەن منیان بینیوە !؟ (قَالَ : فَيَقُولُونَ : لَا وَاللَّهِ مَا رَأَوْكَ)ناوالله ئەی خوای پەروەردگار تۆیان نەبینیوە بەس پێیان گەیشتووە بەرێگای قورئان وە بەرێگەی ئەو پێغەمبەرەوە کەوا تۆ هەیت و ئەوە قورئانی تۆیە و ئەوە بەهەشت هەیە و جەهەنەم هەیە ئەوان بەمە دلیان بەمە بەستراوە ئەیانەوی بگەن بەتۆ ، ئەگینا ئێمە کوا خوامان بینیوە !؟ ئاخر هەر ئەوەیە شوبهەی شیوعی و ملحید و خوانەناسەکان تا من نەبینم بروام پیٚ نیە برۆ بۆخۆت بروات پیٚ نەبیٚ ، مادەم ئێمە ئەلێن بروامان پێی هەیە با خۆمان هەلنەخەلەتێنین یان وەکو ئەوان بین بلێن بروامان پیٚ نیە هەمووشتێك بەرەلا بکەین یانیش بلێن تەواو هەیە و یەقینمان هەیە چونکە هەرکەسێك شك و گومانی هەبیٚ کافرە لای ئێمەی موسلمان ئاوایە مادەم یەقینت پێی هەیە ئەلیٚ منیان بینی ئەلیٚ نا (قَالَ : فَيَقُولُ : وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي ؟)باشە ئەگەر منیان نەبینیوە وا ئەکەن ئەی ئەگەر منیان بینیبایە ؟ (قَالَ : يَقُولُونَ : لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً)ئەلێن : ئەگەر تۆیان بینیبایە ئەوە لەوە زیاتر عیبادەتی تۆیان ئەکرد (وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيدًا)لەوە

زياتر مەتح و سەنای تۆيان ئەكرد ئەيان وت هەر خوا  ئەمێنێتەوە (وَتَحْمِيدًا)سوپاسی تۆيان زياتر ئەكرد (وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحًا)وە سبحان الله يان زياتر ئەكرد .

(قَالَ : يَقُولُ : فَمَا يَسْأَلُونِي ؟)دەباشە پێم بلێن ئێستا داوای چی دەكەن وا كۆبونەتەوە ئەم قسانە ئەكەن و مەبەستيان چيە و داوای چی دەكەن ؟!

(قَالَ : يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ)داوای بەهەشت دەكەن.ئەلێن بەهەشت ، هەموومان ئێستا داوای بەهەشت ناكەين ئەلێن ئەی خوايە بەهەشتەكەتمان بدەرێی لەدوای بنينی تۆ بينينی ئينجا بەهەشتمان بدەيتی ،

(قَالَ : يَقُولُ : وَهَلْ رَأَوْهَا ؟)الله تعالى لێيان ئەپرسی : جا بەهەشتيان بينيوە ؟! (قَالَ : يَقُولُونَ : لَا ،، وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا)دەفەرموون : نەخێر .والله بەهەشتەكەی تۆيان نەبينيوە ،( ، قَالَ : يَقُولُ : فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا ؟)الله تعالى پێيان دەلێ : ئەی ئەگەر بەهەشتەكەی منيان بينيبا ؟!

(قَالَ : يَقُولُونَ : لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصًا)لەوەزياتر هەوليان ئەدا (وَأَشَدَّ لَهَا طَلَبًا ، وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً)زياتر خۆيان ماندوو ئەكرد زياتر عيبادەتيان ئەكرد .

(قَالَ : فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ ؟)ئەی لەچی پەنا ئەگرن ؟( قَالَ : يَقُولُونَ : مِنَ النَّارِ)دەلێن : خوايە لەئاگری جەهەنەم بمان پارێزی ،( قَالَ : يَقُولُ : وَهَلْ رَأَوْهَا ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : لَا ، وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا، قَالَ : يَقُولُ : فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَارًا ، وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً)نەوالله نەيان بينيوە بەس ئەگەر بيان بينيبايە لەوەزياتر خۆيان ماندوو دەكرد و دەستيان نەئەدا لەهيچ كارێكی حەرام و خراپ دەميان لەهيچ كارێكی خراپ و حەرام نەئەدايە لەبەر ئەوەی خوا بيان پارێزی لەو ئاگری جەهەنەمە .

(قَالَ : فَيَقُولُ)ئينجا بزانە خوای گەورە چی دەفەرمووی ئەمە نەتيجەيەكەيەتی خوای پەروەردگار دەفەرمووی : (فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ)ئێوە بەشايەد بن ئەوە من لەئەوان خۆش بووم (قَالَ : يَقُولُ : مَلَكٌ مِنَ الْمَلَائِكَةِ : فِيهِمْ فُلَانٌ)يەك لەمەلائيكەتەكان ئەلێ خوايە فلان كەسی تێدايە هاتووە (لَيْسَ مِنْهُمْ)لەوان نيە بۆ ئيشێك هاتووە بەس ئيمانداره بەلاّم قەدەرن رێی كەوتۆتە ئەوێی ئەصلی دانيشتنەكە ئەو نيە و لەگەلدا نيە بەس بەسەفەری رێی كەوتۆتە ئەوێی (إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ ، قَالَ : هُمُ الْجُلَسَاءُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ)[324] ئەوانە كەی كەسێك بێتە ناويان تووشی شەقاوەت و ناخۆشی دەبن هەمووييان باشن لەويش خۆش بوو الله تعالى .

كەواتە ئێمە كەسيتريش پێمان زەرە ناكا بێت دابنيشی لەگەلمان ئادەی وەرە فلان كەس كاری پێتە بەمەرجێك ئيماندار بێ ئەو كەسە .

[324] : الكتب » صحيح البخاري» كِتَاب الدَّعَوَاتِ» بَاب فَضْلِ ذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ،،، رقم الحديث : ٥٩٥٦

ئەغریەی کوری مسلیم دەفەرمووێی : (أَشْهَدُ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ)شایەتی ئەدەم کە ابو هورەیرەو ابو سەعیدی خودری هەردووکیان (رەزا و رەحمەتی الله تعالی یان لیّ بیّ)شایەتیان دا کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ)[٣٢٥] پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : هیچ کەسانێك دانانیشن یادی خوا بکەن ، ئاگادارین یادی خوا وەکو وتمان بەشکل نیە بەس بەزمان نیە هعاوار و حا و حوی دەروێشان نیە بەلکو بریتیە لەدلە و لەزمانەوە بەقالب و بەفعلەوە بەهەموو شتێکت لەگەل الله تعالی دا بیت هەموو شتێکت لەژیانی خۆت دەر کردبێت بەس الله تعالی ت دانابێت ، غایە و ئومنیە و هیوا و ئاواتت تەنها الله تعالی بیّ ئەوە زیکری الله تعالی یە ، نەك تۆ دلت پربیّ لەدونیا لەشوێنکەوتنی کەسانیتر و رقت لەخوا و دین وئیسلام و هەموو شتێك بیّ بلیّ دائەنیشم و لا اله الا الله یەکیش با بکەم ئەوە ناخوا .

ئەلیّ : ئەمجۆرە کەسانە (إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ) دانانیشن یادی الله بکەن إلا مەلائیکە تەوافیان لەدەوردا ئەدەن کۆدەبنەوە لەدەووریان (وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ)وە رەحمەت ئەچی بەسەریاندا (وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ)هیمنایەتی الله تعالی دێنێت سەرسەریانەوە (وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ)وە الله تعالی لەلای مەلائیکەتەکانەوە باسیان ئەکا .

سەیری إبن عومەر بکە باسی شتێکمان بۆ دەکا کە ئەمانە ئەهلی زیکر بوون ئەهلی مجلیس بوون ئەهلی مجلیسی رسول الله بوون (صلی الله علیه وسلم)دائەنیشتن ئالێرەدا ئاماژەیەك ئەدەین بە مندالان دەریان مەکەنەدەرەوە لەمزگەوت بەتایبەتی لەتەراویحەکاندا بەلاّم واشیان لیّ مەکەن ئەدەب نەزانن فێری ئەدەبیان بکەن نەك ئێمە نوێژ بکەین ئەوان کاری خراپ بکەن بەم شێوەیە نا لەوکاتەدا وابکەی لێیان بدەی و بیان کەیتە دەرەوە ئەوجا ئەو منداله نایەتەوە بۆ مزگەوت هەردووکی هەلەیە ، نەبوونی تەربیەتی ئێمە بۆ مندالەکە هەلەیە وە دەرکردنی مندالەکەش لەمزگەوت ئەویشیان هەلەیە نەخێر بەلکو دەست بهێنە بەسەریاندا هەرکەسێك مندال ببات با لەتەنیشتەخۆیەوە دایبنیّ ئەگەر مندال لەتەنیشتەیەکتریەوە دامەنێن هیچ کاتێك مەلێن با ریزی مندالان جیا بیّ ئەمە هەلەیە نەخێر بەلکو دوو مندال سیّ مندال بخەنە رێزی خۆتانەوە با فێر بن ئەوکاتە شەرم ئەکەن لێتان بەلاّم ئەگەر ١٠ مندالت کۆکردەوە ئەو شەق ئەدا

[٣٢٥]:صحیح المسلم

لەو ئەو پیێ دەکەنی و هەرا و هۆریا و غەلبە غەلب دروست دەبێ لەناو مزگەوتدا ! ئێمە نازانین ئادابی مندال چۆنە لەمزگەوتیشدا

ئەو إبن عومەرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیێ بێت) دەفەرموێی : (إن كنا لنعد لرسول الله صلى الله عليه وسلم في المجلس يقول : ( رب اغفر لي و تب علي إنك أنت التواب الغفور مائة مرة)[٣٢٦]لەگەل پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەمەجلیسدا دائەنیشتین ١٠٠ جار ئەم پێغەمبەرە وای دەفەرموو(رب اغفر لي و تب علي إنك أنت التواب الغفور)ئێمەش دانیشتبووین لەناو مەجلیسەکەدا ئەم منداڵە چۆن ژماردوویەتی سەیری بکەن ! سەیری پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)ی کردوە بزانی چ دەلێ ، یانی یەك لەئادابی مەجلیس ئەوەیە دابنیشی بەهیمنی و لەسەرخۆ داوای لێخۆشبوون بکەی پێکەوە لەبەر خاتری الله تعالی .

فەرمووی :پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وای فەرمووی : (رب اغفر لي و تب علي إنك أنت التواب الغفور)زمانی ئابەوە بوو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ١٠٠ جارمان ئەژمارد کەوای ئەوت لەیەك مەجلیسدا .

أبو واقيد الثي (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیێ بیێ )( أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دانیشتبوو لەمزگەوت (وَالنَّاسُ مَعَهُ)ئاوا خەلك دانیشتبوون لەدەوریدا و کۆببونەوە(إِذْ أَقْبَلَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَذَهَبَ وَاحِدٌ) سیێ کەس هاتن دووانیان مایەوە وە یەکێکیان رۆیشت (قَالَ فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ)دوانەکە هاتن هەستان بەپێوە (فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا)یەکیان لەناو حەلەقە و بازنەکەدا شوێنێکی دۆزیەوە و چوو دانیشت بۆخۆی (فِيهَا وَأَمَّا الْآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ)ئەویتر لەدوایانەوە دانیشت (وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا)ئەویتر رۆیشت و بەجیهێشت (فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكُمْ عَنْ النَّفَرِ الثَّلَاثَةِ)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە لێبوویەوە لەوتارەکەی وتی ئەم سێیانەتان پیێ بلێم خەبەریان ؟!

(أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ اللَّهُ)یەکیان هات بۆلای الله تعالى الله تعالى گرتیە خۆیی ،( وَأَمَّا الْآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ)ئەویتریشیان شەرمی کرد لەدواوە دانیشت الله تعالى شەرمی لەو کرد تەبعەن شەرم کردن سیفەتێکە لەسیفەتەکانی الله تعالى وەکو ئێمە نیە دەبیێ بلێ بروام هەیە بەم سیفەتە لەحەدیسێکدا وارید بوە ئەفەرمووی خوا شەرم ئەکا لەبەندەکەی ئەگەر دەستی بەرزکردەوە و دوعای کرد بەبەتالی

[326] : مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح للإمام محمد التبريزي ١-١١ ج٥،ص ٢٦١

دەستی بنێرێتە خوارەوە إلا جوابی ئەداتەوە ئەم شەرم کردنە پەیوەستە بە الله تعالی وە نازانین چۆنە نابێ تەئویلی بکەین بلێن ئیرادەی خێرە نا دەبێ بلێن الله تعالی سیفەتی حەیای هەیە بەس نازانین چۆنە وچۆن نیە .

دەلی شەرمی لە الله تعالی کرد الله تعالی ش شەرمی لەو کرد (وَأَمَّا الْآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ)[٣٢٧] ئەویتر کە مەجلیسەکەی بەجێهێشت پشتی کردە خوا الله تعالی ش ئەوی پشت کرد ، پشت تێکردن بەمانای یانی تووشی رەحمەت و بەرەکەت ومەغفیرەتی نەکرد الله تعالی رەحمان پێ بکا .

٤-(والنرتفع في مجالسنا في الغوة والغيبة والجدل)با مەجلیسەکانمان لە لەغو ، لەغویانی چی ؟ الله تعالی دەفەرمووی : (وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ)[٣٢٨] یانی قسەی پرو پوچ بی سود و بێ فائیدە با لەوە دوورکەوێتەوە مەجلیسەکانمان ، وە لەغەیبەت با دوورکەوێتەوە وە لەموناقەشەی هیچ و پوچانە و عقیب دووربکەوێتەوە ، جاری وایە دائەنیشن موناقەشە ئەکەن ئەبێ ئینسان هەبوو بێ پێش ئەم ئینسانانە تۆ چ ئیشێکت بەم شتانە هەیە ئەم موجادەلەیە چیە دەیکەیت یان جاری وا هەیە لەسەر ئایەتێك ئەلێ چۆن خوا وای وتوە ؟! نەئەبوایە وای وتبایە ! استغفر الله نەئەبوایە ئەم شتە وابووایە موجادەلە ئەکەن ! نابێ وابکەین .

الله تعالی فەرموویەتی : (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ)بەراستی ئیماندار تەنها سەرفراز دەبێ و دەیباتەوە بەبەهەشت و بەرەزامەندی الله تعالی ئەویتر هەمووی بۆجەهەنەم بەس ئیماندار قەومەکانیتر هەمووی بۆ جەهەنەم ، ئەبێ بروادار بی بە الله ئیمانداریش ئەوەیە بەس ئیمانی بە قورئان بەئیسلام بە محمد (صلى الله عليه وسلم) هەروەکو (رضيت بالله رباً ، وبالإسلام ديناً ، وبمحمد صلى الله عليه وسلم نبياً)یەهودی و نەصرانی و بوذی هەمووی بۆجەهەنەمە ئەوە عەقیدەی ئێمەیە لەفاتیحەکەدا دەفەرمووێ : (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ)[٣٢٩] خوایە نەمخەیتە سەر رێگەی گاور و جولەکە ، نەوەکو بێ عەقلانی ئەمرۆ ئەلێن والله ئەویش بروای بەخوایە بۆچی کافرە ! بەلێ کافرە ئەوەی بروای بەیەك شت لەدینەکەی من نەبێ کافرە چونکە الله تعالی وا دەفەرمووێ بروات بەهەموو دین هەبێ بەس بەتەنها بلێ رقم لە جوبریلە الله تعالی دەفەرمووی : ئەوەی دووژمنایەتی جوبریل بکا (فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ)[٣٣٠] ناوینان کافر الله تعالی دووژمنی کافرانە چ جای وەرە تۆ بروات بە شەریعەتەکەی الله تعالی نەبێ یان نەقدی و

[٣٢٧] :صحيح البخاري
[٣٢٨] :سورة المؤمنون اية :٣
[٣٢٩] :سورة الفاتحة اية : ٧
[٣٣٠] :سورة البقرة اية : ٩٨

ڕەخنەی لێ بگریت یان ڕەخنە لە الله تعالی بگریی وەکو یەهود و نەصارا کە هەزار قسە بە پێغەمبەردەلێن (صلی الله علیه وسلم) ئەلێن ئەمە ئیماندارە ! .

ئیماندارە ئەوەیە (ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ)لەنوێژەکانیدا دلیان لەالله تعالی ئەترسێ وە چوار پەلیان کار ناکا الله أکبر تحرم ئەوەیە ئاو ناخۆی و خواردن ناخۆی وە جولە ناکەی کە سەلامەت دایەوە حەلال دەبێ ئەوشتانە ئەوەیە الله أکبر تحرم یانی حەرامم کرد لەسەر خۆم قسە کردن پێ کەنین جولەجول نان خوادن و ئاو خواردن ، دەبێ لەنوێژەکەتدا ئاو بخۆیتەوە و بلێ تۆزێك ئاوم بدەنێ !؟ نابێ بەلکو ئەبێ خاشع بی ، دواتر (وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ)[331]لەناو مەجلیسەکانیاندا لەناو ژیانی ڕۆژانەیاندا لەقسەی پرو پوچ خۆیان دووردەخەنەوە ،

الله تعالی دەفەرمووێی : (وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ)[332]الله تعالی دەفەرمووی : غەیبەتی یەکیتری مەکەن ئەو غەیبەتە وێنەی ئەوەیە ئەو کەسەی کە تۆ باسی دەکەی بەخراپە ڕاکشابێت بەمردوویەتی تۆ بچیت بەچەقۆیەك و چەتالێك خەریکی گۆشتەکەی بیت و بیخۆیت ،! تۆ ئەم گۆشتە ئەخۆیت!؟ پێت ئەخورێی ؟! هەرکاتێك ویستت غەیبەتێك بکەی یەکسەر بەمردوویەتی بیهێنە بەرچاوی خۆت بلێ ئەبێ من لەم گۆشتە بخۆم ! ئەیخۆی !؟

بەلاّم غەیبەت هی هەموو کەسێك نا ئاگاداربە غەیبەتی کەسان هەیە واجبە کابرا دز و جەردە و قۆلبڕ و خراپەکارە دێت لەگەل پیاوێکی موسلمان پی ئەلێ السلام علیك ئەچێ ئیستغلالی ئەکا تۆ یەکسەر پێ بلێ ئەوە جەردە و پیاو خراپە ئاگاداربە ئیستغلالت نەکا ئەوە غەیبەت نیە . بەس موسلمانە و لەخوا ترسە و نوێژ ئەکا لوتی خوارە ئەزانی ئەو لوتی خوارە پی ئەکەنێ یان ئەلێن ئەوە ناشیرینە ئەوە وایە یانی ئەوشتە نوقسانیانەی کە هەیەتی تۆ لەلای خۆیی باسی ئەکەی ؟! ئەگەر باسی بکەی پێی خۆشە ؟!ئەی بۆ لەلای خەلکی باسی ئەکەی واتا هی بڕواداری لە الله ترس باسی یەکیتری مەکەن بە خراپە .

سەیری ئەم حەدیسە بکەن زۆر عەجایبە ، ئەبو سەعیدی کوری زەید بۆمان باس دەکا (ڕەزا و ڕەحمەتی الله تعالی لێ بێت) ئەفەرمووێی : پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (إن من أربى الربا الاستطالة في عرض المسلم بغير حق)[333]گەورەترین ڕیبا ئەوەیە دەم بخەیتە شەرەف و کەرامەتی و باسی کەسێکی موسلمان بکەی بەناحەق ،

[331]:سورة المؤمنون اية : ١-٣

[332]:سورة الحجرات اية : ١٢

[333]: رواه أبو داود ، والبيهقي في " شعب الإيمان " .

ریبا چەند گەورەیە لەحەدیسێکدا وارید بووە (الربا اثنان و سبعون بابا)[٣٣٤] ریبا ٧٢ و بابی هەیە خۆتان فێرکەن بزانە ریبا چیە تاوەکو نەیکەن چونکە ریبا زۆر گەورەیە دووژمنایەتیە لەگەل الله و پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)حەربە لەگەل الله و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئەفەرمووی : (أدناها مثل إتيان الرجل أمه)کەمترنیان ئەوەیە زینا کەسێك زینا لەگەل دایکی بکا کەواتە ریبا لەزینا گەورەترە بەلکو زینای مەحارمیش کەمترین ریبا ئەوەیە زینا لەگەل دایکت بکەی ،

ئەو رۆژە یەکێك هاتوە ئەلیٚ مامۆستا حەلالە بچم عقار وەربگرم ئەلیٚ بۆمن حەلالە چونکە نیمە ، باشە بۆتۆ حەلالە لەگەل دایکت جوت بیت ؟!ئەگەر بشمرییی لەبرسان ؟! ئەم قسە هیچ و پوچانە چیە بۆخۆمان ئاسان کردوە ریبا حەلالە کوفر حەلالە ! هەموو شتێکتان حەلال کردوە کێشە نیە ئەلێن خوا ئەرحم و راحمینە ، ئەی ئەمە یانی چی ئەم حەدیسە ؟! (إن من أربى الربا الاستطالة في عرض اخيه)یەکمیان وتیان (أدناها مثل إتيان الرجل أمه)وتی لەگەل دایکت جوت بی ، گەورەترین ریباش ئەوەیە زمان بخەیتە باس کردنی برا موسلمانەکەت باسی مالەکەی نەکرد ریبای مال گەورەیە بەلام . کەواتە باس کردنی شەرف و کەرامەتی براکەت ریبایە باس کردنی شەخصیەتیەتی بەخراپە با ئەو مەجالیسانەمان لەوە بپارێزین.

یان لەمناقەشە عیلمی پیٚ نیە وقورئانی نەخوێندوە هیچی نەخوێند و تەفسیری نەخوێندوە دێت مناقەشە لەسەر ئایەتێك دەکا ئی کاکە بەبیٚ عیلم قسە مەکە عیلمت پیٚ یە لەسەر چاو بەبیٚ عیلم موناقەشە مەکە کەچی دێت موناقەشەشت لەگەلدا دەکا .

الله تعالى دەفەرمووی : (مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ)[٣٣٥].

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : (ما ضل قوم بعد هدى كانوا عليه إلا أوتوا الجدل)[٣٣٦]هیچ کەسێك تووشی گومرایی نابیٚ لەدوای ئەم هیدایەتە کە لەلایەن الله تعالى وە پێیان ئەدرێی إلا دوای ئەوە مناقەشە یان ئەدرێتی واتا مناقەشەی بیٚ مانا .

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەقوریشی وت :هەرکەسێك ئێوە بیپەرستن خۆشتان و پەرستراوەکانتان بۆ جەهەنەم تەبعەن مەبەستی پیٚ ئەو کەسە کە رازی بێت بەم پەرستراوە (إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ)[٣٣٧]قوریش ئەهاتن لەگەل پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ئەیانکرد بە مناقەشە دەستیان کرد بە پێکەنین و هاوار و ئەوشتانە بۆ؟ وتیان والله دۆراندت !بۆ ئەی

[٣٣٤] : السلسلة الصحيحة " ٤ / ٤٨٨
[٣٣٥] :سورة الزخرف اية : ٥٨
[٣٣٦] : رواه أحمد ، والترمذي ، وابن ماجه .
[٣٣٧] :سورة الأنبياء اية : ٩٨

عیسا ناپەرسترێی !پێ دەکەنین عیساش بۆ جەهەنەم !ئەی تۆ نالی عیسا پێغەمبەرە ئەو بچێتە جەهەنەم دەبا ئێمەش بچینە جەهەنەم !! ، ئاخر ئەم ئایەتە مەبەستی ئەوە نەبوو ئایەت هاتە خوارەوە الله تعالى فەرمووی (إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَىٰ أُولَٰئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ*)لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا))[٣٣٨]ئەوانەی کە الله تعالى بەپیاو چاك و بەپێغەمبەر و بەمەلائیکە و ئینسان ی برِوادار دایناون با خەلکیش بیان پەرستی کە ئەوان رازی نین ئەوان دوورن لەم مەسەلەیە ، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ)[٣٣٩].ئەوانە هەر ئەیانەوێی مناقەشە بکەن ، کاکە تەسلیم بەحەقەکە ببە و تەواو با مەجالیسمان وابێ .

عەدی کوری حاتم (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لیٚ بێت)دەفەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ("اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ)[٣٤٠] .خۆتان بپاریزن لەئاگر گەر بەدەنکە خورمایەکیش بێ

هەر عەدی کوری حاتەم دەفەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (ذکر النبي صلى الله عليه وسلم النار فتعوذ منها )[٣٤١]باسی ئاگری کرد هەر دەیوت خوایە بمان پارێزی لەجەهەنەم ،ئائەم سیفەتەمان تێدا بێت خۆشەویستانم با لەیەکتریش بیبینین ، لەهاویناندا گەرم نیە خۆزگە لەکاتی گەرمایدا بلیٚ خوایە ئەمە هەر هیچ نیە خوایە لەئاگرەکەی جەهەنەم بمان پارێزە با دەمان دائیمەن بەمەوە بێت ! چەند کەس لەکاتە گەرمەکاندا دەمی بەمەیە ؟! هەمووی دەلیٚ ئای چەند گەرمە هەر ئەوەندەیە هیچیتر نیە ئەلێ بەخوا رۆژێکی زۆر گەرمە چیە ئەم گەرمایە یانی ئیعتراز لە خوا ئەگرێی ئێ الله تعالى وای داناوە تاقیت ئەکاتەوە بۆئەوەی بلیٚ خوایە لەئاگری جەهەنەم بم پارێزیی . ئەفەرمووێی جەهەنەم رێگەی درا لەبەر ئەوەی یەکتری ئەخوارد وتی خوایە خۆم خۆم ئەخۆمەوە وتی برۆ دوو هەناسە بدە یەکیان لەهاوین یەکێکیان لەزستان هەناسەکەی هاوین ئەمەیە  گەرماییەیە هەناسەکەی جەهەنەمی هاوین ئەم گەرمایەیە ئەمە هەناسەیە ، هی زستانیش سەرماکەیەتی ئینجا الله تعالى بمان پارێزی هەناسەیەکی جەهەنەم ئاوا بێ ئەبێ خۆی چی بێ .!

جا ئەلیٚ (فتعوذ منها)پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیوت خوایە پەنا ئەگرم لەتۆ لەئاگر (وأشاح بوجهه ثلاث مرات)چۆن بلیٚ چۆن خۆت لەئاگر دەپارێزی دواتر فەرمووی : (ثم قال اتقوا النار ولو بشق تمره )ئەگەر نیو دەنك خورماش بکەی بەخێر خیر بکە و چاکە بکە جاری وا هەیە میزانی چاکە و خراپەت

[٣٣٨] :سورة الأنبياء اية : ١٠١-١٠٢
[٣٣٩] :سورة الزخرف اية : ٥٨
[٣٤٠] : أخرجه البخاري، كتاب الزكاة، باب: اتقوا النار ولو بشق تمرة والقليل من الصدقة، (١٠٩/٢) رقم: (١٤١٧)،
[٣٤١] : فتح الباري شرح صحيح البخاري ١-١٥ ج١١،،رقم الحديث :٦٠٢٣،،ص :٣٨٢

وەکو یەکی لیَ دێی یان تۆزێك کەمترە خراپەکەت تۆزێك زیاترە ئەگەر نیو دەنك خورمات ببەخشیبایە بەرز ئەبوویەوە رزگارت ئەبوو نەئەچوویتە جەهەنەم پێی بەنیو دەنك خورما ئەتوانی خۆت بپارێزی (فإن لم تجد)ئەی ئەگەر ئەوەشتان نەبوو (فبكلمة طيبة)[٣٤٢] بەقسەیەکی خۆش وچاك قسەتان خۆشبیَ لەگەل یەکتریدا و رووتان خۆشبیَ دلتان پاك بیَ بابن بەو کەسانەی خۆتان خۆش بوێی و خوا ئێوەی خۆش بوێی .

## خۆشەویستی لەپێناوی الله

خۆشەویستی لەپێناوی الله تعالى لەتەواوەتی خۆشەویستی الله تعالى یە ، یانی ئەوە فەرعە لەو ئەصلە ئەبێتەوە . ئێمە باسی خۆشەویستی الله مان کرد ئێستا باسی خۆشەویستی نێوان یەکتری ئەکەین کە ئەمە فەرعێکە لەو ئەصلە ، یانی تۆ لەبەر چی یەکتریت خۆش دەوێی ئەبیَ ئەو هۆکارە الله تعالى بێت .
پێش هەموو شتێك کاتێك کەوا دەلێن پێغەمبەرمان خۆش دەوێی (صلى الله عليه وسلم)کە ئینسانێکە و خوا نیە و لەدایك و باوك بووە لەبەرچی خۆشت دەوێی ؟ ئەگەر الله تعالى نەیکردایە بە پێغەمبەر (صلى

[٣٤٢] :صحيح البخاري : ٥٦٧٧

الله عليه وسلم)وه الله تعالى قورئانى بۆ نەناردبایە نەیکردبایە بەرابەری ئەم خەلکە ئەم خەلکەی رێنمای نەکردبایە تۆ هەر نەت ئەناسی ! هەزاران هەزار ملیۆن خەلك رۆیشت هەر ناشیان ناسین نازانین کێ بوون و کێن ، بەس بۆ پێغەمبەرمان خۆش دەوێی (صلی الله علیه وسلم)لەبەر ئەوەی کە الله تعالى کردویەتی بە پێغەمبەری خوا .

ئینجا لەوێوە وەرەخوارەوە بۆ پێغەمبەرانت خۆش دەوێی بۆ صەحابەکانت خۆش دەوێی ، بۆ دەبێ هاورێییەکانی خۆت خۆش بوێی !ئەمانە ئەبێ هەمووی لەپێناوی الله تعالى دا بێ ، نابێ لەبەر خاتری شتێك بێ ئەگەر شتێك کەوتە نێوانیانەوە یانی تۆ لەبەر الله تعالى ئەوکەست خۆش نەویست !

خۆشەویستی الله تعالى ئەوە ئەگەیەنێ کە الله تعالى کێ خۆش ویست تۆش خۆشت بوێی کەواتە ئەوانەی کەوا الله تعالى خۆشی ئەوێن تۆخۆشت ئەوێن لەبەر خاتری الله تعالى تۆ خۆشت ئەوێن ئینجا خۆشەویستیەکانی دونیاویی هەمووی ئەرەوێتەوە .

ئەگەر تۆ کەسێك پارەی دایتی یان مالی دایتی یاخود یارمەتی دایت ئینجا تۆ بلێ والله کاکە لەبەر الله تعالى من تۆم خۆش دەوێی !کە پارەکەی لێگرتیتەوە خۆشت نەوێی و درۆت کرد والعیاذ بالله حاشا لەرووتان یانی تۆ لەبەر الله تعالى ئەوت خۆش نەویست بەلکو لەبەر پارە و مال ئەوت خۆش ویست !.

ئێستا با سەیری خۆشەویستی نێوان خۆمان بکەین لە دونیادا بزانە زۆربەی خۆشەویستەکان لەبەر الله یە یان لەبەر شتێکە ! هەمووتان سەیر بکەن :!

لەمالێك ئەگەر کەسێك تۆ خۆشت ویست لەبەر ئەوەی موسلمانە خۆی و مال و منالی روو لە الله ن و دەست پاك و چاو پاکن عەقیدەیان خاوێن و باشە زەرەریان بۆ هیچ موسلمانێك نیە تۆ ئەبێت ئەم کەست خۆش بوێی ئەمە لەبەر الله یە لەبەر هیچ شتێکیتر نیە بەلام ئەگەر هاتوو ، بەلاّم تۆ کەسێکت خۆش ویست لەبەر ئەوەی یارمەتیت ئەدا و مالت ئەداتێ لەبەر ئەوەی دیفاعت لێ دەکا دوای ئەگەر هەلگەرایەوە لێت ئەو کەسە یان رۆژێك لەرۆژان پارەی لێ گرتیتەوە تۆش بلێ والله من خۆشم ناوێی ئیتر ئەگەر وتبت لەبەر الله خۆشم دەوێی راستت نەکرد تۆ ئەبێ مال هەموو بخەیتە ئەولاوە هەرچی شتە بیخەیتە ئەملاوە ! راستە ئەمانە ئەبنە هۆکار بەلاّم ئەصلی ئەصلی خۆشەویستیەکە ئەوە ناگەیەنێ ئەگەر مالی لەتۆ گرتەوە تۆئیتر رقت لێی بێت ، ئەی باشە ئیسلام و موسلمان بوون گەورەترێکە یان مال کەواتە لای تۆ پێوەرەکە مال بوو ئیسلام نەبوو ، بۆیە ئەمرۆ ئێمە زۆربەی زۆری دووژمنی یەکترین نازانین کێمان خۆش دەوێی و رقمان لەکێ یە !

کێ مان خۆش دەوێی ؟ ئەوەی یارمەتیمان ئەدا خوای ئەکرد شەیطان ئەبوو رقمان لەکێ یە ؟ ئەوەی نامان داتێ خوای ئەکرد گەورەترین ئەولیای رەحمان ئەبوو ! !

ئەم قسەیە زۆر موهیمە بیری لیٚ بکەرەوە وایە یان وانیە ؟!

ئەمرۆ وای لیٚهاتووە إلا کەمیٚك نەبیٚ کەوا بۆ الله تعالی ماوەتەوە پیٚوەرەکە لەلای الله یە .

بزانین الله تعالی خۆشەویستان لە قیامەت چۆن باس دەکا ئەوانەی لەدونیادا کەیەکتریان خۆش ویستوە لەبەر خاتری الله تعالی نەبووە !

الله تعالی دەفەرموویی : (الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ)[٣٤٣].

(الْأَخِلَّاءُ)یانی خۆشەویستان لەخەلیلەوە هاتووە ئەوانەی لەدونیادا یەکتریان خۆش دەویٚی (يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ)لەرۆژی قیامەت هەمووی دووژمنی یەکترییە ! ئیٚستا تۆ سەیری ئەوکەسانە بکە کەوا یەکتریان خۆش ویستوە لەسەر مەرامیٚکی دونیا کەوا پیٚکەوە کۆبوونەتەوە هەر حیزب و کۆمەل و گروپیٚك ولایەنیٚك هەر چیەك بیٚ کەوا خۆشی ئەویٚن یان فەریقیٚکی تۆپانیٚت خۆش دەویٚی لەبەر خاتری الله تعالی نیە ئەمە تەبعەن لەرۆژی قیامەت هەمووی ئەبیٚ بەدووژمنی یەکتری (يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ)هەمووی ئەبیٚ بەدووژمنی یەکتری (إِلَّا الْمُتَّقِينَ)تەنها ئەو کەسە نەبیٚ کە تەقوای هەیە و لە الله تعالی ئەترسا و لەسەر ریٚبازی الله تعالی رۆیشتووە ئەوانە هەموویان دۆستن و لەژیٚر سیٚبەری عەرشی الله تعالی حەشر ئەکریٚن .

ئینجا با سەیری خۆشەویستی نیٚوانی یەکتری بکەین بزانین لەبەر خاتری الله تعالی یە !؟ئەگەر وابوو شوکری الله تعالی بکەین ئەوەش نیشانەی خۆیی هەیە ،. تۆ نابی لەبەر دونیا لیٚك دابریٚی ، بۆیە ئەمرۆ زۆربەی زۆری خەلك دلی یەکتری ئەهیٚشیٚنی هەمووی لەبەر دونیایە .

ئەلیٚ ئەو کچەکەی نەدا بەکورەکەم برۆ هەتا هەتاییە قسەم لەگەل نەکەی تەواو ئیتر عەشیرەتیٚك لەگەل عەشیرەتیٚك دەبیٚتە دووژمنایەتیان لەسەر چی ؟! کچەکەی نەدا بەکورەکەی ! ئی نایدا بەتۆ ئەیدا بەیەکیٚکیتر ئی خۆ نایدا بەهەموو پیاویٚك حەزناکەن بیدەن بەم پیاوە ، بەتایبەتیش تۆ هاتیتە پیٚشەوە تۆ کەسیٚکی بەتەقوا نیت ئەیدەم بەکوریٚکی بەتەقوا ، ئیترئەویتر ئەلیٚ والله من دوژمنی تۆم هەتا هەتایە ئیتر قسەت لەگەل ناکەم ! ئەها دوژمنایەتی لەسەر کچیٚکە ! ئەمە زۆر باوە لەناوماندا ئەبیٚ وشیاری بین ئەبیٚ ئاگاداری بین و خۆشەویستەکانمان لەپیٚناوی الله تعالی بیٚ ئەم ئایەتە لەیاد مەکەن هیچ کاتیٚك (الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ)[٣٤٤] والله هەموو گروپ و حیزب و کۆر و کۆبونەوەکانی ئەم سەر زەمینە ئەبن بەدووژمنی یەکتری إلا ئەوەی لەبەر خاتری الله تعالی کۆبۆتەوە ،ئیتر کەیفی خۆیانە دوونیا چۆن ئەبەن بەریٚوە بابیبەن بەریٚوە رۆژی قیامەت نەعلەت لەیەکتری ئەکەن لەئایەتدا هااتووە ئەو

[٣٤٣] :سورة الزخرف اية : ٦٧
[٣٤٤] :سورة الزخرف اية : ٦٧

دەلێ تۆ وات لێکردم ئەویتریش وا دەلێ !! ئەو دەلێ خەتای خۆت بۆچی بەقسەی منت کرد !! هیچی ئەمانە ناخوا .

بەلأم ئەگەر خۆشەویستیەکە بەتەنها لەبەر خاتری الله تعالی بوو موسلمانە و صالحە و چاوپاك و دەست پاکە خۆشم ئەوێی و حەز دەکەم نمونەی زۆر بێ لەکۆمەلگادا ئەوە وات لێ دەکا کەوا لەپێناوی الله تعالی کۆمەلگایەکی موسلمان دروست بکەی وەسیەت و ئامۆژگاری یەکتری بەحەق و بە صەبر بکەن لەگەل یەکتری وە یارمەتی یەکتری بدەن لەسەر خێر و چاکە ئێ والله ئەگەر لەبەر الله تعالی بێ مالیشی ئەدەیتێ مالیش هیچ نابێ ئەوکاتە گەر لەپێناوی الله تعالی بێ .

ئێوە سەیری نێوان هارون و موسا بکەن (علیهم الصلاة والسلام) کە دەفەرمووێ : (رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي (٢٥) وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي (٢٦) وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي (٢٧) يَفْقَهُوا قَوْلِي (٢٨) وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي (٢٩) هَارُونَ أَخِي (٣٠) اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي (٣١) وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي (٣٢))[٣٤٥] ئەمانەی هەموو داوا کرد هەمووی لەبەر ئەوەی یارمەتی دانی نێوانی خۆیی و براکەی لەپێناوی تسبیحاتی الله تعالی و خۆشەویستی الله تعالی : (كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا (٣٣) وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا (٣٤) إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا (٣٥))[٣٤٦] خوایە بیکەی بە هاو شەریکم خوایە بیکەی بەهاو دەمم خوایەگیان ئەو قورسایەی سەرشانم کەم بکەیتەوە بەهۆی براکەمەوە هارونەوە هەتا بتوانین پێکەوە زیاتر زیکر و یادی تۆ بکەین ،ئەوە خۆشەویستی برایەتیە لەپێناوی الله تعالی دا

جا بۆ ئەوەی ئەم برایەتیە بەردەوام بێ ئەم هۆکارانە ئەبێ بگرینە بەر :

## یەکەم: (الإعلام بالمحبة):

ئەگەر کەسێکت خۆش ویست لەپێناوی الله تعالی دا سونەتە پێ بلێت ، بلێ کاکە من لەپێناوی الله تعالی دا من تۆم خۆش دەوێی ، ئەمە خۆشەویستیەکە زیاتر دەکا .

ئەبو ذر (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ )دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوێم لێبووە فەرموویەتی : (إذا أحب أحدكم صاحبه فليأته في منزله فليخبره أنه يحبه لله)[٣٤٧] هەرکەسێك

[٣٤٥]:سورة طه
[٣٤٦]: سورة طه

[٣٤٧]:جامع الصغر : ٣١٤١.

لەئێوە لەبەر الله تعالى برا موسلمانەکەی خۆش ویست بروات بۆ مالەوە پیٚ بلێت من لەبەر الله تعالى تۆم خۆش دەوێی !

ئەمە   چی دروست دەکا !؟ ئەمە خۆشەویستی بەردەوام دروست دەکا لەبەر الله ، کەواتە لەبەر دونیا نیە ئەوکاتە خوانەخواستە هەر نیشانەیەکی درۆ دەرکەوت کە لەبەر الله نەبیٚ ئەلیٚ کاکە ئەی تۆ نەتوت من لەبەر خاتری الله تعالى تۆم خۆش دەوێی !؟ ئەی ئێستا بۆ لەبەر پارە منت خۆش ناوێی"! ئەها باش بزانن و تێرابمێنن ئەڤەری هەیە ئەم ئیشە .

ئەنەس (رەزای و رەحمەتی الله تعالى لیٚ بێت)دەفەرمووی : دانیشتبووم لەلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) (كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ مَرَّ رَجُلٌ ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّ هَذَا الرَّجُلَ ، قَالَ : هَلْ أَعْلَمْتَهُ ذَلِكَ ، قَالَ : لا فَقَالَ قُمْ فَأَعْلِمْهُ ، قَالَ فَقَامَ إِلَيْهِ فَقَالَ : يَا هَذَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ فِي اللَّهِ ، قَالَ : أَحَبَّكَ الَّذِي أَحْبَبْتَنِي لَهُ)[٣٤٨] لەمەجلیسێك دانیشتم پیاوێك تێپەری پیاوێکیش لەناو مەجلیسەکەماندا وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)ئەم پیاوەت بینی تێپەری خۆشم ئەوێی لەپیناوی الله تعالى ، یانی ئەوەی رۆیشت بەخۆی نەیزانی بەس ئەم پیاوە بە پێغەمبەری خوای خوت(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتی:پێت راگەیاندوە کەتۆ لەپێناوی الله تعالى تۆ خۆشت دەوێی ؟!وتی نەوالله ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویی : هەلسە برۆ پیٚ بلیٚ .ئەلیٚ هەلسا چوو پێی وت ، وتی فلان من لەبەر خاتری الله تعالى تۆم خۆش دەوێی ، ئەویش وتی ئەو الله یە تۆی خۆش بوێی کەلەبەر خاتری ئەو منت خۆش دەوێی .

جابۆیە سونەتە ئەگەر کەسێك پیٚ وتی تۆم خۆش دەوێی لەبەر خاتری الله تۆش بلیٚ (أَحَبَّكَ الَّذِي أَحْبَبْتَنِي لَهُ) ئەو الله تۆی خۆش بوێی کە لەپێناوی ئەودا منت خۆش دەوێی ، یانی دوعای بۆ بکا بەخۆشەویستی الله تعالى ، ئائەمە  برایەتی و خۆشەویستی دروست دەکا لەکۆمەلگادا ، دزی و راتوو روتی و خیانەت نامێنی ئەگەر کۆمەلگاکەمان ئاوا بیٚ بەم شێوەیە ، هەتاوەکو لەدین درووکەوینەوە خراپە زۆر دەبیٚ وەهەتاوەکو لەدین نزیك بکەوینەوە خراپە کەم دەبیٚ ، وە باشترین نمونەش زەمەنی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)شەر و شۆر و کوشتار و دزی و زینا و خواردنەوەی ئارەق ئەو بابەتانە زۆر بەدەگەمنی هەبووە لەوکاتەدا ، بەلاٚم کاتێك لەدین دوورکەوتینەوە لەو فەترە موبارەکە دوورکەوتینەوە خراپەکانیش زۆربوون ، بۆ نزیکی برۆ لەخراپە دووردەکەویتەوە بۆ نزیکی دین لەدین دووربکەوە خراپە زۆر دەبیٚ ئیتر دیعایەی

[٣٤٨] : رواه الإمام أحمد وأبو داود وهو حديث صحيح .

هەرچی جۆرە رێباز و شتێك بكەی هەر ئەم قاعیدەیە ئەصلە و تەواوە ئەویتر وانیە وە هەمووشمان ئەزانین !

مقدام كوری معدی كرب (رەزای ورحمەتی الله تعالی لێ بێ ) دەلێ :لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) وتویەتی: (إِذَا أَحَبَّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُعْلِمْهُ إِيَّاهُ)[٣٤٩] هەركەسێك لەئێوە كەسێكی خۆش ویست با پێی بلێ .

ئەمە هۆكاری یەكەم بوو كەوا پێ وتنە .

## دووەم: (أتهادی )

دیاری بەخشین و بردن بۆ یەكتری وە هەدیە كردنی یەكتری ، دیاری بەخشین بەیەكتری خۆشەویستی دروست دەكا .

ئەبو هورەیرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ) دەفەرمووی : پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (تَهَادُوا تَحَابُّوا)[٣٥٠] دیاری بەرن بۆ یەكتری خۆشەویستی نێوانی ئێوە زیاد ئەبێ وە یەكتریتان خۆش دەوێ زیاتر .

لەبەر ئەوە دیاری یەكێكە لە ئەخلاقە جوانەكانی ئیسلام ، ئەخلاقی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و ئەولیاكان و پیاوچاكان بووە دلەكان ئەنێ بەیەكەوە دیاری بەخشین .

## سێ یەم : (التزاور)

[٣٤٩] : رواه الترمذي وقال حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ .

[٣٥٠] :رواه البخاري

چوون بۆ لای یەكتری وسەردانی یەكتر كردن وە لەیەك پرسین خۆشەویستی زیاد دەكا ، بەلأم ئەمیش ئادابی هەیە ئەبیّ ئاگاداربین ، ئەمرۆ لەوانەیە هاتوو چۆ هەبیّ بەجۆرێك لەجۆرەكان بەلأم ئادابی لەگەل نیە ، ئەبنی كەسەكە زۆر بێزار دەبیّ ئەوەندە ئەچیّ بۆلای زۆر زۆر ئەچیّ بۆلای یان هەر ناچیّ بۆلای هەردووكی ئەبێتە هۆی ناخۆشی .

زیارەت و هاتوو چۆ بەم شێوەیە .

ئەبو هورەیرە (رەزا و رحمەتی الله تعالی لیّ بیّ)ئەلیّ : پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێی وتوە : (زُرْ غِبًّا تَزْدَدْ حُبًّا)[351] ئەی ئەبو هورەیرە ئەگەر چووی بۆلای كەسێك ناو بەناو بچۆ بۆلای ، یانی زۆرزۆرمەچۆ خۆشەویستیتان زیاد دەبیّ . ئەبینی ئەگەر كەسێك هەموو رۆژێك بێت بۆلات ناخۆشە ، ئەی ئەگەر هەر نەیەت بۆلات هەرناخۆشە بەیناو بەین ئەوەش ئەبێتە هۆكاری خۆشەویستی .

لەم بارەیەوە ئاداب زۆرە وە لەكۆمەلگاكەماندا چەندها مەشاكیل و موشكیلە هەیە هەر بەهۆی ئەم زیارەتانەوەیە جێی خۆیەتی هەندێك ئاماژەی پیّ بكەین .

ئەبینی مندالی هەیە مندالەكانی پەروەردەیەكی باشیان ئەدا وە دارو بەردی مالەكە هەموو دەهێنە خوارەوە كابرای خاوەن خانووش هیچ قسە ناكا لەشەرماندا خوا خوایەتی برۆیی ئیتر یارەبی قەت نێنەوە ئەوە كەی میوان بوو ئەی هاوار وا دەلی! یاخود لەدوانزەی شەودا ئەچیّ بۆلای! تخوا ئەمە كاتی هاتنە !یاخود لەكاتی ئیسراحەتدا .

یانی دەبیّ تۆ كاتەكان هەلبژێری وە مال و مندالت پەروەردە بكەی ئیتر زۆر شت هەیە كاتی ئەوەمان نیە باسیان بكەین چونكە بابەتەكەمان جیاوازە .

## چوارەم : (بذالل مال )

مال بەخشین بەیەكتری ئەبینی نەبووە و كەم و كوری هەیە و نارەحەتی هەیە دەبیّ چاوت لێی بیّ ئەمە خۆشەویستی زیاد دەكا .

[351] : الكتب » المقاصد الحسنة فیما اشتهر علی الألسنة » زر غبا تزدد حبا،،رقم :٥١٧

ئەبو ئیدریشی خولانی دەفەرمووی : گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە فەرموویەتی: الله تعالى فەرموویەتی : (وجبت محبتي للمتحابين فيّ، وجبت محبتي للمتحابين فيّ، والمتجالسين فيّ، والمتزاورين فيّ، والمتباذلين فيّ)[٣٥٢] ئەڵێ خۆشەویستی و مەحەبەتی من واجب بوو بۆ ئەو کەسەی کە لەپێناوی مندا یەکتریان خۆش دەوێ وە لەپێناوی من دائەنیشن بەیەکەوە وە لەپێناوی من زیارەتی یەکتری دەکەن وە لەپێناوی من دا ماڵ ئەدەن بەیەکتری بەس لەپێناوی مندا ، مەبەستی تریان نیە .

ئەبینی کەسێك لەکەسێك نزیك ئەبێتەوە بۆئەوەی کچەکەی بێنی ئەچێتە نزیکی و لێی نزیك دەبێتەوە تا کچەکەی لێ ئەستێنێ کەواتە تۆ بۆ الله تعالى نەچوویتە پێشەوە ،ئەی ئەگەر ئەم کچەی نەبوایە تۆ ئەچووی ! ؟ یاخود ئامانجێکی هەیە ئەمانە هەمووی زانایان دەفەرموون : ئەگەر لەپێناوی الله تعالى نەبێ درۆیە کارەکە .ئەصلە باوابی راستە خۆ گوناه نیە ئەگەر کەسێك بناسی و ئیشێکت پێ بەتی تاوەکو بۆت بکا تۆ شتێکی بۆ بەری تاوکو دلی راکێشی بەلام ئەبێ ئەصلەکە لەبەر الله تعالى بێ ئەگەر وتی من ئەوەکارەت بۆ ناکەم یان کچەکەت نادەمی تۆ نەڵێ مادەم وایە منیش تۆم ناوێ بەو مانایەی ئامانجەکە تەنها کارەکە نەبێ کە خۆت دەتەوێ ،ئەگەر وات وت یانی خۆشەویستیەکە بۆ الله نەبوو بەهیچ شێوازێك .

## پێنجەم : (إفشاء السلام)

بلاوی کردنەوەی سلاو و سەلام زۆرکردن لەنێوان یەکتریدا لەنێوان موسلماناندا ، هەتاوەکو لە حەدیسدا هاتووە لەوەی بیناسی و وە لەوەشی نەیناسی .

ئەبو هورەیرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لێ بێ )دەفەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لا تدخلون الجنة حتى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتى تحابوا أولا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم أفشوا السلام بينكم)[٣٥٣]والله ناچنە بەهەشت هەتا ئیمانتان نەبێ و نەهێنن ، لێرەدا با هەلوێستەیەك بکەین ئەمرۆ فکرەی وحدة الديان هەیە ئەم کوفرە گەورەیە هەر دینێکت هەبێ کێشە نیە ! چۆن کێشە نیە والله بەس موسلمان نەبێ بەحەیاتی خۆت بەهەشت نابینی ئەوە قورئان و ئەوەش حەدیس وا دەفەرموێ ! ئیتر چی دەکەن بیکەن چۆن دلی خۆتان خۆش دەکەن دلی خۆتان خۆش بکەن ، ئەلێن ئەوە جولەکەیە و ئەوە نەصرانیە و خوا دەپەرستی هەر کەس بەدینی خۆیی وهەر کەس بەقەبری خۆیی ئەمە وانیە ئەبێ بەس الله و بەس پێغەمبەرت بووێ (صلى الله عليه وسلم)ئەبێ بەس دینی ئیسلام وبەس

٣٥٢ : حديث صحيح رواه الامام مالك في الموطأ.

٣٥٣ : الكتب » صحيح مسلم» كتاب الإيمان» باب بيان أنه لا يدخل الجنة إلا المؤمنون وأن محبة المؤمنين من الإيمان وأن إفشاء السلام سببا لحصولها.... رقم الحديث : ٥٤

قورئانت بوێی الله تعالی وا دەلێ ئەمە قسەی الله تعالی یە ئەفەرمووی : (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ)[٣٥٤] هەرکەسێك غەیری دینی ئیسلام بکا بەدینی خۆیی لێ قبول ناکرێی لەرۆژی قیامەتیش بۆ جەهەنەم بەهەتا هەتایی دەمێنێتەوە لەخاسرینە ، ئیتر دلی خۆیان چۆن خۆش دەکەن یا خۆش بکەن ،

جا دەفەرمووی : ناچنە بەهەشت تا ئەو ئیمانەتان نەبێ (ولا تؤمنوا حتى تحابوا)ئینجا ئیمانیشتان کامل نابێ هەتا یەکتریتان خۆش نەوێی ئەبێ یەکتریتان خۆش بوێی موسلمانان لەنێوان خۆیاندا پاشان ئەفەرمووی :پێتان بلێم ئەگەر شتێکتان کرد یەکتریتان خۆش بوێی سەلام زۆر زۆر بکەن و بلاوی بکەنەوە سەلام بلاو بکەنەوە لەنێوان یەکتریدا.

سەلام : بزانین منای چیە .؟ یانی خوا سەلامەتت بکا خوا لەعەزابی خۆیی بتپارێزیی خوا رەحمت پێ بکا خوا بەرەکەت بەسەرتا برژێنێ ، یانی تۆ ئەم دوعا خێرانە بۆ ئەم برا موسلمانانە دەکەی .

## شەشەم : (ترك ذنب)

تاوان واز لێبێنە و گوناه واز لێبێنە ، گوناه واز لێهێنانە هۆکارە بۆ ئەوەی خۆشەویستیمان بمێنێتەوە .

لەحەدیسدا هاتووە ، ئەنەس دەفەرمووێی : پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ما تواد اثنان في الله عز وجل ، أو في الإسلام ، فيفرق بينهما إلا ذنب يحدثه أحدهما ")[٣٥٥] هیچ دوو کەسێك لەپێناوی الله دا یەکتریان خۆش ناوێی کە موسلمان بن دوای جیاببنەوە رقیان لەیەکتری بێ إلا بەهۆی گوناهێکەوەیە کە کردوویانە .

واتا بەهۆی گوناهەوە برایەتی تێك دەچێ (فيفرق بينهما إلا ذنب يحدثه أحدهما)یەکێکیان گوناهێك بکا سبحان الله ئەبێتە هۆی جیابوونەوە و خۆش نەویستنی یەکتری لەنێوانیانەوە .

بۆیە ئاگاداری یەکتری بن دائیمەن ئامۆژگاری یەکتری بکەین کەوا گوناه نەکەین و تاوان نەکەین چونکە ئەبێتە هۆیی رەوینەوەی برایەتی و نەمانی خۆشەویستی .

زانایان دەفەرموون : ئەگەر تۆ هاورێی موسلمانەکەت بینی وە رووی تێ نەکردی گرژ بوو لێت بزانە شتێکت کردوە بەخۆتدا بچۆرەوە ، یان ئەگەر خۆشەویستیت زیاد بوو ئەوە تاعەتێکت کردوە وە شوکری الله لەسەر بکە .

[٣٥٤] :سورة ال عمران اية : ٨٥

[٣٥٥] : السلسلة الصحيحة" ٢ / ٢٣٢

## حەوتەم (ڕێگری کردن لەزەم کردنی برا موسلمانەکەت)

لەمەجلیسێکدایت و براکەت لەوێدا نییە پیاوێکیش بەسەریدا دێتە خوارەوە و زەمی دەکا و قسەی پێ دەڵێ تۆش لەگەڵیدا دامەنیشە .

نمونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە : ئەگەر بێتوو برا موسلمانەکەت ببینی سەگ پەلاماری دا پارچەپارچەی بکا تۆ رادەوەستی ؟!ئەگەر تۆزێك ئیمان لەدلتدا بێ رادەوستی یان حەرکەیەك یاخود شتێك دەکەی تاوەکو لێی دوور بخەیەوە !! دەی ئەو کەسەی غەیبەتەکە دەکا بەوێنەی ئەو سەگەیە ، چونکە ئایەتەکە دەڵێ حەزدەکەن ئێوە گۆشتی براکەتان بە مردوویەتی بخۆن هیچ حەیوانێك گۆشتەکە بەمردوویەتی ناخوا إلا سەگ نەبێ بۆیە ئەو نمونەشی هێناوەتەوە الله تعالی ،وەکو ئەوەی ئەوکەسەی ئەو غەیبەتە دەکا وەکو ئەو سەگە وایە و بەربۆتە گۆشتی براکەی .

دەی دیفاعێکی لێ بکە کەچی ئەمڕۆ وانیە ئەڵێ عیلاقەم چیە ئەڵێ خوای ئەکرد جوێنی بە ئەژداد و ئابئیشی ئەدا .

با ئێمە ئەوەمان لەنێوان یەکتریدا هەبێ ئەگەر ئەوەمان هەبی ئەوکەسە ناوێری غەیبەتی براکەمان بکا ، چونکە ئەوە میکرۆبی دووبەرەکییە تۆش مەهێلە ئەم میکرۆبی دووبەرکەییە لەلاشەی ئەم ئومەتە بمێنێتەوە وە بەم شێوەیەش با سەیری یەکتری بکەین.

ئەگەر ئەم خۆشەویستیە بەم هۆکارانەی کەوا باسمان کرد بەردەوام بوو بەراستی بەرو بوومێکی زۆری دەبێ

## بەروبومەکانی خۆشەویستی لەنێوان موسلمانان:

*خۆشەویستی الله بۆخۆت زیاد دەکەی ! زۆر باسی ئەوەمان کرد کەوا لەخۆشەویستی یەکتریدا الله تعالی ش ئێمەی خۆش دەوێی .

معاذی کوری جەبەل دەلێت گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو کەوا الله تعالی دەفەرمووی : (وجبت محبتي للمتحابين فيّ)[٣٥٦] موحیبەتی من واجب بوو بۆ ئەوە کەسەی کە لەپێناوی یەکتریان خۆش بوێی .

*رێز و کەرامەتی لەلایەن الله تعالی وە پیێ دەبەخشرێی .

ئەبو ئومامە لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : (مَا أَحَبَّ عَبْدٌ عَبْدًا لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ، إِلَّا أَكْرَمَ رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ)[٣٥٧] هیچ کەسێك نیە لەموسلمانان برا موسلمانەکەی خۆیی خۆش بوێی إلا الله تعالی رێزی لیێ دەنیێ .

چاوەری رێزی الله تعالی بکە یانی بە بەلاش ناروات خۆشەویستی برا موسلمانەکەت لەپێناوی الله تعالی .

وە تەبعەن کە رێزی لێنایی رێزیش کەرامەتە ئەوکاتە ئەتکات بە ئەولیا و خۆشەویستی خۆیی .

*لەژێر سێبەری عەرشی خۆیدا حەشرت ئەکا .

ئەبو هورەیرە (رەزای و رەحمەتی الله تعالی لێبی) دەفەرمووی: پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (إِنَّ الله تَعَالى يَقُول يَوْمَ القِيَامَة)لەرۆژی قیامەتدا الله تعالی دەفەرمووێی : (أَيْنَ المُتَحَابُّونَ

[٣٥٦] : لترمذي عن أبي إدريس الخولاني

[٣٥٧] : الكتب » مسند أحمد بن حنبل » مُسْنَدُ الْعَشَرَةِ الْمُبَشَّرِينَ بِالْجَنَّةِ ...» مُسْنَدُ الْأَنْصَارِ» حَدِيثُ أَبِي أُمَامَةَ،، رقم الحديث: ٢١٦٤٣

بِجَلاَلِي؟)كوان ئەوانەی کەوا لەپێناوی مندا یەکتریتان خۆشویست ؟!( اليَوم أُظِلُّهُم فِي ظِلِّي يَوْمَ لاَ ظِلَّ إلاَّ ظِلِّي)[٣٥٨] ئەمرۆ ئەیانخەمە ژێر سێبەری خۆمەوە کە هیچ سێبەرێك نیە لەم رۆژەدا .

ئێوە لەرۆژێکی گەرمدا لەنێوەرۆ تاوەکو عەصر لەبەر خۆر و گەرما دابن کە لەچاو ئەو رۆژەدا هیچ نیە گەرمای دونیا !! دەتۆش رۆژی قیامەت بێنە بەر چاوی خۆت پەنجا هەزار سال راوەستان لەگەرمایی رۆژی قیامەت کە یەك داری لێی نیە یەك سێبەری لیَ نیە یەك ئاو لەغەیری کەوسەری لیَ نیە ، ئاوی کەوسەریش تەنها بۆ بروادارانو شوێنکەوتەی ئەهلی سونە و جەماعەیە هەتاوەکو بۆ مبتدعینیش نیە موسلمان هەیە لیَ ناخواتەوە چونکە ئەهلی بیدعە بووە !

دەی لەو گەرما گەورەیە تۆ رادەوەستی نەکەوسەرت بەردەکەوێی وە نە سێبەری عەرشی الله تعالی ئەگەر بێتوو بەم شێوەیە نەبیت ، بەلکو دەبیَ ئیماندار و ئەهلی سونە بیت .

ئەم سیفەتانەی کە باسمان کرد ئەگەر تێدا بیَ الله تعالی دەتخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە! ئەمە کەرامەتێکی گەورە نیە !؟ ئەی پێداویستی هەر هەموومان نیە لەو رۆژە سەخت و نارەحەتە گەورەیە ؟!

برا و خوشکە بەرێزەکەم ئەگەر ئیمانمان بەو رۆژە هەیە با خۆمانی بۆ ئامادە بکەین ئەگەر ئیمانیشمان پێی نیە باخۆمان یەکلا بکەینەوە .

کێشەکە ئەوەیە ئەم خەلکە خۆی یەکلای ناکاتەوە ، تۆ یەقینت بە شتێك هەبیَ بەجدی کاری بۆ دەکەی .

*ترس و خەم ناچێتە دلیانەوە.

ئەوەی لەپێناوی الله تعالی یەکتریان خۆش بوێی ترس و خەم ناچێتە دلیانەوە .

لەفەرموودەکەیدا کەوا إبن عمر (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیَ بیَ)لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێرێتەوە دەفەرمووی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (أَنَّ لِلَّهِ عِبَادًا لَيْسُوا بِأَنْبِيَاءَ ، وَلا شُهَدَاءَ)کەسانێك هەن بەندەی الله ن نە پێغەمبەرن وە نەشەهیدین بەلکو کەسانیترن نەناسراون (يغْبِطُهُمُ الشُّهَداءُ والأنبياءُ يومَ القيامةِ؛ لقُرْبِهِم منَ اللهِ تعالى ومَجلِسِهِمْ منه.)پێغەمبەران و شەهیدەکان غبطة[٣٥٩]یان پیَ دەبەن ئەلێن خۆزگە ئێمەش ئەو مەوقیعەمان دەبوایە ! لەبەر ئەوەی ئەوەندە الله تعالی نزیکی کردینتەوە لەخۆیی مەجلیسەکەیان زۆر نزیکە لە الله تعالی وە .

(فجَثَا أعرابيٌّ على رُكبَتَيْهِ، فقال: يا رسولَ اللهِ، صِفْهُم لنا، وجَلِّهِم لنا.)ئەلیَ ئەعرابێك دەشتەچیەك لەلای پێغەمبەری خوا بوو (صلی الله علیه وسلم) چوە لەسەر چۆکی فەرمووی :ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆمان وەسف بکا کە کێن ئەوانە ؟

[٣٥٨] :رواه مسلم

[٣٥٩] :لەبەرامبەر حەسوودییە ، حەسودیش ئەوەیە تۆ حەزنەکەی فلان کەس هیچ شتێکی هەبیَ بەس غبطة ئەوەیە حەزدەکەی تۆش هەتبیَ ئەویش هەیبیَ

(قال: قَوْمٌ مِن أفناءِ النَّاسِ، مِن نُزَّاعِ القَبائلِ، تَصادَقوا في اللهِ، وتَحابُّوا فيه، يَضَعُ اللهُ عزَّ وجلَّ لهُم يومَ القيامةِ مَنابرَ مِن نورٍ، يَخافُ النَّاسُ ولا يَخافون، هُمْ أولياءُ اللهِ عزَّ وجلَّ، الَّذين لا خَوْفٌ عليهِم ولا هُمْ يَحْزَنون.)[٣٦٠] فەرمووی : ئەمە کەسانێکن نادیارن لەناو قەبیلەکانیان هەلبژێردراو دەگمەنن.

(أفناءِ النَّاسِ) بەمانانی نەناسراو دێی (نُزَّاعِ القَبائلِ)یانی لەناو عەشیرەتێکی گەورە بەدانستە ئەمانە هەلکەوتوون کەمن ئەمانە (تَصادَقوا في اللهِ، وتَحابُّوا فيه) لەپێناوی الله تعالی دا راستیان کرد وەیەکتریان خۆش ویستووە ، الله تعالی مینبەریان بۆ دائەنێ لەنوور لەوکاتەی خەلك ئەترسن کەچی ئەوان ناترسن چونکە ئەوان ئەولیای الله تعالی ن ئەوانە خەم و پەژارەیان نیە ئەوانەدلتەنگیان تووش نابێ .

***هەست کردن بەشیرینی ئیمان :**

یەکێکیتر لە سود و بەروبومەکانی خۆشەویستی لەنێوانتان لەبەر الله تعالی هەست کردنە بەشیرینی ئیمان ، بەدلنیایەوە هەرکەسێك لەبەر خوای گەورە یەکتریان خۆشبوێی ئەوە ئەوکەسە هەست بەشیرینی ئیمان دەکا ، بەس ئەگەر لەبەر دونیا بوو نەخێر هەستی پێنا کا .

با سیاسەتێکی حیزبی یان عەشیرەتی بهێنینە بەرچاومانەوە ، بەبەردەوام حیزبەکان ئەم سیاسەتەیان هەیە ،

ئەلێن، (صداق دائما لا ،عداوة دائما لا ،مصلح دائما نعم)ئەمە ئەو سیاسەتەیە کەهەموو ئەحزابەکانی لەسەر دەرۆن ، هەروابووە و واش دەبێ هەتاوەکو رۆژی قیامەت ئەوەی دەست نەگرێی بەدینی الله وە ، ماناکەشی ئەوەیە ، سیاسەتم وابێ هاوریەتی بەردەوامی کەسێك بکەم ؟دەلێت نەخێر ، ئەی دووژمنایەتی بەردەوامی بکەم ؟ ئەلێ نەخێر، ئەی ئەگەر مەسلەحەتم لەگەلی بوو ؟ئەلێ بەلی .بەردەوامبە ئەوکاتە مادەم مەسلەحەتت لەگەلی هەیە ! ئەی ئەگەر مەسلەحەت نەما ؟تەواو هاوریەتی مەکە .

ئێوە سەیری واقیع بکەن ئەم حالەتە وایە یاخود نا ؟! هەرکەسێك لەگەل کەسێك مەسلەحەتی هەبێ یان هەر حیزبێك لەگەل حیزبێکیتر یان هەردەولەتێك لەگەل دەولەتێکیتر مەسلەحەتی هەبێ بران ئەی ئەگەر مەسلەحەلەتەکەی نەما "؟ ئەو کاتە لێك ئەدەن چاوی بێت ئەیهێنێتەدەرەوە برای دایك و باوکی بێت ئەیکوژێی گوێی ناداتێ ئەوەش سیاسەتی شەیطانیە. ! ! بەس موسلمان وانیە موسلمان ئەلێت بەس ئیمان بمداتێ یان نا بەس ئیمان مالەکە هی خۆیەتی مادەم ئیمانی هەیە خۆشەویستمە و هاوریەتی لەگەل دەکەم مەسلەحەتی بەردەوام کار لەنێوانمان ناکا بەلکو مەسلەحەت لەنێوانمان ئیمانە ، بیر لەو رۆژە قورسەی قیامەت دەکاتەوە .

[٣٦٠] : السلسلة الصحيحة " رقم : ١٢٧٣

هەتاوەکو ئێوە سەیری دینی پیرۆزی ئیسلام بکەن چەند جوانە ! ئەلێ : کاتێك کەسێك کە سیلەی رەحم ئەکا ئەوە نیە یەکێك بچێ بۆلای ئەویتر دەبێ بێتەوە لەوانەیە بچی بۆلای و نەیەتەوە بۆیە ئەصلەکە ئەوەیە ئەویتر نایێت کەچی تۆش هەردەچێتەوە بۆلای و سیلەی رەحم بەجێدەگەیەنی ، ئەوە سیلەی رەحمە وازیشت لێبێنی تۆ هەردەچیتەوە بۆلای ! بەس ئایا نەفسەکان وان ؟! وانین بەداخەوە هەردەلێن ئەو نەهات بۆلام دەلێت جارێکیتر چاوی بەمن ناکەوتەوە ! دینی ئیسلام وانیە بەس ئەحزابەکان وان .

ئەبو هورەیرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێی بێت) دەفەرمووێی : پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمویەتی: (من سره أن يجد حلاوة الإيمان فليحب المرء لا يحبه إلا لله)[٣٦١] هەرکەسێك حەزدەکا شیرنایەتی ئیمان لەدلیدا بێ تامەکەی بچێژێی با لەبەرخاتری الله تعالی کەسێکی خۆش بوێ لەبەرهیچتر نەبێ ئینجا تامی ئیمان دەکا.

حەدیسێکیتر دەهێنینەوە لە ئەنەسەوە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ) دەفەرمووێی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان)سێ شت هەیە هەرکەسێك تێدا بێت شیرنایەتی ئیمان لەدلیدا هەست پێ دەکا :

١-(أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما)خوا و پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) لەهەمووکەسێك زیاتری خۆشتری بووێی ،! جا نالێ خۆشی بوێی بەلکو ئەلێ خۆشتری بوێی ، ئاگاداری ئەم دوو عیبارەتە بن ، کەسی وا هەیە دەلێ خوام خۆش دەوێی وە شەیطانیشم خۆش دەوێی ئەمە نابێ ئەبێ لەهەمووی زیاتر خۆشترت بوێی بەومانایەی ئەگەر بەرامبەرێتی کرا لەنێوان خوا و پێغەمبەر ئەبێ تۆ خوا و پێغەمبەری خوات زیاتر خۆش بوێی (صلی الله علیه وسلم)خۆشەویستی الله و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم ) نەگۆریتەوە بەهیچ شتێکیتر بەلکو لەهەمووشتێکت زیاتر خۆشتر بوێی ئەبێ سەری لەپێناو دابنێ (أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما).

٢-( وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله)ئەگەر کەسێکیشی خۆش ویست لەبەر الله تعالی خۆشی بوێی .

٣-( وأن يكره أن يعود في الكفر كما يكره أن يلقى في النار)[٣٦٢] ئەبێ لەدواجاریش حەزنەکا بگەرێتەوە بۆ کافر بوون و لادان لەدینی الله ئەگەر بخرێتە ئاگر ئاگرەکەی پێخۆشتر بێ لەوەی بگەرێتەوە ناو ئەو کوفرە .

ئەمە سێ شت بوو یەکەمیان خۆشە ویستی الله و پێغەمبەرەکەی کە ئەمە ئەصلەکەیە فەرعەکانیشی ئەگەر هەرکەسێکیشت خۆش ویست لەپێناوی الله تعالی بێ دوای دژی ئەوەش ئەبێ تۆ فرێی بدەی واتا

[٣٦١] : رواه أحمد ( حسن ) صحيح الجامع ٦٢٨٨
[٣٦٢] : رواه البخاري ٦٩٤١

دژی ئەمانە تۆ دەبێ فرێی بدەی و خۆشت نەوێی ، دینی ئیسلام وایە خۆشەویستانم ئەوە نیە بلێ من عیلاقەی کەسم نیە بۆ دژایەتی فلان و فلان شت بکەم ، الله تعالی پێت دەفەرمووێی: (إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ)[٣٦٣] ئەفەرمووێی : شەیگان دووژمنتانە وە بکەن بەدووژمنی خۆتان چونکە ئەو دەیەوێی حیزب و کۆمەڵەکەی خۆی بۆ جەهەنەم رابکێشی.

لەگەلیدا مەرۆ (لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ)[٣٦٤] کەواتە لا اله الا الله کەی ئێمە ئەوە ماناکەیەتی .

دینی ئێمە ئەوە شیعارەکەیەتی ئەڵێ لا دژی نعم ە واتا نەخێر (لا اله الا الله) هیچ پەرستراوێك نیە بیپەرستم بەحەق تەنها الله نەبێ کەواتە بەڵێ بۆ الله نەخێر بۆ هەموو شتێك ، ئەبێ نەخێرت هەبێ ئەمرۆ نەخێر نیە بەلکو بەڵێ بۆ هەمووشتێك هەیە ئەڵێ کاکە سەر سەرم ! !ئاخر وانیە بەلکو ئەوەیە بلێت بەڵێ بەس بۆ الله و نەخێر بۆ هەرشتێك غەیری دینی الله بێ ئینجا تۆ ئەو دینە و ئەو ئیمانە لەدلتدا رەنگ دەداتەوە .

*چونە ناو بەهەشتەکەی الله تعالی :

ئەبو هورەیرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ ) دەفەرمووێی :پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لا تدخلون الجنة حتى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتى تحابوا أولا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم أفشوا السلام بينكم)[٣٦٥] تۆ ئەم هەولەت بۆ بۆ بەهەشت نیە !لەدوینادا بیر بکەرەوە تۆبۆچی دروستکراوی ئەی بۆ عیبادەتی الله تعالی نیە !؟ کە عیبادەتی الله تعالی دەکەی الله تعالی بینینی خۆیی و بەهەشتەکەیت ئەداتێ ئێمەش دەبێ هەموو هەولەکانمان بۆ ئەمە بێ ئەوەش یەکێکە لەو بەروبومانە ئیمانتی پێ بەرەو کامل بوون دەروا ئیمان بەوە خۆشەویستیە کامل دەبێ ،

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێی : (من أحب لله وأبغض لله وأعطى لله ومنع لله فقد استكمل الإيمان)[٣٦٦] ئەوەی لەبەر خاتری الله کەسێکی خۆش بوێی (وأبغض لله)وە رقیشی لەکەسێك بوو لەبەر الله ، کەسێك ئەبینی جگەری بەدەستەوەیە ئەیخوا ئێ من چۆن خۆشم بوێی بە رەمەزان لەبەر چاوی خەلکی لەدەرەوەو لەشەقام جگەرە دەخوا و گوێش ناداتێ ئی کەمترین شت شعورت هەبێ هەر لەبەر خۆت بۆ ئەوەی خەلك نەعلەتت لێ نەکا برۆ مالەوە ئەمە کەمترین شتە کەنابێ ئەوەش بکەی ، ئاخر

[٣٦٣] :سورة فاطر اية :
[٣٦٤] سورة النور اية : ٢١
[٣٦٥] : الكتب » صحيح مسلم» كتاب الإيمان» باب بيان أنه لا يدخل الجنة إلا المؤمنون،،،، رقم الحديث :٥٤
[٣٦٦] : رواه أبو داود (صحيح الجامع ٥٩٦٥)

پێم بلێن ئەگەر کەسێگ تۆزێك عەقل و ژیری هەبێ جگەرە نیعمەتە یان نیقبەتە ؟! جگەرە نیعمەتی الله یە یاخود غەزەبی الله یە ؟! هەموو خەلکەکەش دەزانی کە غەزەبی الله یە کەچی بچی بەو غەزەبی الله یە دژایەتی الله بکەی من چۆن ئەو کەسەم خۆش بوێی ؟! نەخێر خۆشم ناوێی ئەگەر خۆشم ویست مانای ئەوەیە کەوا ئیمانەکەم تەواو نیە ،ئەی چۆن ئەوانەم خۆش نەوێی کەوا لەپێناوی الله تعالی دەمی خۆیان گرتۆتەوە و دانیشتون بۆ یادی الله یەکتریمان خۆش بوێی الله لەلای خۆی باسمان دەکا ئەبێ یەکتریمان خۆش بوێی چۆن کەسێکم خۆش نەوێی کە هەرچی الله و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بیلێن ئەو بلێت بەسەرچاو جێ بەجێ دەکەم ! ئەی چۆن رقم لەکەسێك نەبێ کە تۆ پێ دەلێ الله و پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وا دەلێن ئەویش دەلێ ئاخر باو باپیرانیش وادەلێن ، خوای گەورەش لەقورئاندا دەفەرمووی : ئەی ئەگەر باو باپیران بێ عەقل بوون چی ئەکەی تۆ؟! من دینم بۆ هێناون (أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ آبَاءَكُمْ)[٣٦٧] الله تعالی بە پێغەمبەرانی وتوە بە قەومەکانتان بلێن ئەوە قورئانە وا دەلێ ئەوە کەلامی الله یە وا دەلێ قەومەکەش ئەلێن باو باپیرانمان وادەلێن ، الله تعالی ش دەفەرمووێی: باشە من لەوە باشترم بۆ نەهێناون کە باو باپیرانتان ئەیلێن .

ئێ من چۆن ئەو کەسەم خۆش بوێی قسەی الله و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بشکێنێی بۆ باو باپیرانی ئی باو باپیران نەشارەزا و بێ عقل بوون چێیان لێ بکەین .

جا لەبەر ئەوە ئاگاداربە خۆشەویستی بۆ الله و لەبەر الله وە دووژمنایەتیش لەبەر الله ئەبێ دووژمنایەتی شەیطان بکەی نابێ بلێ دووژمنایەتی ناکەم ئەبێ دووژمنایەتی ئەولیای شەیطان بکەی .

پاشان ئەلێ (وأعطی لله ومنع لله) لەبەر الله ببەخشە وە لەبەر الله ش مەنع بکە یانی ئەگەر شتێکت بەخشی ئەوە موسلمانە لەبەر الله تعالی ئەیدەیتێ ئەوەش کافرە لەبەر الله تعالی نایدەمێ (منع لله)واتا نایداتێ لەبەر الله تعالی .

[٣٦٧]:سورة الزخرف اية : ٢٤

## ئەوسیفاتانەی الله تعالی پێی خۆشە لەبەندەکانیدا هەبێ

(الخصال التي يحب الله )لەمبارەیەوە چەندەها حەدیسی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەیە کەوا لەچەندین فەرموودەدا دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە الله تعالی ئەمەی پێی خۆشە .

وەکو باسمان کرد لە رابردوودا ئینسانی موسلمان ئەگەر بیەوێ بگاتە دەرجەی موحیبەتی الله تعالی ئەبێ ئەوشتانەی پێی خۆش بێ کە الله تعالی پێی خۆشە .

لە عبدالله کوری مسعودەوە (رەزاو رەحمەتی الله تعالی لێ بێ ) لەپێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرتەوە کە فەرموویەتی: ناچێتە بەهەشت هەرکەسێك ئەگەر لەدلیدا بەقەدەر زەرەیەك کیبری لەدلدا بێ (خۆ بەزل زانین)، پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)من حەز دەکەم جەلەکەم جوان بێ پێلاوەکانم جوان بێ بەمانایەکەی حەزم لەجوانییە ئایا حەز بوون لەجوانی کیبرە خۆ بەزل زانینە ؟! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویی : (إن الله جميل يحبّ الجمال)[٣٦٨] .

خوای تعالی خۆی جوانە و زاتی زۆر جوانە لەگەل ئەوەشدا الله تبارك وتعالی جوانیشی پێی خۆشە . بەو مانایەی ئەگەر خۆت جوان بکەی تۆ مال و حال و ژیانی رۆژانەت  پاك و خاوێن و جاوان و رێك و پێك بی الله تعالی ئەمەی پێی خۆشە .!! لەبەر ئەوەی الله تعالی خۆی جوان و پاکە  ، ئەمە کیبر نیە .

ئینجا پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێناسەی کیبری بۆ کرد فەرموویی : (الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ .)[٣٦٩] کیبر ئەوەیە کە تۆ حەق رەتکەیتەوە وە گالەتەش بەخەلکی بکەی . ئەگەر حەقێکت بۆ هات حەقەکە رەت بکەیتەوە ملکەچ نەبی بۆ حەق .

جا زانایان دەربارەی ئەم حەقە بەچەند شێوەیەك قسەیان لێوە کردوە :

*یەکێك لەوانە دەلێت : گەورەترین حەق تەوحیدی الله یە یەکخوا پەرستییە ، هەرکەسێك شەریك بۆ الله تعالی پەیدا بکا ئەوە کیبری هەیە ئەوە تەکبوری هەیە وەکو شەیطان ، کەتەوحید و یەکخوا پەرستی رەتکردەوە لە ئیتعاکردنی الله تعالی ، الله تعالی پێ فەرموو : (أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ)[٣٧٠] پەنا ئەگرین بە الله.

[٣٦٨] : أخرجه مسلم في صحيحه رقم ١٣١
[٣٦٩] : أخرجه مسلم في صحيحه رقم ١٣١

[٣٧٠] :سورة البقرة اية :٣٤

یاخود ئەو کەسە حەقی بۆ دێت پیٚ ئەلێت ئەمە حەقە خۆ بەزلزانی ئەیگرێی بەحەقی نازانی بەلکو بەباطلی ئەزانی یاخود ئەزانی ئەوە حەقە وەری ناگرێی پێی ئەلێی ئەم شتە ئاوایە ئەویش دەلیٚ دەزانم وایە بەس من قبولم نیە و وەریناگرم ئەوەشیان کیبرە .

جا ئەمە بوو پێناسەی خۆ بەزلزانین بەس ئێمە باس لەبەشی یەکەمی حەدیثەکە دەکەین کە ئەلێن الله تعالی جوانە وە جوانی پێی خۆشە .

جوانی الله لەزاتی خۆیەتی ئێمە کەسمان الله تعالی مان نەبینیوە بەتەماین بە ئیزنی الله تعالی عقیدە و بیروباوەرو ئیمانمان وایە کە بەزووترین کات بە الله تعالی بگەینەوە لەدوای مردن ، باسیشمان کرد لە باسەکانیتر وتمان ئینسانی ئیماندار مردنی پێی خۆشە حەز دەکا چووبێتەوە و لەم سجنە رزگاری بێی بچێتەوە بۆلای الله تعالی چاوی بەدیداری الله جوان و چاك بکەوێی لەم نارەحەتیانەی دونیا رزگاری بیٚ ، وەباسمان کرد وتمان الله تبارك وتعالی لەبەهەشتدا کە ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی داوە بەئەهلی بەهەشت پێیان ئەلیٚ لەوە باشترتان بدەمیٚ !ئەلێن لەوە باشتر چیە ؟ ئەلێت : بینینی خۆم ، خۆی نیشانی بەهەشتیەکان ئەدا هیچ نیعمەتێك لەوە گەورەتر نیە خۆشیەکانی بەهەشتیان لەبیر دەچێتەوە ئەوە جوانی زاتی الله تبارك وتعالی یە .

بەلاٌم نابیٚ بەهیچ شێوەیەك ئەوە بهێنیتە بەرچاوت چۆنیەتی جوانیەکەی بهێنیتە بەرچاوی خۆت نازانین چۆنە جوانیەکەی الله تبارك وتعالی خۆی ئەزانی چۆنە .

## جوانیەتی ناوەکانی

هەموو ناوەکانی الله تعالی جوانە و ناوێك نیە جوان نەبێ ، ناوی (رحمان، رحیم ،کەریم )هەریەك لەوناوانەی کەوا ثەبات بووە لەقورئان و سونە تۆ سەیری بکە هەر هەمووی جوانە هەرهەمووی رێك و پێکە ، ناوێکی خوا نەخواستە ناشیرین و قەبیحی تێدا نیە سیفەتەکانی هەمووی جوانە .

کە الله تعالی کەریم کەرەمی هەیە کەرەم ئەوە سیفەتەکەیەتی ، کە الله تعالی غفور ، مغفیرەت ئەوە سیفەتەکەیەتی ، کە الله تعالی حلیمە ، حیلمی هەیە ئەوە سیفەتەکەیەتی وە هەموو سیفەتەکانی الله تعالی جوانە ، الله تعالی فیعلەکانیشی جوانە هیچ کردەوەیەکی الله تعالی نیە إلا لەنێوان عدل و لەنێوان فەضلدایە بۆ بەندەکانی .

لەگەلتدا بەعەدالەت ئەجولێتەوە ، عەدالەت جوانەیاخود نا ؟! الله تعالی زولمت لێ ناکا لەکاری ئەودا زولم نیە چونکە زولم ناشرینە لە فعل و کردەوەی الله تعالی دا زولم نیە بۆیە فەرمووی : من زولمم لەخۆم حەرام کرد ئێوەش لەنێوانی خۆتاندا حەرامی بکەن ئەوشتانەی کە روودەدا لەو کارەسات و ناخۆشیانەی قەدەر هەمووی عەدالەتی الله و حیکمەتی الله تعالی تێدایە جوانیەتی ئەو فیعلەی تێدایە لەوەی حیکمەتی هەیە لەم ئیشە.

کەواتە الله تعالی جوانی پێی خۆشە لێرەوە ئیشارەت بەوە دەدەین کەوا هەرکەسێك لەمزگەوتدا هەرکەس بەپێ توانای خۆیی جوانیەتی و خاوێنیەتی مزگەوتەکان بپارێزی ، هەرکەس چەنێك ئەتوانی چاوی ئەیبینێ رەحمەتی الله تعالی لێبی و لەعەمەلی صالحیشە ئەتوانی ئەم کارە جێ بەجێ بکا و جوانیەتی و خاوێنیەتی مزگەوتەکان بپارێزی بەعیبادەتێکی گەورەش حیساب دەکرێی إن شاءالله .

ئافرەتێك لەزەمانی پێغەمبەری خوا دا (صلی الله علیە وسلم)خزمەتی مزگەوتی ئەکرد کە مرد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پێی نەزانی بەمردنەکەی دواتر پێیان راگەیاند ، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرموویی : ئەی بۆ بەمنتان رانەگەیاند ، وتیان : لەشەودا مردوە تۆ ئاگات لێی نەبوو وە حەزەمان نەکرد خەبەرت کەینەوە چوە سەر قەبرەکەی و نوێژی لەسەر کرد .

ئەو ئیشە جوانەی کە کردبووی بریتیی بوو خاوێن کردنەوەی مزگەوت بەهۆیەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) چوو لەسەر گۆرەکەی نوپژی لەسەرکرد .

جوانیەتی هەروەکو إبن القیم دەفەرموویی : لە پۆشاك ئەلێت ئەبێ بە سیێ بەشەوە :

بەشی یەکەم : ئەوەیە کەوا دەبێتە عیبادەت بۆ کەسەکە .

بەشی دووەم : ئەبێتە مایەی عقوبەتی الله تعالی بۆیی .

بەشی سێیەم :هیچ لایەك نایگرێتەوە .

بەشی یەکەم : ئەوەیە ئەو کەسە ئەو پۆشاکەی لەبەر خاتری الله تعالی لەبەر کردوە پێش هەموو شتێك ئەبێ نیەتت ئەوە بێ بلێ من عەورەتی خۆم دەپارێزم .

الله تبارك وتعالی دەفەرمووێی : ئێمە لیباسمان بۆ ناردونەتەخوارەوە ئێوە خۆتانی پێی داپۆشن بەلأم باشترین لیباسیش لیباسی تەقوایە ئاگاداربن .

یانی ئەو لیباسەی کە لەبەری دەکەی تەکبوری پێوە لێمەدە ئەوە بەشە خراپەکەیە .

لەحەدیثدا هاتووە کەسێك تەکبوری بەجلێك لێدا کە لەبەری کردبوو الله تعالی بەعەرزدا بردیەخوارەوە ، بۆیە ئەبێ وشیار بین جل و بەرگەکەت جل و بەرگی موسلمانانە بێ نەوەکو ئەمرۆ بەداخەوە نازانم من ئەمرۆ بەداخەوە جل و بەرگەکانی ئەمرۆ بە پیاو بەژن  کە لەبەری دەکەن ناوك و پشتیان هەمووی بەدەرەوەیە بەداخەوە !! ئەوە جلی ئێمە نیە لەنوێژدا پشتیان هەمووی بەدەرەوەیە پانتۆلێکی تەسك و جێی شەرمیان هەمووی تەسك و دیارە ئەو جۆرە لیباسانە الله تعالی پێی خۆش نیە ، رسمی تێدایە لەپێش یان لەدواوە وە زۆرینەیان نوسینی تێدایە نازانین چی لێی نوسراوە زۆربەی جار نوسینی خراپی لێنوسراوە بە ئینگلیزی هەر پێی خۆشە لەبەری بکا بەس ئینگلیزیی بێ ئەلێ قەیناکە ، ئێ باشە بۆتۆ ئینگلیز پەرستی بۆ ؟! با هیچی لێ نەنوسرابێ و با سادە و رێك و پێك بێ .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جارێك جلێکی خەت خەتیان بۆ هێنا ئەلێ لەنوێژەکەیدا کە سەیری خەت خەتەکەیی کرد وتی نوێژەکەم هەر لێ تێك چوو برۆن بیبەن جلە سادەکەم بۆ بێنەوە . پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەم شێوەیە بوو ئەمرۆ کابرا لەنوێژدا نازانی سەیری کامەی بکا هەمووی وێنەی تێدایە جوان نیە خۆتان مەگۆرنەوە ، ئەمە ثەقافەتی پێ نالێن بەشوێن کەوتنی ئەمریکا و ئەوروپا جلە جوانەکوردیەکەی خۆمان پاك و تەمیز و رێك و پێك نەك لەبەر کوردایەتی بەلکو لەبەر شەرعیەت شەرعیەتی تێدایە تۆ دائەنیشی بەو جلەوە بەئیسراحەت کەس بەئیسراحەت بە پانتۆلەوە دائەنیشی ؟!بەتایبەتی ئەم تەسك تەسکانەی ئەمرۆ هەردائەنیشی پشتی هەمووی بەدەرەوەیە .

ئەو جلە جوانەی کەتۆ لەبەری دەکەی ئەبێ شەرعی بێ ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێی : چ لەبەر دەکەی لەبەر بکە بەلأم تەسك و تەنك نەبێ لیباسی کافران نەبێ لیباسی شوهرە نەبێ پیاو ئی ژن لەبەر نەکا ژن  ئی پیاو لەبەر نەکا مەبەستیشت تەقوای الله تعالی بێ تەکەبوری پێوە لێمەدە .

ئەمەیە حەدیثەکە(إن الله جمیل یحبّ الجمال)[371] بەڵام بەم شێوازە ئەگەر ئەمە ئەوها بوو ئەوە بەهەموو نیتەکانیشت تۆ ئەجرت بۆ دەنوسرێی لەسەر ئەوەی ئەم جەلت لەبەر ئەوە لەبەر کردوە تاوەکو عەورەتی خۆتی پێی بپارێزیی پاشانیش خۆتی پێی برازێنیتەوە وە ئەسەرەی نیعمەتی الله تعالی ت پێوە دیار بێ .

بەشی دووەم: ئەو جل و بەرگەی کە دەبێتە هۆکاری رق هەلسانی الله تعالی ئەوەیە کەوا بۆ تەکەبوور لەبەری بکەیت بۆ دونیا و رەئاسەت و فەخر و خۆ بەزل زانینەوە لەبەری بکەیت یاخود خۆتی پێ فەرزبکەیت لەبەر خەلکیدا .

جوانی ئەوەیە تۆدلی خۆت بە تەوحید و یەکخوا پەرستی ئیخلاص جوان برازێنیتەوە جوانی بکەیت دلەکەت .

ئاماژەیەك بەوە ئەدەین کەوا زۆر کەس هەیە جلەکەی بەرزدەکاتەوە ناهێلی هیچ پیسی پێوە بنوسی بەلأم هیچ لەدلەکەی ناکا کەچی دلەکەی پرە لەشت گوێی ناداتێ چونکە شاراوەیە ! نابێ وەکو کەسێك وایە کەوا چل کن چلکن بێ و بچێت جلێکی جوان لەبەر بکات باش نیە بەلکو خۆشت بشۆ وە جلە جوانەکەش لەبەر بکە ، ناو دلت پاك بکەرەوە زمان و کردارت پاك بکەرەوە ئینجا جلی جوانیش لەبەر بکە ، بەس تۆ جلەکەت جوان بوو دلت ناشیرین بوو لەلای الله تعالی ئەوە قیمەتی نیە (**وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ**)[372] جل و بەرگی تەقوا بپۆشن .

هاوەلێك بەشێوازێکی نارێك و پێك پێغەمبەری خوای ئەوی بینی (صلى الله علیه وسلم)لەجل و بەرگ و قژ و لاشەیدا دەستێکی بەخۆیدا نەهێنا بوو ئەلێ : پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) پێی وت تۆ مالت نیە هەتاوەکو خۆت رێك و پێك بکەیت و جلێکی جوان لەبەر بکەیت ئەویش وتی من لەهەموو مالێك هەمە ! هەموو شتێکم هەیە ، پێغەمبەر پێی وت (صلى الله علیه وسلم) (إن الله عز وجل إذا أنعم على عبد نعمة یحب أن یری أثر النعمة علیه)[373]ئەگەر الله تعالی نیعمەتێکی دا بەکەسێك حەز دەکا پێوەی ببینێت ئەو نیعمەتەت پێوە ببینێت .، کەمادەم هەیتە بۆچی لەبەری ناکەیت !بۆخۆت نارازێنیتەوە و بۆخۆت جوان ناکەی یانی ئینسانی موسلمان ئەبێ هەر بۆنی چلك و ناشرینی و ئەوبابەتانە بێ !؟ نابێت وابێ ، نالێن تازە تازە لەبەر بکە هەر جلکەی خۆت با دووسێ سالیش لەبەرتا بێت بیشوو و ئوتوێکی بکە و رێك و پێك و پاکی بکەرەوە بەچرچ و لۆچی و ناشرینی لەبەری مەکە لەبەردەم خەلکیدا ئەوەندەی ئەتوانی ، خۆ

[371] : أخرجه مسلم في صحیحه رقم ١٣١
[372] :سورة الأعراف ایة :٢٦
[373] : أخرجه البیهقي في " الشعب " ( ٢ / ٢٣١ / ١ )

ئەگەر کەسێك نیعمەتی الله تبارك وتعالى بەجێبهێلی لەبەر خاتری الله تعالى بەلاّم پاك و تەمیز و رێك و پێك بیّ قەیناکە ئەوەش لەحەدیثیتر هاتووە بەلاّم مانعیش نیە تۆ خۆت برازێنیتەوە بەجوانی و بەرێك و پێکی لەوەی کە الله تعالى پێی بەخشیویی با ئەو نیعمەتەت پێوە ببینێی .

الله تعالى باسی بەهەشتیەکان دەکا کەوا چۆن رازاندویتەوە (وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا (١١) وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا)[٣٧٤] سەیری ناو بەهەشت بکە ! الله تعالى دەموچاویان جوان دەکا وە دلیان پر لە نوور دەکا وە جل و بەرگەکانیان حەریرە هەمووی باسی زێر و زیووی ئاوریشم و جلی جوان هەرچی پاك و تەمیزی و جوانی و دەولەمەندی هەیە لەوێدایە ، نمونەش لەدونیا الله تعالى دایی بەتۆ تۆش بەم شێوازە بەنیعمەتی الله تعالى خۆت برازێنەوە ،بەلاّم بەو مەرجانەی کە باسمان کرد با جل و بەرگەکەت جەل و بەرگێکی شەرعی بیّ لەژنان و لەپیاوان .

*یەکێکتر لەو سیفەتانەی کەوا الله تعالى خۆشی دەوێی .
دایکمان عائیشە (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لێی بیّ ) ئەلیّ کۆمەلێك یەهودی هاتن بۆلای پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) سەلامیان لێکرد بەلاّم بەچ شێوازێك وتیان : (السام علیکم)سام یانی مردن زمانیان والێی ئەکرد کەوا وانیشان ئەدەن کە دەلێن سەلام بەس لەژێریشەوە مەبەستیان سەلام نیە و ئەیان وت سام واتا مردن ، واتا بمری و لەناو بچی پێغەمبەر هەستی پێکردن (صلى الله علیه وسلم) هەر ئەوەندەی وت وتی وعلیکم ، یانی مردنەکە بەسەر خۆتانا بیّ بەس پێشی نەوتن کە تێگەیشتووە ، ئەوان بەاسلوبێك وایان وت ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) وتبای مردن بۆ ئێوە إحتیماله بیان وتبا ئێمە وتومانە سەلام ، بەس دایکمان عائیشە (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لیّ بیّ ) خۆیی بۆ نەگیرا کە گوێی لێبوو دایکمان وتی : (بل علیکم السام واللعنة)هەی مردن و لەعنەتی الله تعالى تان لەسەر بیّ ئەوها بەپێغەمبەر دەلێن (صلى الله علیه وسلم) ئەلیّ کە دایکمان وای وت پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرموویی : (یا عائشة ! إن الله رفيق يحب الرفق في الأمر كله)[٣٧٥] وتی ئەی عائیشە الله تعالى رفقی هەیە لەهەموو شتێکدا نەرموونیانی هەیە و نەرموونیانی پێی خۆشە .
جا لێرەدا ئەبیّ ئاگاداربین مانای ئەوەنیە ئەم حەدیثە واتێبگەین کە ئەگەر ئیهانەی الله و پێغەمبەری خوا کرا (صلى الله علیه وسلم) تۆ دابنیشیت و هیچ شتێك نەلێت ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم)

[٣٧٤] :سورة الإنسان اية : ١١-١٢
[٣٧٥] : الكتب » مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح» كتاب الآداب» باب السلام،، رقم الحديث :٤٦٣٨

خۆیی ڕەددەکەی دایەوە بەهیچ شێوەیەکیش خۆشەویستی یەهود لەدلی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەبووە ، نەك وەکو ئەمرۆ با هەموومان پێکەوە بین جوێن بە الله و پێغەمبەر و قورئانیش بدرێی کەس لەجێی خۆیی نەجولێی بەم شێوەیە نیە بەلکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕەددەکەی خۆیی دایەوە وە دایکمان عائیشەش ڕەددەکەی دانەوە ، بەس بەسلوبێکی نەرم چونکە ئەوان بەشێوەیك وتویانە إحتیمالە کە کەسەکە بلیٚ من سەلام وتوە سامم نەوتوە مەجالی ئەوەی تێدا بهێلەوە ، ئەی ئەگەر بێتوو ئیهانەی پێغەمبەر بکا (صلى الله عليه وسلم) لەصەحیحی موسلیم هاتووە کە دووکەس هاتنە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)توورەیان کرد لەحەدیثەکە دەفەرموی : (فلعنهما وسبهما)[٣٧٦] خۆیی جوێنی پێدان و لەعنەتیشی لێکردن مەوقیف ئەزانی مەوقیف .

جا لێرەا دایکمان عائیشە (ڕەزا و ڕەحمەتی الله لێی بێ )پێی دەلیٚ : باشە ئەمانە جوێن و نەعلەتت پێدان ئەوانە هەر بەد بەخت بوون ئەمانە ، پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : من لەگەل الله تعالى دا شەرتم کردوە هەرکەسێك موستەحەقی ئەوەبێ بەری دەکەوێی هەرکەسێك موستەحەقی ئەوە نەبێ بۆیی ئەبێ بەپاکی و بەمەغفیرەتی الله تعالى ، فەرمووی : منیش ئینسانم تورە ئەبم وەکو ئێوە توورە دەبم .

بزانە ئەمە دوو مەوقیف ! !

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویی : (إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفقَ، وَيُعْطِي على الرِّفق ما لا يُعطي عَلَى العُنفِ، وَما لا يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ)[٣٧٧]فەرموویی : ئەی عائیشە الله تعالى رفيق و نەرموونیانی هەیە وە لەسەر نەرموونیان ئەوەندە ئەدا ئەوەندە نادا لەسەر توند و تیژیی وەلەسەر غەیری نەرموونیانی .

لەبەر ئەوە ئەبێ وریا بین شتەکانمان لێی تێك نەچێ یانی کاتێك کە ئیهانەی الله و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەکرێی بلێن کاکە ئەبێ ئینسان هەر نەرم و نیان بێ بەم شێوەیە نیە ، یان ئەگەر هاتوو تۆ قسەیەکت کرد بە ئسلوبێك بیکەی مونەکەرەکە کە ئینکاریت کردوە لەوە خراپتر رووبدا .

لەحەدیسێکیتردا ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی بینی لەدەشتەکەدا خۆیی دەشوشت بەرووتی هیچی لەبەردا نەبوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئەمەی بینی لە هەلێکدا بۆیی هەلکەوت چوە سەر مینبەر و وتارێکدا بۆ خەلکی سوپاسی الله تعالى کرد و پاشان فەرموویی : (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ

[٣٧٦] :صحيح المسلم ، رقم الحدث : ٢٦٠٠
[٣٧٧] : رواه مسليم

حَيِيٌّ سَتِيرٌ)حيى يانى شەرم يانى الله تعالى خاوەنى شەرمە  الله تعالى شەرمى هەيە وە سەتريى[٣٧٨] تاوانباران دەكا لەهەمان كاتيشدا (يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسِّتْرَ)الله تعالى حەيا و داپۆشينى پێى خۆشە (فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ)[٣٧٩] ئەگەر كەسێك خۆيى شوشت ئاوا خۆيى رووت نەكاتەوە لەبەر چاوى خەلكيدا . ئەمرۆ سەيرى مەلەوانگاكان بكەن چۆنى ئەبيننەوە هەمووى عەورەتى خۆيى بۆيەكترى دەرخستووە لەو تێكەلاو پێكەلاوييەى كە هەيە ياخود سەير دەكەى گوێى نادرێتى لەهەندێك لەحەمامەكاندا گوێى ناداتە عەورەتى خۆيى يان لەسەر زێكان و دەوو رووبارەكان .

(أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا ذهب المذهب أبعد)[٣٨٠] پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم كاتێك بچووبايەتە بۆسەر ئاو زۆر دووردەكەوتەوە ، هەر لەبەر ئەمەش دەلێ لەكاتى دەست بەئاو گەياندن قسە مەكەن ئەوە جێگەى حەيا و شەرمە .

پاشان لێرەدا ئاماژەيەك بە سيفەتى حەيا ئەدەين كەيەكێك لەسيفەتەكانى الله تبارك وتعالى:

(حيى الستر)ئەو شەرمەى كە الله تعالى هەيەتى غەيرى ئەو شەرمەيە كە ئێمە هەمانە نابێ تەئويل بكرێى وەناشبێ بێتە بەرچاوت وەكو شەرمى ئێمە بێ لەشەرم كردندا ئينسانەكان ئەشكێنەوە بەلأم الله تعالى ناشكێتەوە ئاگادارىن ، لەبەر ئەوەى هەندێك ئەهلى بيدع ئەچن ئەم سيفەتەى الله لائەبن ئەلێن نابێ بلێ الله تعالى شەرمى هەيە ! ئى پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) واى فەرمووە  تۆ بلێ سيفەتى شەرمى هەيە بەلأم چۆن لايەقە بە الله تبارك وتعالى چۆنيەتى بۆ دامەنێ .

*يەكێكيتر لەسيفەتەكانى الله تعالى  عەفوو كردنە.

ئێمە كە لەمانگى رەمەزاندايىن بەتايبەتى لەدە شەوەكۆتاييەكەيدا ئەو شەوە تاكانە پێغەمبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموويى : محتەمەلە يەكێك لەو شەوانە لليلە القدر بێ ئێمە سالێك (**إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ**)[٣٨١] ئەخوێنين بۆ ئەم چەند شەوە بۆئەوەى ئەو ئەجر و پاداشتەى ٨٣ سالەى كەوا دەستت دەكەوێى لەو شەوە إن شاءالله لەم چەند شەوە تاكانەيە .

[٣٧٨] : ئاگادارىن ستار كەليمەيەكە لەناوماندا باوە ئەلى عبدالستار ئەمە ناوى الله نيە بەلكو ستر  ناوى الله يە .
[٣٧٩] : روى أبو داود (٤٠١٢) ، والنسائي (٤٠٦) ، وأحمد (١٧٩٧٠) عَنْ يَعْلَى بن أمية
[٣٨٠] : شرح سنن أبي داود – الراجحي،،جزء١-صفحة٥ ، عن أبي سلمة عن المغيرة بن شعبة:
[٣٨١] :سورة القدر اية :١

جا دایكمان عائیشه (رەزاو رەحمەتی الله تعالی لیٚ بیٚ ) وتی چی بلیٚن ئەی پیٚغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)فەرمووی : بلیٚ (اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عنی)[٣٨٢] جا لیٚرەدا سەیربكە جاریٚی ئاماژە ئەدەین بە سیفەتی عەفوو و لیٚخۆشبوونی الله تعالی ،

الله تعالی خۆیی ناوی العفو ، ە یەكیٚكە لەناوەكانی پاشان عەفووشی پیٚخۆشە .

عەفوو كردن چۆنە ! ئایا لەهەموو تاوانیٚك عەفوو دەكریٚ ئەم كەسە !؟نەخیٚر.وە ئایا عەفوو كردن هەر نیە ؟! نەخیٚر. غیرەت هەیە یان نیە ؟! بەلی .

ئەگەر عەفوت كرد تۆ بەغیرەتی یان بیٚ غیرەت ! !ئەمانەیان هەموو دیراسەكراوە لەلایەن زانایانی ئیسلام .

الله تعالی تبارك وتعالی زۆر زۆر بەغیرەتە عەفووی كەسیٚك ناكا شەریكی بۆ پەیابكا كەلەكاتیٚكدا عەفووە وە سیفەتی عەفووشی پیٚی خۆشە ، بەهیچ شیٚوەیەك كەسیٚك عەفوو ناكا كە شەریكی بۆ بریاردەدا ئیتر مەلیٚ الله تعالی عەفووە و لەهەموو شتیٚك خۆش دەبیٚ.

ئەگەر شەریك پەیا بكەی بۆ الله تەوەبە نەكەی الله تعالی لیٚت خۆش نابیٚ ، بەس ئەگەر تەوبەت كرد لەوەش خۆش دەبیٚ ! !تەوبە هیچی لەگەلدا ناوتریٚ هەموو شتیٚك ئەسریٚتەوە بەقەدەر ئاسمان گوناه بكەی شیرك و كوفر و ئیلحاد و معصیە و تاوان بخەیتە سەریەكتری كەوتت یا الله هاتمەوە بۆلای تۆ عەفووم بكە تەواو ئیترمن وازم لەو گوناهانە هەمووی هیٚناوە الله تعالی عەفووت دەكا بەس ئەگەر داوای لیٚبوردنی لیٚ نەكەی و داوای لیٚخۆشبوونی لیٚ نەكەی لەشەریك ئەوەهیچ كاتیٚك لیٚت خۆش نابیٚ .

بۆیە زۆر بەی زۆری ئەم خەلكە الله تعالی ئەلیٚ ئەگەر تۆ هەلسی دەعوەشیان بكەیت بۆلای تەوحید ئەوە هەرموشریكن وە لیٚیان خۆش نابن وەجەهەنەمیان پردەكا لەو جن و ئینسانانەی كەوا موشریكن (**وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ**)[٣٨٣] الله تعالی دەفەرموویٚ : ئەی پیٚغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆربەی زۆری ئەم خەلكە ئەگەر تۆ موسریش بی لەسەر تەوحید و ئیمانیان بۆ ئەوەی بەموحید بكریٚن ناتوانی ، ئەوە الله تعالی دایناوە بەلاٚم ئەمە ئەوە ناگەیەنیٚ كە بلیٚن الله تعالی لەگوناهەكان خۆش نابیٚ بەلكو خۆش دەبیٚ بەمەرجیٚك لەشیرك تەوبە بكەیت ، لەغەیری شیرك ئەگەر تەوبەش نەكەی موحتەمەلە لیٚت خۆشبیٚ وە موحتەمەلیشە لیٚت خۆش نەبیٚ (**يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ**)[٣٨٤] جا تۆ سەیری ئەمە بكە بزانە لەكامەیانی وە ئەبیٚت بپاریٚتەوە بلیٚت :یا الله لەوە بم كە تۆ مەشیئەت و ویستت وایە كەوا لیٚم خۆش ئەبی چونكە كەس نازانی جگە لەخۆی كە لیٚت خۆش دەبیٚ یاخود نا ، الله تعالی لەسەر

[٣٨٢] : أخرجه الترمذي رقم: (٨٠٢٥)،
[٣٨٣] :سورة يوسف اية : ١٠٣
[٣٨٤] :سورة الفتح اية :١٤

پشیلەیەك ژنێکی خستە ناو جەهەنەم لەسەر ١٠٠ کەس کەسێك کوشتبووی تەوبەی کرد خستیە بەهەشتەوە هەردووکی لەصەحیحن ئەوەی یەکەمیان تەوبەی نەکرد کەچی ئەوەی دووەمیان تەوبەی کرد .

عبدالله کوری عەباس بۆمان دەگێرتەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەیەکێك لەصەحابەکانی وتوە کە (لأشج عبد القيس)بووە (إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ)دووسیفەتت تێدایە بەواستەی ئەم دووسیفەتە الله تعالى تۆیی خۆش دەوێی الله تعالى ئەم دووسیفەتەی خۆش دەوێی (الْحِلْمُ، وَالأَنَاةُ)[385] حیلم : بریتیە لە لێخۆشبوون ،الاناة :بریتیە لە لەسەرخۆیی عەجەلە نەبی و ئینسانێکی بەپەلە نەبی بەبەردەوام ئینسان کە بەعەجەلە و هەلە و هەلجە بوو شتی خراپی لێی روودەدا ، وە هەروەها ئەگەر حیلم و صەبرت هەبێ هەرکەسێك ئەگەر هەلەیەکی بەرامبەر کردی مەرج نیە یەکسەر عقوبەی بدەیی ، راستە دیراسەی بکە و پێشی بلێ بەلأم لەگەل مەقدیرەتدا کە عەفووی دەکەی ئەمە سیفەتێکی جوانە بەس کاتێك تۆ دەسەلاتت نیە بلێ ئەوە من عەفووم کردی ئەمە حیلم نیە .

*یەکێکیتر لەوسیفەتانەی کە الله تعالى پێی خۆشە ویترە (إن الله وتر يحب الوتر فأوتِرُوا يا أهل القرآن)[386] .

الله تعالى تاکە وە نوێژی تاکیشی پێی خۆشە ، تاکە الله تعالى وە شەو نوێژی زۆر پێخۆشە شەو نوێژی ویتر (ئەوەیە کەتۆ چەند رکعات دەکەی بەلأم کۆتایەکەی بە تاك دەهێنی )ئاماژەش بەوە دەدەین دوای ئەو نوێژەش نوێژی تر هەیە لەسونەت کەوا بکرێی مانای ئەوە نیە لەدوای ویترنوێژ نامێنی ، نمونە لەرەمەزاناندا تەراویح دەکەی کۆتایەکەشی ویترکە دەکەی کەچوویەوە بۆمالەوە ئەتوانی شەوەکەی دوو رکعات دوورکعات شەو نوێژیتر بکەی .

ئینجا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : الله تعالى خۆی ویترە تاکە وە نوێژی ویتریشی پێی خۆشە .

ئەم نوێژە لەدەست خۆت مەدە هەتاوەکو دەفەرموێی باشترین نوێژ لەدوای فەرزەکان نوێژی ویترە .

[385]:رواه مسلم

[386] : رواه الإمام أحمد وأبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجه ، وصححه الألباني والأرنؤوط .

لەحەدیسێکدا دەفەرموویی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) الله تعالى ١٠٠ ناوی هەیە غەیری یەکێ نەبێ واتا ٩٩.

لەم حەدیسەوەکەهاتووە مانای ئەوە نیە کە الله تعالى تەنها ئەوەندە ناوەی هەیە و ناویتریی نیە ئەوەندەی ناوهەیە بەلکو کەس نایزانی بەلاَم ئەلێ تۆ لەو ناوانەی کە لەقورئان و حەدیسی صەحیح هاتووە تۆ ٩٩ لەبەر بکە و بیژمێرە ماناکەی بزانە وەهەروەها دوعای پێ بکە ئەوە یەکێکە زۆر لەوشتانەی خەلك زۆر لەبیری ئەچێتەوە و چوویتەوە (اسماء الله الحسنى)بۆ چیە کە ئەلێ (من أحصاها دخل الجنة)[٣٨٧] هەرکەسێك بیژمێری دەچێتە بەهەشتەوە .

إبن القيم دەفەرموویێ ژماردنەکەی وە بیان ناسی و لەبەریان بکەی وە ماناکانی بزانی وە دوعای پێ بکەی (یاعلى علمنی ، یارحمان إرحمنی ،یا غفور إغفرلی ،)هەتاوەکو دوایی بەهەرناوێك لەم ناوانە سیفەتەکەی داوا بکەی الله تعالى ئەوەت لەگەلدا بکا ، نەك بلێ یا عبدالقادر رەحمم پێی بکەی الله تعالى ئەمەی پێی خۆش نیە بەلکو ئەمە شیرکە بۆیە لەکۆتایی حەدیسەکە دەلێ (من حفظها دخل الجنة، وهو وتر يحب الوتر)الله تعالى تاکە وەتاکیشی پێی خۆشە .

*یەکێکیتر لەوسیفەتانەی الله تعالى پێی خۆشە (إن الله تعالى يحب أن تؤتى رخصه ، كما يكره أن تؤتى معصيته)[٣٨٨] الله تعالى پێی خۆشە ئەوشتانەی کە بەرووخصەت بۆ ئێوەی داناوە وەریبگریی ، بۆنمونە لەرەمەزاندا کەسەکە نەخۆشە ناتوانی بەرۆژوو بێ کەچی ئەو دەلێ من حەز دەکەم بەرۆژوو بم بەلاَم الله تعالى ئەوەی پێی خۆش نیە الله تعالى ئەوەی پێی خۆشە تۆ رۆژووەکەت نەگریی ، باسی فەضلی رۆژوو ئەکرێی لەسەر چاو و لەسەر سەربۆئەوانەی کەوا صیحەتیان باشە بەس کە نەخۆش بووی زەرەریی لێدای بەرۆژوو مەبە الله تعالى لە قورئاندا پێی وتووی : (فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ)[٣٨٩] الله تعالى پێت ئەلێ برۆ لەرۆژانیتر بیگرەوە لێرەشدا پێت ئەلێ پێی خۆشە ئەو روخسەتەی وەربگریی ،کەچی ئەویش دەلێ نەوالله من هەر پێم خۆشە بەرۆژوو بم ئاخر کە زەرەری لێدای هەلەت کردوە .

صەحابەیەك لەسەفەردا بوو بەرۆژوو بوو دوای کەوت و تاقەتی نەما لێی کۆبوونەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ئەوەچیە بۆچی لێی کۆبونەتەوە لەو ؟ وتیان : ئەوە بەرۆژووە و کەوتوە ،

[٣٨٧] : البخاري في صحيحه رقم (٧٣٩٢)
[٣٨٨] : رواه أحمد ، حديث رقم (٥٨٣٢)
[٣٨٩] :سورة البقرة اية :١٨٤

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : والله لەچاكە نیە تۆ ئالەو شوێنەدا بەرۆژوو بی مادەم وا دەكەویت و نارەحەت بووی پێی .

سەفر هەیە ئەتوانی بەرۆژوو بیٚ هەشە ناتوانی بەرۆژوو بی ، ئەتوانی ئەوە بەرۆژوو بە بەلاٚم گەر ناتوانی بەرۆژوو مەبە و لەخۆتی قورس مەكەوە و الله تعالی روخصەتی دایتی تۆش ئەو روخصەتەی وەربگرە ئەوە عیبادەتی راستەقینەیە .

تۆ لێرەدا تشدید لەسەرخۆت دەكەی لەسەر خۆتی قورس دەكەیتەوە بەس مال و مندالەكەت هەمووی سافیرەیە ! ! مالەكەت پریەتی لەدگ و رەقص ! لێرەدا تۆ منكەرەكە چاكە نەك تشدد بكەی لەشتێك كە روخصەتت پێیدراوە ، تەسبیحەكەی بەدەستەوە ئەلیٚ (لا اله الا الله) كەچی كچەكەی بە پانتۆلێكی تەسكەوە لەگەلیدا ئەروا تۆ ئەوها مەكە منكەرەكە چاك بكەرەوە ئەوە حالی ئومەتی ئێمەیە ، پێی ئەلیٚ ئەوە قورئان و حەدیس وادەلیٚ كەچی رەددی دەكاتەوە كەچی بەعەقلی خۆیی ئەوشتانە بەچاك دەزانی نابیٚ بەلكو الله تعالی پێی خۆشە روخصەتەكەی وەربگریی تۆش وەریبگرە .

*یەكێكیتر لەو سیفەتانەی الله تعالی پێی خۆشە پژمینە.

ئەبو هورەیرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیٚ بیٚ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : الله تعالی پژمینی پێی خۆشە وە باوێشكی پێی ناخۆشە .

ئێمە زۆر ئەبنین لەمزگەوتەكان لەنوێژەكان و لەمال و لەدەرەوە كابرا دەمی دەكاتەوە نازانیٚ ئادابی باوێشك چیە ؟

١–الله تعالی پێی ناخۆشە .

٢–ئەدەبت دراوەتیٚ لەپێشدا پێت ئەلیٚ خۆت بگرەوە و قوتی بدەرەوە ئەگەر هەر هات دەست بگرە بەدەمتەوە .

دەم دەكاتەوە و یەك بەخۆی ئینجا لەنوێژەكەیدا قورئانەكەش هەر دەخوێنی راناوەستی نازانی چش دەلیٚ ! ! دەمت بگرە هەتاوەكو لێی دەبیتەوە ئینجا بلیٚ (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)[٣٩٠] ئەروات و نازانیٚ نوێژەكەی چۆن ئەكا شەیطان باوێشكی پیٚ خۆشە بەلاٚم الله تعالی پیٚ ناخۆشە ، ئینجا هەیە

[٣٩٠] :سورة الفاتحة اية :٥

لەکاتی باوشکدا دەڵێن (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)نەهاتووە لەحەدیس شتی وا کەوا لەم کاتەدا وابڵێ بەس دەمگرتنەوە یان دەست بەدەمەوە دەگری گەر نەتتوانی دەمت بگریتەوە .

پاشان ئادابی پژمین : زۆر لەموسلمانان نازان لەئادابی ئەمە ئەوەی ئە پژمی با بلێت الحمدلله زانایان دەڵێن ئەم پژمینە بریتیە لەناخۆشیەکانی ناو لاشەی ئینسان و دێتەدەرەوە و تۆ ئیسراحەت دەکەی تۆش لەحەقیدا دەڵێ الحمدلله و سوپاسی الله تعالی دەکەیت کە الله رزگاری کردیت لەو ناخۆشیانە ، کەسی بەرامبەریشت با پێت بڵێ (یرحمك الله)الله تعالی بەبەردەوام رەحمەتت پێ بکا و رزگارت بکا لەناخۆشی تۆش بڵێ (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ)[391] الله هیدایەتت بدا و کارت بۆ چاك بکا .

ئەها لەو پژمینەی کە الله تعالی پێی خۆشە چۆن خۆشەویستی دروست دەبێ لەم ئادابەوە کە لەنێوان موسلماناندا جێ بەجێ دەکرێی لەکاتی پژمین ئەگەر گوێت لێبوو ئەبێ جوابی بدەیتەوە ئەگەر گوێت لێنەبوو جوابی مەدەرەوە ، یانی ئەو کەسەی کە ئەپژمێی با بەدەنگی بەرز بڵێ (الحمدلله)ئەوانەی کە گوێیان لێی دەبێت ئەبێ بڵێن (یرحمك الله)نەك لەکوردەواری خۆمان کە ئەپژمێی ئەڵێ ئەها خێرە یان ئەگەر دوو پژمین بوو دەڵێن شەرە تۆ ئەمەت لەکوێی هێناوە .

*یەکێکیتر لەوسیفەتانەی کە الله تعالی پێی خۆشە(کەرەم).

لەسەهلی کوری سەعدەوە (رەزا و رحمەتی الله تعالی لێی بێت) دەگێرتەوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ وَمَعَالِيَ الأَخْلاقِ ، وَيُبْغِضُ سَفْسَافَهَا)[392] الله تعالی کەریم ، کەریمیش یەکێکە لەناوەکانی الله تعالی وە سیفەتی کەریم کەرەمە .

کەریم واتا: ئەو بەخشنەدە و سەخییەی کە بەبێ داواکاری پێت ئەدا .

جیاوازی لەنێوان کەریم و سەخی : کەبڵێت کەریم واتا سەخی بەلام جیاوازییەکەیان لەنێوانیاندا ئەوەیە کەریم ئەوەیە بەبێ داواکاری پێت ئەدا بەلأم سەخی ئەوەیە کەداوات کرد ئینجا پێت ئەدا !.

الله تعالی بەبێ داوا ئەیبەخشێت کەریمە الله تعالی. هەروەها کەرەمیشی پێی خۆشە حەزدەکا لەناو بەندەکانی ئەم سیفەتە هەبێ ، ئەو کەسەی کەوا کەرەمی هەبێ سیفەتێکی زۆرجوانە تێدا کەهەیەتی .

(وَمَعَالِيَ الأَخْلاقِ)واتا ئەخلاقی بەرزیی پێی خۆشە الله تعالی (وَيُبْغِضُ سَفْسَافَهَا)سفساف ، یانی هەر قەولێك کە ناشرین بێ هەرشتێکی خراپ بێ بەومانایەی ئەخلاقی ناشرین .

[391] : روى البخاري (٦٢٢٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

[392] : الكتب » مكارم الأخلاق لابن أبي الدنيا » مَحَبَّةُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لِمَكَارِمِ الأَخْلاقِ ...رقم الحديث:٦

الله تعالى كەريم وە كەرەمى پێى خۆشە وە ئەخلاقى بەرزى پێ خۆشە وەئەخلاقى ناشرينى پێى ناخۆشە

.

جا پێويستە لەسەر هەريەك لەموسلمانان سەيرى ئەوە بكەن كە الله تعالى خۆى كەريمە وە كەرەميشى پێخۆشە وەكو وتمان ئينسان ئەگەر بيتوو دوونيا لەدەستيدا بێ ئەبەخشى بەس ئەگەر لەدليدا بێ نابەخشى .

*يەكێكيتر لەوسيفەتانەى كەوا الله تعالى پێى خۆشە.

لە ئەبو هورەيرەوە (رەزا و رەحمەتى الله تعالى لىێ بێت)دەفەرمووێى :پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموويەتى: (كلمتان حبيبتان إلى الرحمن خفيفتان على اللسان، ثقيلتان في الميزان،: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم)[٣٩٣] دوو وشەهەيە لەلاى الله تعالى زۆر زۆر خۆشە ويستن الله تعالى ئەو وشەى زۆر زۆر خۆش دەوێى (خفيفتان على اللسان)لەگەل ئەوەشدا كە الله تعالى زۆر زۆرى خۆش دەوێى وە زۆر ئاسانيشە ، رەنگە كەسێك حەديسەكەى گوێى بيست نەبووبێ بلێ دەبێ زۆر قورس بێ يان لەوانەيە كارێكى قورس بێ پێم جێ بەجێ نەكرێى ، كەچى لێرەدا پێت ئەلێ شتێكى زۆر كەم ئەنجام ئەدەى كەچى لەلاى الله تعالى زۆر زۆر خۆشەويستە نەك هەر ئەوەندە بەلكو لەسەر زمانيش ئاسانە بەلكو(ثقيلتان في الميزان،) لەكێشانى رۆژى قيامەت زۆر قورسە ، ئەگەرئەتەوێى كێشانەكەت قورس بێ ؟! ئەو دوو كەليمەيە بلێ كە بريتيە لە (سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم).

سەيركەن خۆشەويستانم ئينسان زمانى هەر قسەدەكا زمان ناگيريى جا يان بەلاى باشدا ئەيبەيت يان بەلاى خراپدا ، ئەگەر بەلاى خراپدا بيبەيت بەسەرت دەكەوێى ، وە لاى باشەكەشت ئەچێتە ناو ميزانەى حەسەناتت .

باشترين كەليماتيش ئەوانەن كە ئێستا باسمان كرد.

ماناكەى :

كەليمەى (سبحان الله)يەكێكە لەو زيكرانەى كە زۆر لەقورئاندا تەئەكيدى لێكراوەتەوە (**سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ**،،،)[٣٩٤]ئەوە بەمصدەر هاتوە وە هاتووە بە فعل (**سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى**)[٣٩٥] ئەوەش

[٣٩٣] :متفق عليه
[٣٩٤] :سورة الإسراء اية :١
[٣٩٥] :سورة الأعلي اية :١

بەفعلی أمر هاتووە (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ)[٣٩٦] بەفعلی ماضی (وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ)[٣٩٧] بەفعلی مضارع هاتووە .

بەمانای ئەوە دەێی خاوێنی راگرە الله خۆت لەشیرك شەریكی بۆ بریار مەدە ئەوە سبحان الله یە بۆیە ئەمە زیكری سەرنجەم مەلائیكەتەكانی ئاسمانە ئەفەرمووی الله تعالی (يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ)[٣٩٨] مەلائیكەتەكان بەشەو بەرۆژ ئەلێن سبحان الله هەتا وەكو ئەلێ قەت ماندوو نابن قەت بێ تاقەت نابن قەت راناوەستن لەسبحان الله دا ئەوەندە زیكرێكی گەورەیە بۆیە لەلای الله تعالی خۆشەویسترین كەلامە ماناكەشی ئەبێ تێبگەین هەر بەزار نیە .

برا و خوشكە بەرێزەكانم ئاگاداری عیبادەتەكانتان بن ئەم عیباتانە بەدلە و بەزمانە و بەكردەوەشە ئەبێ هەرسێكی بخیتە پال یەكتریەوە عیبادەتێك ئەگەر بەس بەزمان بێ لەدلەوە نەیتە دەرەوە ئەوە عیبادەت نیە بەس بەزمان بیلی و نەزانی ماناكەی چیە وەجێ بەجیشی نەكەی بۆیە ئەم كەلیماتانە بەس ئەوەندە نیە كەسەكە بەس بەزمان بیلیێ بەلكو دەبێ لەعقیدەی دلیەوە بێتە دەرەوە ئیمانی بەوە هەبێ كە الله تعالی خاوێنە لەشەریك نابێ شەریكی بۆ قەرار بدا ، ئەگەر الله تعالی شتێكی وت وە كەسێكتر شتێكیتری وت پێچەوانەی فەرمانی الله تعالی بوو نابێ بەقسەی بكەی .

بیهێنەرە بەرچاوی خۆت الله تعالی پێت ئەلێ ئەم شتەوابكە یەكێكیتر یان چەندەها كەسیتر باگەورەترین دەسەلات بێ بەتۆ بلێ ئەوها مەكە ئەوها بكە تۆ ئەبێ بەقسەی الله تعالی بكەی قسەی ئەوانیتر فرێی بدەی ئەوەیە سبحان الله تۆ ئەلێ الله خاوێنترێكە لەتۆ ، ئەم بابەتە زۆر دەكێشی هەتاوەكو كیتابی زۆر گەورەی لەسەر چاپكراوە بەمجەلەدات لەسەر سبحان الله چاپكراوە .

كاتێك كە تۆ دەلێ سبحان الله یانی یا الله من ئیمانم وایە تۆ هیچ عیبێكت نیە قسەكانی تۆ لەسەر سەرم قسەی خەلكی ئەدەم بەدیواردا ، ئینجا خۆشەویستانم ئایا لەواقیعدا وایە ئێستاكە قسەی الله تعالی بەئاسانی ئەشكێنرێی بەزمانیش هەر ئەلێن سبحان الله وە قسەی خەلك سەرئەخەین بەسەر قسەی الله تعالی دا ! !

الله تعالی دەفەرمووێ : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ)[٣٩٩] ئەی ئیمانداران ئێوە بەهیچ شێوەیە كەس مەخەنەر بەردەمی قسەی الله و پێغەمبەرەكەی (صلی الله علیه وسلم) الله و

[٣٩٦] :سورة الحديد اية :١
[٣٩٧] :سورة الرعد اية :١٣
[٣٩٨] :سورة الأنبياء اية : ٢٠
[٣٩٩] :سورة الحجرات اية :١

پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) لەپێش هەموو شتێکەوەیە هەرچیەکی وت ئەبێ بلێ (سمعنا وأطعنا).

الله تعالی لەقورئاندا پێمان دەلێ : یادی ئەو میثاق و ئەو عهدە بکە کە تۆ داوتە بە الله کە وتوتە (لا اله الا الله محمد رسول الله)یانی من بەقسەی کەس ناکەم بەقسەی تۆ دەکەم تۆ دائیمەن یادی ئەو میثاق و ئەو عهدە بکەن کە تۆ سوێندت لەسەر خواردوە بلێ والله الله خوای منە و من بەقسەی کەسیتر ناکەم .

یادی بکەنەوە بزانە ئێوە خاوەنی دینێکن لەدێنەکەتان بەلێنتان بە الله تعالی داوە کە ئێوە إلا ئەبێ بەقسەی الله تعالی بکەن ئەی ئەگەر بەقسەی الله تعالی مان نەکرد واتا پەیمانەکەمان شکاند .

(سبحان الله وبحمدە )یانی پاکی بۆتۆ خوایە لەشەریك لەعەیب وە سوپاسی ئەو خوایە ئەکەم (، سبحان الله العظیم)وە پاکی بۆ ئەو الله یە گەورەیە و عە ظیمە کەکەس لە عەظەمەتا ناگا بەو .

حافظ بن حجری عسقلانی لەفتح الباریدا دەلێ لەبارەی ئەم حەدیسەوە لەشەرحەکەیدا (وفي الحديث: الحث على المواظبة على هذا الذكر)لەم حەدیسەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێی کە دەبێ بەردەوام بین لەسەر ئەمە کات و مەکانی بۆ نیە باش ئاگاداربن سەیرکەن ئەم (سبحان الله )بەبەردەوام ئەلێن بەلاَم هەر سبحان الله شمان هەیە لەداوی نوێژەکان  وە هەیتمان لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران بەومانایەی سبحان الله زۆر کاتەکانی داگیرکردووین لەناو زیکرەکاندا ئەمە بەبەردەوام ئەیلێن (والتحريض على ملازمته.)واتا هانت ئەدا بەردەوام بی لەسەری (لأن جميع التكالبف شاقة على النفس)چونکە هەندێك تەکالیف هەیە قورسە لەوانەیە کەسیی واهەیە هەندێك شت هەیە بەهەلسان و بەرۆیشتن بەوانە کە ئەکرێی ئەوکەسە پێی نارەحەت بی و لای قورس بێ تۆ هەر لەجێگای خۆت دانیشتووی یاخود پال کەوتووی یان لەناو سەیارەکەتی هەر دەتوانی بلێ (سبحان الله وبحمدە ، سبحان الله العظيم)هیچی ویست ! ؟بەس زمانەکەت ئەجولێنی سەیر دەکەی لەهەر شێوازێك ئەتوانی بلێ سبحان الله وبحمدە هیچ نارەحەتیەکی تێدا نیە بۆیە پێت ئەلێ (خفيفتان على اللسان،)[٤٠٠] لەسەر زمان زۆر ئاسانە بەس لەسەر زمانیش یانی هەول و تێکۆشانێکی زۆری ناوێی (وهذا سهل ومع ذلك يثقل في الميزان)کەسەهلە لەگەل ئەوەشدا لەناو میزاندا زۆر قورسە (كما تثقل الأفعال الشاقة فلا ينبغي التفريط فيه)[٤٠١] هەروەکو چۆن کارو کردەوە و عیبادەتی قورس هەیە کەوا میزانەکەت قورس ئەکا ئەمەش قورسی دەکا لەکاتێکدا کە چەنێك ئاسانە جا دەلێ تخوا تەقسیری تێدامەکەن .

[٤٠٠] :متفق علیه
[٤٠١] : فتح الباري شرح صحيح البخاري .ص:٢١٢

إبن مسعود (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێی بێ)دەفەرموێی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (إنّ أحب الكلام إلى الله أن يقول العبد : سبحانك اللهم وبحمدك ، وتبارك اسمك ، وتعالى جدّك ، ولا إله غيرك .)[٤٠٢]خۆشەویسترین کەلام لەلای الله تعالی کە زۆری پێی خۆش بێ لەهەمووی خۆشەویستر ئەوەیە کە بەندە بلێ (سبحانك اللهم وبحمدك)پاکی بۆتۆ خوایە لەشەریك لەعەیب تۆ نوقسانیت نیە تۆ شەریکت نیە وە سوپاست دەکەم (وتبارك اسمك)وە بەرەکەت لەناویی تۆدایە خوایە بۆیە لەسەر هەموو شتێك بسم الله بکەن بەرەکەتی تێدایە (وتعالى جدّك)جد لێرەدا بەمانای گەورەییە ئاگاداربن خوایە عەزەمەتی تۆ گەورەیە (ولا إله غيرك)هیچ کەسێك شایستەی پەرستن نیە لەتۆ زیاتر یا الله وە هیچ کەسێك شایستەی بەقسەکردن نیە لەتۆ زیاتر یا الله تۆ ئێمەت دروست کردوە ئێمەش بەقسەی تۆ دەکەین ئەبێ هەر بەقسەی تۆ بکەین .

ئەلێ ئەمە خۆشەویسترین کەلامە تۆ بیلێی لەلای الله تعالی . بەس ئەمە هەروەکو وتمان هەر بەتەنها بەزمان نیە ئەبێ بەواقیع وابێ لەلامان نەیگۆرینەوە بەکەسیتر .

لە ئەبوذرەوە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێی بێت) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چووە بۆلای وە ئەویش چوە بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی : دایك و باوکم بەقوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئادەی پێم بلێ خۆشەویسترین کەلامێك لەلای الله تعالی چیە ؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : (" ما اصطفاه الله لملائكته : سبحان ربي وبحمده ، سبحان ربي وبحمده)[٤٠٣] ئەو کەلامەیە کە بۆ مەلائیکەتەکانی هەلبژاردوە و ناردوویە بۆیان کەوا بیلێن (سبحان ربي وبحمده ، سبحان ربي وبحمده)ئەمە زیکری هەموو مەلائیکەتێکە .

وە هەر ئەبوذر (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێی بێت)دەفەرموێی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووم : پێت رابگەینم کەوا خۆشەویسترین کەلام لەلای الله تعالی چیە ؟ وتم : بەلی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)پێم بلێ ! (فقال إن أحب الكلام إلى الله سبحان الله وبحمده)[٤٠٤] .

حەدیسێکتر لە سمرةی کوری جوندبەوە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێی بێت)دەفەرموێی : پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (أحب الكلام إلى الله تعالى : أربع لا يضرك بأيهن بدأت : سبحان

[٤٠٢] : السلسلة الصحيحة للألباني ٢٥٩٨
[٤٠٣] : الكتب » المستدرك على الصحيحين» كتاب الدعاء والتكبير والتهليل والتسبيح والذكر» أحب الكلام إلى الله سبحان ربي وبحمده..رقم الحديث: ١٨٨٩
[٤٠٤] : الكتب » صحيح مسلم» كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار.. رقم الحديث :٢٧٣١

الله ، والحمد لله ، ولا إله إلا الله ، والله أكبر)[٤٠٥] خۆشەویسترین کەلام و قسە لەلای الله تعالی چوارە (سبحان الله ، والحمد لله ، ولا إله إلا الله ، والله أكبر)سەیرکەن هەروەکو چەند جارێك ئاماژەمان پێداوە هەموو ئاماژەیە بەباسی الله وە (سبحان الله) پاکی بۆ الله لەشەریك و لەعەیب و کەم و کوری هیچ عەیبو کەم و کوری نیە وە هیچ شەریکێکی نیە (والحمدلله)سوپاسی دەکەین کە یەك خوایە ، دوو خوا نیە سوپاسی دەکەین لەسەر هەموو نیعمەتەکان لەسەرووی هەموو نیعمەتەکانەوە نیعمەتی ئیمان (ولا اله الا الله)هیچ خوایەك شایستەی پەرستن نیە بەحەق الا الله نەبێ (والله أكبر)الله تعالی لەهەمووان گەورەترە . ئەم کەلامانە کە تۆ ئەیلێ ئەبێ ماناکەشی بزانی ئەبێ لەقەراری نەفس و دلتدا وابێ وە لەواقیعی کردەوەشتدا وابێ لەکۆتاییەکەیدا فەرموویی (لا يضرك بأيهن بدأت)لەکامەیان دەست پێ بکەیی ئاساییە، یانی هەرکامەیان پێش بکەی ئاساییە دەبێ .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باس لەشەو نوێژ و رۆژوو ئەکا.

لەحەدیسێکدا لە عبدالله کوری عەمرەوە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ )فەرموویی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی وتم : (أَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ ، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ ، وَيَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا)[٤٠٦] خۆشەویسترین رۆژوو لەلای الله تعالی رۆژوەکەی داودە (علیه السلام)رۆژێك بەرۆژوو دەبوو وە رۆژێکیش بەرۆژوو نەدەبوو ، سەیری ژیانی ئەم پێغەمبەرە بکەن چۆن رۆیشتووە بۆنمونە ژیانی نیوەی رۆژوو بوە وە نیوەشی بەرۆژوو نەبوە !تەبعەن بۆ ئێمەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : لەرۆژووە سونەتەکان ئاوەها بەرۆژوو بن گەر ئەتوانن إلا رەمەزان نەبێ بەش غەیری رەمەزان رۆژێك نا رۆژوو ، دواتر باسی شەو نوێژمان بۆ دەکا (أَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ ، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ)بزانن شەو نوێژەکەی پێغەمبەر داود (علیه السلام) چۆن بووە ؟! ئەلێ : (وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ)ئەگەر ئێمە بیکەین بە واقیعی ئەگەر شەوێکی زستان بهێنین کە شەوەکە دوانزە سەعات بێ ئەلێ تا نیوەی شەو ئەخەوت تەبعەن شەو لەمەغریبەوە دەست پێ دەکا تا بانگی بەیانی شەوە ئەگەر لەشەش ی ئێوە بانگبدا بۆ شەشی بەیانی ئەوە بوو بە ١٢ سەعات ئەلێ لەمەغریبەوە هەتاوەکو ٦ سەعات حیساب بکە خەوتوە ئەگەر لەلای ئەوان مەغریب و عیشا هەبووبێ کردویەتی ئینجا خەوتوە واتا زوو خەوتوە ، ئێستا ئێمە بیکەین بە واقیعی خۆمان لەدوای نوێژی عیشا بخەوە هەتاوەکو سەعات دوانزە ئەوە نیوەی شەوە(نصف الليل)، (وَيَقُومُ ثُلُثَهُ)ثلاث یانی چی ؟ یەك لەسەر سێی رەقەمێك یەك لەسەر سێ ی ١٢

[٤٠٥] :صحيح المسلم
[٤٠٦] : روى البخاري (١١٣١) ومسلم (١١٥٩)

دەكاتە چوار كەواتە لە١٢ تاوەكو ٤ى بەیانی ئەوە نوێژ و خواپەرستی كردوە لەشەودا (وَيَنَامُ سُدُسَهُ)ئەمەش یانی یەك لەسەر شەش ، یەك لەسەر شەشی ١٢ دەكاتە ٢كەواتە ٢ سەعاتیش خەوتوە لەدوای ٤سەعاتەكە خەوتۆتەوە یانی ئەگەر شەو ١٢ سەعات بێ هەتا ١٢شەو خەوتوە لە١٢ی شەو هەلساوە بۆ شەو نوێژ كە هەلساوە ٤ سەعات عیبادەتی كردوە ٢ سەعات دواتر خەوتوە تا نوێژی بەیانی نوێژی بەیانی هەلساوە بۆیەش خەوتۆتەوە تاوەكو بۆ نوێژی بەیانی چست و چالاك بێ ، واتا نوێژەكەی لەوكاتەدا ئەنجام داوە كەلەدوای نیوەشەوەدایە هەتاوەكو دووسەعاتی مابێ بۆ نوێژی بەیانی ئەگەر سەعاتەكانی شەو دوانزە بێ جا بەم شێوەیە كاتەكانی شەوی دابەش كردوە چونكە كاتەكانی شەو دەگۆرێی جاری وا هەیە شەو دەبێ بە٨ یان ٩ سەعات كەمتر ئەبێتەوە نیوەی حیساب بكە لەبانگی مەغریبەوە تاوەكو بانگی بەیانی بیكە بەدوو بەشەوە ئەمە نیوەیەتی ، نیوە ئەوە نیە لەسەعات دوانزەی شەوەوە دەست پێ بكەی چونكە سەعات لەئیسلامدا ئەو سەعاتە نیە كە ئێستا لەدەستماندایە ، بەبەردەوام لەمەغریب سەعات دوانزەیە ئینجا دوای ئەوە دەبێ بەسەعات یەك كە بووبە یەك و چارێگ بانگی عیشا ئەدا بەگوێرەی ئەو سەعاتە ئینگلیزییەی كە لەدەستماندایە ئەگەر بلێن مەغریب سەعات شەشە ئەلێن سەعات حەوت و جارێگ بانگی عیشا ئەدا بەس سەعاتی ئیسلام وانیە بەبەردەوام مەغریب سەعات دوانزەیە بۆیە پێی دەلێن سەعاتی غروبی كە خۆر ئاوا بوو ئەبێ سەعاتەكە سەعات دوانزە بێ ئینجا دەبێتە یەك و دوو ،،،، كەبوو بەشەش ئەوەئەكاتە نیوەی شەو به سەعاتە ئینگلیزییەكە ئەكاتە ١٢ی شەو وە لەلای ئیسلامی خۆمان ئەلێن سەعات شەش ،، ئینجا بەم سەعاتە حیساب بكرێی مەغریب حیساب بكە هەتاوەكو بەیانی بیكە بەدوو بەشەوە ئەوە نیوە شەوە گەر بەسەعاتی ئینگلیزی بی دەكاتە سەعات ١١:١٥تەقریبەن وا دەكا .

ئینجا ئەو شەو نوێژانەی كە ئەكەن ئەگەر ئەوها بێ لەلای الله تعالی خۆشەویسترین شەو نوێژە .

*یەكێكیتر لەوسیفەتانەی الله تعالی پێی خۆشە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (التأنِّي من الله والعجلةُ من الشيطان) لەسەر خۆیی لەخواوەیە ئینسان لەسەر خۆبێ سیفەتێكی جوان كەلەلایەن الله تعالی پێت بەخشێنراوە (والعجلةُ من الشيطان)بەبەردەوام پەلە پەلكردن لەشەیطانەوەیە بەبەردەوامیش خۆتان ئەزانن ئینسان لەپەلە پەلكردندا زەرەردەكا (وَمَا شَيْءٌ أَكْثَرُ مَعَاذِيرَ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ، وَمَا مِنْ شَيْءٍ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ

الْحَمْدِ)[٤٠٧] كەس وەكو الله تعالى نيە كە عوذر قبول ئەكا لەهەموو كەسێك زياتر عوذر قبول ئەكا يانى كەسێك كە گوناهێك و هەلەيەك ئەكا دواى عوذر بۆ الله بهێنێتەوە و داواى لێبوردنى لێى بكا لێى خۆش ئەبێ و عوذرلێ قبول ئەكا ، وە هيچ شتێكيش لەلاى الله تعالى ئەوەندە خۆشەويست نيە وەكو (الحمد)سوپاسى بكەى ئەمەش يەكێكيترە لەوشتانەى كە زۆر تەركيزى لەسەر كراوە الله تعالى زۆرى پێى خۆشە تۆ سوپاسى بكەى سەرەتاى قورئانەكەمان بەوە دەستى پێكردوە خۆى سوپاسى خۆى دەكا (**الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**)[٤٠٨] لەسورەتەكان چەندەهامان هەيە بە سوپاسى الله دەست پێ دەكا و سوپاسى الله دەكا چونكە الله تعالى زۆرى پێ خۆشە ، خۆيى حمدى خۆيى كردوە وە مەلائيكە و ئەنبيا كردويەتى وە ئێمەشى هانداوە تاوەكو سوپاسى الله بكەين . وە حەمدى الله تعالى لەسەر ئەسما وصيفەتەكانى وە حەمدى الله تعالى لەسەر نيعمەتەكانى ، ئەو نيعمەتانەى بەئێمەى بەخشيوە حەمدى بكە و سوپاسى بكە لەسەرى الله تعالى بۆتان زياد ئەكا ئەفەرمووێ : ئەگەر تۆ سوپاسى بكەى بۆتان زياد دەكا .

عوقبەى كورى عامر (رەزا و رەحمەتى الله تعالى لىٚ بێت)ئەفەرمووێ : بەپێغەمبەرم وت (صلى الله عليه وسلم) حەزدەكەم لەسورەتى يس و هود بخوێنم ! پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووى : عوقبە برۆ سورەتى (الفلق )بخوێنە .( إِنَّكَ لَمْ تَقْرَأْ سُورَةً أَحَبَّ إِلَى اللهِ تَعَالَى وَلا أَبْلَغَ عنده منها، فإن استطعت أن لا تفوتك فافعل )[٤٠٩] وتى سورەتى (قل أعوذبرب الفلق ) بخوێنە هيچ سورەتێك وەكو ئەوە لاى الله تعالى وەكو ئەمە خۆشەويست نيە وە بەو شێوازە نيە كە تۆ بيخوێنى .

ماناكانيشى سەيرى بكەن .

سورەتى (الفلق و الناس) هەر لەحەديسى ترى عوقبەى كورى عامردا هاتووە لەصەحيحى موسليم ئەفەرمووێ :وێنەيان نيە لەقورئان ،، زۆر جار خەلك هەيە ئەلێ دلتەنگم ياخود نەخۆشم پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) هانمان ئەدا ئەم دوو سورەتە بخوێنين فووبكەين بەگيانى خۆماندا ئەمە روقيەى شەرعى پێ دەوترێى مەچۆ بۆلاى كەس خۆت بۆخۆتى بكە ! !.

سەيرى ماناكانى بكە هەردوو سورەتەكە (الفلق ، الناس)

بسم الله الرحمن الرحيم

[٤٠٧] : رواه أبو يعلي (٤٢٥٦/٧) عن أنس - رضي الله عنه
[٤٠٨] :سورة الفاتحة اية :٢
[٤٠٩] : كتاب ألف باء في أنواع الآداب وفنون المحاضرات واللغة ١-٢ ج١ ،،ص٢٦٣

(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ (١))تۆ بلێ من پەنا ئەگرم بە الله بەرەبەیان یان بەخوای هەموو بونەوەر ، بەڵام لەچی ؟( مِن شَرِّ مَا خَلَقَ (٢))لە شەری هەر شتێك كە الله تعالی دروستی كردبێت ، جا زۆر جار ئەڵێن هیچ شەرێك ما كە ئەڵێن لەفلان شەر ئەڵێن هیچ شەرێك نەما یانی یا الله پەنا دەگرم بەتۆ لەهەموو شەرێك نەخۆشی بێ نەبوونی بێ لەدونیادا بێت یان لەقیامەتدا بێت لەقەبەردا بێ لەهەر شوێنێك شەرێك بێتە پێشەوە خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لەوشەرە چەند گەورەیە ! بەڵام لەو شەرانە سێ شەر بەدیار دەخا وریابن لەهەموو شەرەكان بەس بەتایبەتی تر لەم سێ شەرە (وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ (٣))شەو كەتاریكایی دادێ (وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ(٤)سحر بازەكان كە سحرمان لێ بكەن (وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ (٥))وە لەشەری حەسودەكان كە حەسوودیمان پێ ببەن .[٤١٠]

واتا یا الله پەنا دەگرم بەتۆ لەتاریكایی شەو وە لەشەری سحر بازەكان وە لەشەری حەسودەكان خۆ ئەمانە هەر ئەوە بوون كە لەناو یەكەمدا بوون كەوتمان لەهەموو شەرێك بەڵام بەدیارخرا زۆر نارەحەتیەكان لێرەدا دێتە بەردەمی ئینسان .

ئەلێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كاتی خۆیی پێش ئەوەی ئەم سورەتانەی بۆ بێ ئەیوت : خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لەوە لەوە زۆر شتی باس دەكرد بەڵام الله تعالی ئەم سورەتەی بۆنارد هەمووی كۆكردەوە لەیەك كەلیمەدا (مِن شَرِّ مَا خَلَقَ)هەرچی شتێك الله دروستی كردبێ ئی بەخۆشی هەرئەوەندەیە ، زۆر گەورەیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویی بەعوقیە برۆ ئەمە زۆر خۆشەویستە لای الله بیخوێنە چونكە تۆ فەقیری خۆت بۆ الله دەردەخەی یانی بەرامبەر بەهیچ شەرێك من ناتوانم بەرەنگاری بكەم ئەبێ تۆ یارمەتیم بدەی یا الله !، وەكو ئەوانەی خۆمان نیە ئەڵێ پێ دەوێرم بەس لەوشتە تۆزیك یارمەتیم بدە بەلكو تۆ ئەڵێ بەهیچ شتێك ناوێرم خوایە یارمەتیم بدە و پەنات پێ دەگرم لێی ، بۆیە الله تعالی زۆر پێ خۆشە كەتۆ فەقیری خۆت دەردەخەی بەرامبەری .

جا ئەم سورەتانە لەحەدیسدا لەزۆر شوێندا هاتووە كەتۆ بیلی لەوانە لەنوێژدا دەیلێی لەعامەی خەلك بپرسە بەزۆری ئەلێ بەس سورەتی (الا خلاصم) لەبەرە ئی سورەتی (الفلق و الناس)یش لەبەر بكە و لەنوێژەكەتدا بیلی ، پاشان ئەمە لەدوای نوێژە فەرزەكان هەرسی سورەتەكە هەیە (الاخلاص ، الفلق ، الناس)زیكرە ئەبێت بیخوێنی ، لەزیكرەكانی ئێواران و بەیانیان سێ جار سێ جار دووبارە دەبێتەوە لەسەر جێگە لەخەودا سێ جار سێ جار دووبارە دەبێتەوە فوودەكەی بەخۆتدا لەشەو و رۆژێكدا چەندین جاردەیلێیتەوە .

[٤١٠]:سورة الفلق

جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەکۆتاییەکەیدا بەعوقبەی وت (، فإن استطعت أن لا تفوتك فافعل )[٤١١]ئەگەر توانیت و لەدەست دەرنەچێ هەموو جارێك بیخوێنە مەهێلە لەدەست دەرچێ ئەم سورەتە .

بەسەر مندالەکانتان بیخوێنن ، ئەلێن مندالەکەم ترساوە چەن شتی سەیر و سەمەرە دەکەن تا بەحیسابی خۆیان ترسەکەی لێی دەر ئەکەن سورەتی (الفلق)ی بەسەردا بخوێنە بزانە چەند بەبەرەکەتە بەئیعتقاد و بەئیمان بەلاّم بزانی ماناکەی چیە . ئەوە ماناکەی بوو کە باسمان کرد پەنا ئەگرم بە الله بونەوەر لەهەموو شەرەکان لەشەری شەو کەتاریکدا دێت ، وە لەشەری سحربازەکان وە لەشەری حاسیدەکان .

زۆر جار منالەکەت تووشی چاو ئەبێ وە بشزانن چاو حەقە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وای فەرموو ئەلێت (العين حق)[٤١٢] ئەویش لەقەدەری الله دا مندالێکی جوانت هەیە کەسێکیش ئەلی ئەو مندالە چەن جوانە ماشاء الله ناکا و هیچ نالێ چاوی لێ ئەدا ، زۆر شتی وا بووە مالت هەمووی چاو پیسێك لێ ئەدا هەمووی تیائەچێ تۆ بەبەیانیان و ئێواران ئەمانە بخوێنە الله تعالى ئەتپارێزیی تۆ ئەوکاتە ئەچیتە ناو قەلای الله تعالى وە وە ئەتپارێزیی . پێش ئەوەی منالەکەت شتێکی وا بەسەر بێ بخوێنە بەسەریدا زیکرەکانیتر ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەسەن و حوسێنی دا ئەنا لەباوەشی خۆیی زیکر بەسەردا ئەخوێندنەوە (أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة)[٤١٣] بەناوی الله تان پێ دەگرم لەهەموو چاو پیسێك وە لەهەموو شەیطانێك وە لەهەموو دەعبایەك .

سورەتی الناسیش سەیر بکەن هەر لەحەدیسی عوقبەی کوری عامردا (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لێ بێ) هاتووە هەر هەمووی پەناگرتنە بە شەیطان .

(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ(١))پەنامان گرت بە الله ی خەلك (مَلِكِ النَّاسِ(٢))پاشای خەلكی (إِلَهِ النَّاسِ(٣)) پەروەردگاری خەلكی إله هەر هەمووی بۆ الله تعالى یە (مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ (٤))کە شەیطانە لەشەری وەس وەسەی الخناس ، خناس واتا خۆ بزرکەر خۆ ونکەر خۆ پەناهەندە ، ئەلێ کاتێك کە تۆ زیکری الله تعالى دەکەی ئەو خۆی بزر دەکا بەلاّم کاتێك کە زیکری الله تعالى ناکەی ئەو دێت وەس وەسەت بۆ دەکا پەنا دەگرم بەتۆ خوایە لەو شەیطانەکە ئەمە سیفەتەکەیەتی الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ (٥) مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ(٦)[٤١٤] کە وەس وەسە

[٤١١] : كتاب ألف باء في أنواع الآداب وفنون المحاضرات واللغة ١-٢ ج١ ،،ص٢٦٣
[٤١٢] : السلسلة الصحيحة ( ١٢٥١ ) .
[٤١٣] : الكتب » صحيح البخاري» كتاب أحاديث الأنبياء» باب قول الله تعالى واتخذ الله إبراهيم خليلا،،رقم الحديث :٣١٩١
[٤١٤] :سورة الناس

ئەخاتە ناو دلی جنۆکە و ئینسانەکانەوە یان جنۆکە و ئینسانە شەیطانەکان ئەخەنە دلمان ئەمە هەموو پەناگرتن بوو لەوەس وەسەی شەیطان.
کەواتە هەردوو سورەتەکە هەموو شەرەکانی کۆکردەوە ئەوەی یەکەم شەیطانی هەرتێدایە بەلاَم ئی دووەم بەتایبەتی باسی شەیطان دەکا .

*یەکێکی تر لەو سیفەتانەی الله تعالی پێی خۆشە (نوێژی جەماعەت).
ئەوەیە کە ئینسان نوێژ بەتەنها نەکا بەبەردەوام بەجەماعەت بیکە ئینجا جەماعەت هەر مزگەوت مەرج نیە ئاگادار بە ئەگەر مزگەوت لێتەوە نزیك بوو بەو مەرجەی یەکێك لەسەربانی مزگەوت بانگ بدا بەبێ مکبیرەی سەوت سەوتەکەی بگا بەهەر کەسێك واجبە جواباتەوە و بێت بۆ مزگەوت ئینجا گەر عوزرێکی هەبێ نەچی ئەبێ بێ نوێژە جەماعەتەکەی بکا ، بەلاَم ئەگەر مزگەوتی لا نزیك نەبوو دووکەسن یان سێ کەسن پێکەوە نابێ هەر کەس بۆخۆی نوێژ بکا ئێمە سەیری مالەکان دەکەین کابرا دوورە لەمزگەوتەوە هەرکەس بۆخۆی نوێژ دەکا وەکو ئەوە وابێ جەماعەت نەبێ نەخێر بەلکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ : دووکەس لەجێگایەکدا بن هەتاوکو لەدەشتێکیشدا بن ئەگەر بێتوو جەماعەت نەکەی ئەلێ إلا شەیطان وەکو گوێدرێژ لێیان ئەخورێی بەو مانایەی بەکەیفی ئەیان سورێنی ، ئەگەر دووکەس بوون ئەبێ یەکێگ بانگ بدا دوای سونەت ئەکەن و قامەت ئەکەن دواتر کەسێکتر ئیمامەت دەکا لەتەنیشتیەوە را ئەوەستی بەلاَم ئەگەر سێی کەس بوون دووان دێتە دواوە و ئیمامەکە لەپێشەوە دەبێ .

لە (أبیٍّ بن کعب) (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (صَلاةُ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلاته وَحْدَهُ)[٤١٥]نوێژی کەسێك لەگەل برا موسلمانەکەیدا چاکترێکە وەکو لەوەی بەتەنها بۆخۆی بیکا (وَصَلاةُ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلاتِهِ مَعَ الرَّجُلِ ، وَمَا كَانُوا أَكْثَرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)چەند جەماعەتەکە زۆر بێ ئەوەندە لای الله تعالی خۆشەویسترە ئێمە باسی ئەوسیفەتانە دەکەین کە لەلای الله تعالی خۆشەویستە بۆیەش ئەوەمان باس کرد .
یانی نوێژی جەماعەت لەلای الله تعالی خۆشەویستە بەتەنها تۆ نوێژ مەکە هەتاوەکو کەست دەست نەکەوت لەگەل خێزانت نوێژ بکە لەمالەوە ئەگەر بێتوو عوزرت هەبوو لەدوا کەوتن مەبەستم ئەوە نیە بلێم

[٤١٥] : رواه أبو داود ( ٥٥٤ ) ، والنسائي ( ٨٤٣ ) . حسنه الألباني في صحيح بي داود .

مەین بۆ مزگەوت پیاو ئەبیَ بیَتە مزگەوت ژن لەماڵەوە نوێژ دەکا ئەگەر هاتوو بەهۆیەکەوە نوێژی جەماعەتت لەدەست دا ئەوەندە خەمخۆر بە بلی با ئەو نوێژی جەماعەتەم لەدەست نەروا بەماڵ و منالت بیَ وەرەن هەتاوەکو لەلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوها بووە جارێك صەحابەیەك هاتە ژوورەوە فریایی جەماعەت نەکەوت جەماعەت کرا ولیبوونەوە وسەلامدرابوویەوە هاتە ژوورەوە صەحابەکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووێی : (أَلَا رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّيَ مَعَهُ ؟)[٤١٦] ئەوە کەسێك نیە خێرێك بەم کەسە بکا بروا بیکات بەجەماعەت لەگەلیدا ئەبو بکر هەلسا و کردی لەگەلی بەجەماعەت بەس ئەبو بکر لە مەئمومی راوەستا نەك لەئیمامی کابرا ئیمام بوو ئەویش مەئموم بۆی بوو بەسونەت یانی سەیر بکەن چەند زۆر بیَ باشترە وە لەلای الله تعالى خۆشەویسترە .

*یەکێکیتر لە سیفەتەکانی الله تعالى پییَ خۆشە مەتح کردنی خۆی.

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللهِ ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ ، وَلَيْسَ أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللهِ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ)[٤١٧] وفى ريوات(وَلَيس أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنْ اللهِ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ أَنْزَلَ الْكِتَابَ، وَأَرْسَلَ الرُّسُلَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ")[٤١٨] لەم حەدیسە پیرۆزەوە عبدالله کوری مەسعود (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لیَ بیَ ) لەپێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بۆمان دەگێرتەوە کەوا فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە وەکو الله تعالى کە مەتحکردنی خۆی پیَ خۆش بیَ ، یانی الله تعالى زۆری پێی خۆشە تۆ مەتحی بکەی هەر لەبەر ئەوەش مەتحی خۆی کردوە و سوپاس و ستایشی خۆی کردوە لەقورئاندا .

تەنانەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (لا أُحصى ثناءً عليك أنت كما أثنيت على نفسك)[٤١٩] ئێمە ناتوانین بەهیچ شێوەیەك مەتح و شوکر و سەنا و سوپاسی تۆ بکەین بەو شێوەیەی کە لایەقە بەخۆت إلا خۆت کە کردبێتت بۆخۆت .

وە هەروەها دەفەرمووێی : هیچ کەسێك وەکو الله تعالى غیرەتی نیە ، وە غیرەتی الله تعالى لەهەموو کەسێك گەورەترە هەر لەبەر ئەوەشە کە فاحیشە و زینای حەرام کردوە شتە قەبیحەکانی حەرام کردوە الله تعالى زۆر بەغیرەتە .

[٤١٦] : ما رواه أحمد (١١٦٣١) وأبو داود (٥٧٤) والترمذي (٢٢٠) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه

[٤١٧] : روى البخاري (٤٦٣٤) ، ومسلم (٢٧٦٠)

[٤١٨] : الحديث برواياته (خ) (٤٦٣٤)، (٧٤١٦)، (م) (١٤٩٩)، (٢٧٦٠)، (حم) (١٨١٩٣).

[٤١٩] : هذا جزء من حديث عائشة رضى الله عنها وهو في صحيح الجامع رقم ( ١٢٩١ ) وفي صحيح أبو داود (٨٢٣ )

تەبعەن لێرەدا وەسفی الله تعالی دەكرێی بە غیرەت  ئەو غیرەتە غەیری ئەو غیرەتەیە كە ئێمە هەمانە ئەبێ ئێمە جیاوازی بكەین لەنێوان ئەو سیفەتانەی كە بۆ الله تعالی دانراوە لەقورئان و لەسونەتی صەحیح لەنێوان الله و مخلوقەكانی ئەلێن بەو شێوەیەی كە لایقە بە الله تعالی  .

الله تعالی خاوەنی غیرەتێكی زۆر گەورەیە كەس وەكو ئەو ئەوەندە غیرەتی گەورە نیە ، غیرەت خۆی لەخۆیدا ماناكەی هەر ئەوەندە بەسە بلێ غیرەت، ئەلێ لەبەر ئەوە حەرامەكانی حەرام كردە و شتە فاحیشەكانی حەرام كردوە لەصەحیحدا هاتووە ئەلێ الله تعالی لەبەر غیرەتی و گەورەیی غیرەتی خۆیی زینای حەرام كردوە حەزناكا بەندەكانی زینا بكەن .

(وَلَيس أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنْ اللهِ)وە هیچ كەسێك وەكو الله تعالی عوزری پێی خۆش نیە لەوانەیە كەسێك خراپەیەكت بەرامبەر بكا عوزریشت بۆ بهێنێتەوە لێی قبول نەكەی بەس الله تعالی قبولی دەكا لەهەموو كەسێك زیاتر جا لەو خالانەی كە باسمان كرد لەوشتانەی كە الله تعالی پێی خۆشە  ، ئەلێ هەر لەبەر ئەوەش كە عوزری پێی خۆشە هیچ كەسێك وەكو ئەو عوزری پێی خۆش نیە لەبەر ئەوەشە كیتابی ناردۆتە خوارەوە لەهەموو ئومەتەكاندا كە الله تعالی پێغەمبەرێكی ناردوە ئەفەرموویێ : كیتاب و پێغەمبەرانی ناردوە لەبەر ئەوەی كە بەخەلك بلێن هەتاوەكو خەلكەكە عوزری نەبێ بیان ترسێن و موژدەیان پێی بدەن (لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ)[٤٢٠] بۆ ئەوەی هیچ كەسێك عوزری نەمێنێتەوە لەلای الله تعالی لەرۆژی قیامەت بلێ   تۆ پێت نەوتم  الله تعالی پێغەمبەری نارد وە كیتابیشی نارد .

ئیمامی نەوەوی دەفەرموویێ : حەقیقەتی ئەم مەدح كردنەی كە ئێستا باسمان كرد مەسلەحەتەكەی بۆخۆت دەگەرێتەوە یانی كاتێك كەتۆ مەتحی الله تعالی دەكەی وە سوپاسی الله دەكەی الله تبارك وتعالی تۆیی خۆش دەوێی وە پلەت بەرزدەكاتەوە وەدەرەجاتت بەرزدەكاتەوە ئەخاتە بەهەشت و لێت خۆش دەبێ وە چەنێك مەتحی الله بكەی وە چەنێك وەسفی الله بكەی و خۆشت بوێی بۆخۆت باشە ئەگەرنا الله تعالی موحتاجی ئێمە نیە كەوا مەتحی بكەین ،چ موحتاجی ئێمەیە  هەموو كەون و كائینات زەمی بكا یان مەتحی بكا لەگەورەی الله تعالی كەم و زیاد ناكا هەموو ئینسانەكان وە هەموو جنۆكەكان هەموو مەلائیكەتەكان گەورەترین عیبادەتی بۆ بكەن ئەو زیاد ناكا وە ئەو گوناهانەشی كە لەسەر زەمیندا دەكرێی هەركەسێك ئەگەر بێتوو چەندەها گوناه هەیە بیكات و چەندەها ئاسمانیشی بدەرێی هەموو خەلكەكان وەكو یەك گوناه بكەن لەمولكی  و گەورەی الله تعالی كەم ناكاتەوە  .

[٤٢٠]: سورة النساء اية : ١٦٥

کەواتە نەکردنی گوناھ بۆخۆت باشە وە کردنی باشەش بۆخۆت باشە لەوانەیە ئەوەیە کەتۆ مەتحی الله تعالی بکەی .

ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێی (قِيقَةُ هَذَا مَصْلَحَةٍ لِلْعِبَادِ ، لِأَنَّهُمْ يُثْنُونَ عَلَيْهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى فَيُثِيبُهُمْ فَيَنْتَفِعُونَ)[٤٢١] مەصلەحەتەکەی بۆخۆت دەگەڕێتەوە چەنێك مەتحی الله تعالی بکەی ئێستا وەرنە سەر واقیع ئەو کەسانەی کە مەتحی هەر سولتەیەك دەکەن و پیاندا هەلدەلێن سەیر دەکەی خۆیی نزیك دەکاتەوە ولله مثل الأعلى خۆی خۆشە ویست دەکا لەبەر دەمی سولتە ئەچێتە پێشەوە بەو مەتحەکردنە وە سولتەش ئەوی خۆش دەوێی بەلاَم مەتحی نەکەی خۆشی ناوێی ولله مثل الأعلى ئەم مەتح کردنەی الله تعالی حەقە بەلاَم مەتح کردنی ئەوانەی کە لەواقیعدا ئەکرێن زۆر بەی ناحەقە  وە زۆربەی لەجێگای خۆشی دا نیە .

ابن القيم دەفەرمووێی (رەحمەتی الله لیَ بیَ)لەم حەدیسەدا کە باسی غیرەتی کرد دەفەرمووێی : ئەصلی غیرەت ئەوەیە کە قەبیح و پێت ناخۆش بیَ وە شتی خراپت پێی ناخۆش بیَ ، یانی ئەو نەفسەی کەوا شتی فاحیش و خراپەی پێی خۆش بیَ پیَ ئەلێن بیَ غیرەت هەمووتان ئەزانن حاشا رووتان ئەگەر کەسێك مال و منالی فسق و فجور بکا پێی ئەلێن ئینسانێکی بیَ غیرەتە بزانە غیرەتی لەسەر کچ و ژن و مندالەکانی نیە بەس ئەگەر پیَ ناخۆش بیَ شتی خراپ بکا ئەلێن ماشاء الله چەن بەغیرەتە .

جا ئەم حەدیسە ئەمەی کۆکردەوە (وبين محبة العذر الذي يوجب كمال العدل والرحمة والاحسان)لەلایەکیترەوە چی کۆکردەوە کە الله تعالی عوزری پێی خۆشە یانی کاتێك کە خراپەکان ئەکرێی غیرەتی هەیە الله تعالی بەلاَم کاتێك کە کەسەکە ئەگەڕێتەوە و عوزر ئەهێنێتەوە و ئەلیَ خوایە لێم خۆش بە غەلەتم کرد و بیَ عەقل بووم ئەوەشی پێی خۆشە الله تعالی ، کە ئەمە ئەو پەری کەمالی عەدل و موحیبەت و ئیحسان وچاکەکەردنی الله تعالی بۆ بەندەکانی دەردەخا (والله سبحانه مع شدة غيرته يحب إن يعتذر اليه عبده)[٤٢٢]لەگەل ئەوەدا کەشیدەتی هەیە الله تعالی لەغیرەت دا حەزیش دەکا بەندەکانی عوزری بۆ بهێنەوە وە داوای لێخۆشبوون بکەن ئینجا لێیان قبول دەکا ، وە هەروەهابەهەمان شێوەیەش الله تعالی پێغەمبەران و کیتابی ناردوە وەکو وتمان بۆ ئەوەی کەس ئیتر هیچ عوزرێکی نەمێنی بلێت والله من نەمزانیوە .

لێرەدا ئاماژە بەخالێکی زۆر گرینگ ئەدەین ئەویش ئەوەیە زانایان دەفەرموون : ئەو کەسەی بکەوێتە کوفر و شیرکەوە لێی قبول ناکرێی لەبەر ئەوەی الله تعالی پێغەمبەران و کیتابی ناردوە ئەوشتەی حەرام

[٤٢١] : من "شرح النووي على مسلم" (١٧/ ٧٧) .
[٤٢٢] : الجواب الكافي ج: ١ ص: ٤٣-٤٥

کردوه لەسەر هەموو کەسێك یانی رۆژی قیامەت کە تۆ دەچیتەوە لای الله تعالی بلێت والله نەمزانیوە ئەوە کوفرە یان شیرکە لێت قبول ناکرێی ئەلیٚ قورئان و پێغەمبەرم بۆ نەناردی بۆچی نەت خوێندەوە لەوقورئانەدا پڕ پڕ پڕە لەوەی کە بەتۆ ئەلێت نابیٚ شیرك بکەی (وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا)[٤٢٣] ئەبیٚ دیراسەی شیرك بکەی بزانی شیرك یانی چی و نەشی کەی ئەگەر کردت باقورئانیشت نەخوێندبێتەوە الله تعالی لێت قبول ناکا چونکە بۆی ناردووی ئەلیٚ من پێم راگەیاندی وە پێغەمبەرم بۆ ناردی هیچ عوزرت نەما .

هەروەها بەصەحیحی هاتووە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)کەفەرموویەتی : (إن من الغَيْرة ما يحب الله –عز وجل– ومنها ما يبغض الله –عز وجل–)غیرە هەیە الله تعالی پێی خۆشە وە غیرەش هەیە الله تعالی پێی خۆش نیە ، ئەمە لێرەدا غیرە کرا بەدووبەشەوە !

بۆنمونە ئەو غیرەیەی کە الله تعالی پێی خۆشە (فأما الغَيْرة التي يحب الله –عز وجل– فالغَيْرة في الريبة. وأما الغَيْرة التي يبغض الله –عز وجل– فالغَيْرة في غير ريبة)[٤٢٤]مانای ئەم حەدیسە سەیر بکەن زۆر جار بەکەسێك دەوترێی دل پیسە ئەم کەلیمەیە بەحەقیش دەوترێی وە بەناحەقیش دەوترێی .

کەی بەناحەق دەوترێی ؟ ئەوکاتەی کەوا مال و منالی خۆی بەپاك و تەمیزی رابگرێی و نەهێلیٚ تێکەلاوی و فسق و فجوریان لێی بوەشێتەوە ژن و کچ حەزدەکا بەرەلا بیٚ بەلاٚم ئەوحەزناکا پێی بلێن دلی پیسە ! نەخێر ،، تۆ لات دا لەرێگەی الله تعالی ئەو دلی پاکە ئەوغیرەتی هەیە ئەو خاوەنی غیرەتە تۆ خراپ دەکەی ئەی بۆ رێگەت بۆ بەرەلاٚ بکا بەکەیفی خۆت تێکەلاوی پیاو ژنان بکەی و زینا و فسق و فجور بکەی ئینجا لای تۆ ئەوە دلی پاکە !! ئا ئەم قسەیە لێرە هەلەیە کە دەلیٚ دل پیس و ناحەقە .

دل پیس کیٚ یە ؟ کە ئەلێن بەحەقیش ئەوترێی کەسێکی رێك و پێك ئافرەتێکی رێك و پێکە هیچ کێشەی نیە خۆیی داپۆشیوە و موحتەرم و رێك و پێکە پیاوەکەی گومانی شەیطاناوی بۆدێی و ئەلیٚ ئەبیٚ وانەبیٚ شەیطان بۆی دەهێنی شەیطان هیچیش نیە لەحەقیقەتدا یانی هیچ گومانێکی لیٚ ناکرێت ، ئافرەتێکی رێك و پێك شەو و رۆژ مراقەبەی دەکا هیچیش نیە ئەمە ئەم ئافرەتە رێك و پێکە و خاوەن دین و ئیمان و داوێن پاکە ئەم غیرەتە الله تعالی رقی لیٚ یەتی .

نمونەیان هێناوەتەوە زانایان بە شتێکیتر بۆنمونە سەیر دەکەی ئەگەر بێتوو ژنی یان کچی ئیشی خراپ بکەن ئەبیٚ غیرەتی هەبیٚ ئەم غیرەتە الله تعالی پێی خۆشە نابیٚ بەرەلایان بکەی ، بەلاٚم ئەی

[٤٢٣] :سورة النساء اية : ٣٦
[٤٢٤] :رواه ابو داود :٢٩٠٤

ئەگەر هاتوو دایکی شووی کردەوە پێی ناخۆش بێ باوکە زرەکەی لەگەل دایکدا بێ ئەلێن غیرەتی هەیە ئەمە غیرەت نیە بەلکو الله تعالی حەلالی کردوە یان پێی ناخۆشە زاواکەی لەگەل کچەکەیدا بێ ئاخر بۆ پێت ناخۆشە الله تعالی حەلالی کردوە ئەمە غیرەت نیە یاخود خوشکەکەی داوە بەشو پێی ناخۆشە لەگەل زاواکەی بێ ئاخر ئەمانە غیرەت نین الله تعالی ئەوانەی حەلال کردوە لەحەلالەکان غیرەت مەکەن لەحەرامەکان غیرەت بکەن ، ئەمەیە دوو جۆرە غیرەتەکە .

جا ئەلی ئەو کەسەی غیرەتی هەبێ لەگەل جیاوازیەکی زۆردا ئەوکەسە موافەقەی ئەو سیفەتەی الله تعالی کردوە چونکە الله تعالی پێی خۆشە ، هەرکەسێك موافەقەی هەرسیفەتێك بکا لەسیفەتەکانی الله تعالی بەپێی توانای خۆیی پێی خۆشە .

بۆنمونە الله تعالی رەحیمە ئەو کەسەشی خۆش دەوێی کە رەحمەتی هەبێ ، هەرکەسێك رەحمەت و بەزەیی هەبێ لەجێگای خۆیدا بەکاری بێنی الله تعالی خۆشی دەوێی ، لەبەر ئەوەی موافەقەی سیفەتی رەحمەتی الله تعالی کردوە ، یان کەسێك کەوا سەخی بێ و دەست کراوە بێ بۆ خزمەت کردنی میوان و کەس و کار بەواتایەی رەزیل و چروك نەبێ الله تعالی ئەوسیفەتەی پێی خۆشە لەبەر ئەوەی الله تعالی خۆیی کەریمە ، کەسێك عالم بێ الله تعالی خۆشی دەوێی لەبەر ئەوەی الله تعالی خۆی علیمە ، کەسێك قەویی و بەهێز وئازابێ الله تعالی پێی خۆشە لەبەر ئەوەی الله تعالی خاوەنی قوەتە ، کەسێك ئەگەر بێتوو زەعیف بێ الله تعالی پێی خۆش نیە چونکە الله تعالی زەعیف نیە بەلاّم ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئەگەر بلێن خۆی زەعفی هەبێ بێ تاوانی هەبێ الله تعالی خۆشی ناوێی نەخێر بەلاّم تۆ بیستووتە لەفەرموودەکە کە ئیمانداری بەهێز لەلای الله تعالی خۆشەویستر و لەپێشترە لە ئیمانداری زەعیف لەهەمووشیاندا هەر خێر هەیە .

یاخود الله تعالی خاوەنی حەیایە ئەو کەسەی خۆش دەوێی کە حەیایی هەبێ بێ حەیایی خۆش ناوێی ، الله تعالی جوانە وە جوانیشی خۆش دەوێی ، الله تعالی ویترە ئەهلی ویتری خۆش دەوێی ئەوانەی کەوا شەو نوێژ دەکەن بەم شێوازانە.

*یەکێکیتر لەو سیفەتانەی کە الله تعالی خۆشی دەوێی .

إبن عباس (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ) دەفەرمووێی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : هیچ رۆژێك نیە وەکو رۆژەکانی دەی ذي الحجة واتا لەیەکەوە هەوتاوەکو نۆ عەمەلی صالح تێدا ئەوەندە خێر بێ هەتا وتیان ئەگەر جیهادیش بکا ؟ وتی : ئەگەر جیهادیش بکا .

ئەمە ئەوشتانەیە کە باسی دەکەین کە دەفەرمووێی : لای الله تعالی زۆر خۆشەویستە ئەورۆژانەش دێن گەرتەمەنمان هەبێ ان شاء الله ئەو رۆژانە ئەگەر ئینسان بەعیبادەت بیباتەسەر الله تعالی زۆری پێی خۆشە لەجیهاد کردن زیاتری پێی خۆشە مەگەر کەسێك بروا و سەرو مالی نیەتەوە .

هەروەها دەفەرمووێی مالك ی کوری یخامر وتویەتی موعاذی کروی جەبەل (رەزا و رەحمەتی الله تعالی یان لێ بێ )وتویەتی : پێی وتون : ئاخیر کەلامێك کەوا من لەپێغەمبەرم گوێی لێ بوە (صلی الله علیه وسلم)بەجێم هێشتووە کە گوێم لێبوە وتویەتی فەرموویەتی : پێمان وت باشترین و خۆشەویسترین عەمەل لای الله تعالی چیە ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (أن تموتَ ولسانك رَطْبٌ من ذكرِ الله)[٤٢٥] کاتێك کە ئەمری زمانت پارا و بێ بەزیکری الله تعالی ، یانی تۆ نازانی کەی دەمریی بەبەردەوام زمانت بەزیکری الله وە بێ ئەمە خۆشەویسترین عەمالە لەلای الله تعالی . چونکە یادی الله بەبەردەوام بەئاگات دەهێنێتەوە قەبر و قیامەت و بەهەشت و جەهەنەمت بیر دەهێنێتەوە بەس شتەکانی تر کە یادی الله نیە پەنادەگرین بە الله ئەتبەستێتەوە بەو شتەی کە تۆ باسی دەکەی هەرشتێك تۆ یادی بکەی و باسی بکەی لەگەل ئەودا نزیکی بۆیە لەحەدیسدا هاتووە ئەلێ : (المَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ)[٤٢٦] کێت خۆش بوێی لەگەل ئەدایی ، ئیتر شەیطانت خۆشبوێی برۆ لەگەل شەیطان بە چاکەکارانت خۆش دەوێی لەگەل ئەواندای خراپەکارانت خۆش دەوێی لەگەل خراپەکاراندایی لەرۆژی قیامەت لەگەل ئەوانەدایی ، الله و پێغەمبەری خوات (صلی الله علیه وسلم)ت خۆش بوێی لەرۆژی قیامەت ئەوە مەنزیلەکەت دەبێ لەژێر سێبەری عەرشی الله تعالی دا دەبی .

پیاوێك دێی بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئەلی هاتم بۆلای پێم وت ئەویش لەگەل صەحابەکانی دانیشتبوو (فقلت: أنت الذي تزعم أنك رسول الله؟)وتی پێم وت تۆی کە ئەلێ رسولی خوام ؟(قال نعم) وتی بەلێ منم کە ئەلێم رسولی الله م الله تعالی منی کردوە بە پێغەمبەر .
جا با لێرەدا هەلوێستەیەك بکەین ئەزانن ئەم إبتلا یە چەنێك قورسە تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت ئێستا کەسێك بلێ من پێغەمبەری خوام چەند کەس بروای پێ دەکا ئەی چەن کەس بروای پێ ناکا !زۆر قورسە ئەم ئیشە ئی پێغەمبەر وابوو (صلی الله علیه وسلم) لەناو قوریشدا وتویەتی من پێغەمبەری خوام زۆر بەی زۆری بروایان پێنەکردوە و گالتەیان پێی کردوە وتویانە تۆ شێتی !پێغەمبەری چی و شتی چی نەك لەبەر

[٤٢٥] : صحيح: رواه ابن حبان (٨١٨)، وصححه الألباني.
[٤٢٦] : روى البخاري (٦١٦٩) ، ومسلم (٢٦٤٠) عن عَبْد اللَّهِ بْن مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

ئەوەی بروایان بە پێغەمبەرایەتی نەبوبێ ئاگاداربن بروایان بە ئیبراهیم هەبوو کە پێغەمبەر بو وە بروایان بە إسماعیل هەبوو ئەبو جەهل و دارو دەستەکەی هەر هەموویان بروایان بەخوا و بە کەعبە هەبوو خزمەتی کەعبەیان دەکرد دەیانزانی کەوا ئیبراهیم کەعبەی دروست کردوە یانی کەسانێکی مولیحد نەبوونە کەوا بلێن خوا و پێغەمبەر و دین نیە ! نا بەس لەوکاتەدا پێغەمبەرێك دەردەکەوێی کەسێك لەناو خۆیاندا ئەلێ من پێغەمبەرم بەلایانەوە زۆر قورسە وەکو ئێستا حالیا کەسێك بەرزبێتەوە بلێ من پێغەمبەرم !خەلك چی پێ دەلێ ؟ پرسیارێك دەکەین با نەلێن پێغەمبەر کەسێك ئێستا بەرزبێتەوە بلێ من محمدی مهدیم خەلك گالتەی پێ ناکا زۆربەی زۆری ئەوهایە ، بەو واتایەی ئەو وەزیفەیەزۆر قورسە لەکاتێکدا کە الله تعالی کەسێك دەکا بە پێغەمبەر ئەچێتە ناو ئەو خەلکە پێیان بلێ من پێغەمبەرم خوا وای وتوە زۆر قورس دەکەوێی لەسەری زۆربەی خەلك پێ دەلێ تۆ درۆزنی تۆ شێتی بەلاَم الله تعالی هیدایەتی کەسێك دەدا کەوا شوێنی دەکەوێی لە مەجموعەیەکی کەم .

جا ئەم کەسە دێی پێی دەلێ تۆی ئەلێ من پێغەمبەرم؟ وتی بەلێ ، (قال: قلت: یا رسول الله! أي الأعمال أحب إلى الله؟)دیارە کەسکە تەسلیم دەبێ و پێ دەلێ : خۆشەویسترین عەمەل چیە لەلای پەروەردگار (قال:"الإیمان بالله".)ئەوەیە کە ئیمانت بە الله هەبێ ، یانی بەتەنها ئەو بپەرستی لەدلەکەتدا تەنها الله تێدا بێ وە ئیمانت پێی هەبێ وەعەمەلی قەلبیت هەبێ تصدیقی الله بکەی لەدلتدا لەدلتدا الله ت خۆش بوێی وە رجای الله ت هەبێ وە لە الله بترسی تەوەکولی لەسەر بکەی هەتا دوای ئەعمالەکانیتری پاشان بەزمانیش شایەتی بدەی کە ئەو الله ی تۆیە وە ئەو پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری تۆیە پاشان بەعەمەلیش بیسەلمێنی نوێژ و زەکات ورۆ ژو و حەج و ئەوانیتر بکەی ئەمە ئیمانە ئیمان تەنها بەدەم نیە وە تەنها بەدلیش نیە ئاگداربە بەلکو بەهەرسێکیانە ئەبێ هەرسێکیان بخەیتە پال یەکتریی .
وتی ئیمان بە الله تعالی . وتی دوایی ئەوە ؟ (قال:"ثم صلة الرحم".)فەرمووی ؛ سیلەی رەحم ، بەس ئاگاداری سیلەی رەحم بن بزانین ئەمرۆ سیلەی رەحم چی لێهاتوە .
سیلەی رەحم یانی گەیاندنی خۆشەویستی نێوانی خزمان وە نابێ بیپچرێنی الله تعالی لەقورئاندا یەك لە گەورەترین هۆکارەکانی پچراندنی سیلەی رەحم بەکوفر دائەنێ ئەلێ کوفر وا ئەکا کە سیلەی رەحم بچرێی بۆیە بەخەلکی دەلێ کافر مەبە با قەطعی سیلەی رەحم نەکەی واتا ئەگەر کەسێکی کافر لەخزم و کەس و کارت رێگەی کوفری هەلبژارد من قەطعم کرد ئەوە من قەطعم نەکردوە ئەو قەطعی کردوە کە کافریەتیەکەی هەلبژاردوە.

زۆر كەس پرسيارمان لێ دەكا حوكمی ئەوە چيە بچم بۆ مالی كەسێك نمونە جوێن بە الله وبە پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم) دەدا وە ئەويش خزم و كەس و كارە ئەو سيلەی رەحمە ببەستم يان نا ؟

وەلام : تۆ داوای لێ بكە با پاشگەز بێتەوە لەو كوفرەی ئەگەر پاشگەز نەبوويەوە لەبەر خاتری الله تعالی من رقم لێ يەتی وە قەطعشی دەكەی مادەم زەرەت پێ بگەيەنی نارەحەتت بكا ئەرێی والله قەطعی دەكەی كێ بووە هۆكاری ئەم قەطعە؟ يانی معقولە من دانيشتووم جوێن بە خوا و بە پێغەمبەرم بدا بلێم قەينا با سيلەی رەحمی لەگەل ببەستم كێشە نيە ، سيلەی رەحم لەنێوان موسلمانان و خۆشەويستان و برواداران لەسەر دوينا لەسەر پارە و لەسەر يەكتر برەنجێنن ئەوە تاوانە ئەمرۆ بەراستی لەسەر الله هيچ كێشە نيە كەس كەس نارەنجێنێ لەسەر الله بەس لەسەر پارە و پول ئەری والله ئەی رەنجێنن ، لەكاتی معامەلەكردندا دەرەنجێن و پێك نايەن هەمووشی لەدونياو پارەيە لەسەر هەموو جۆرە كێشەيەكی دونياوی قەطعی سيلەی رەحمی كردوە لەگەل يەكتری ئەمە جائيز نيە لەسێ رۆژ زياتر تۆ قەطعی سيلەی رەحمی هيچ خۆشەويستێكت بكەی مادەم لەسەر دونيا بێ وە گوناهباريش دەبن كێشەی خۆتانە بۆيە لە

جەژناندا هەموو جارێك دەوترێی گەردنی يەكتری ئازاد كەن بگەرێنەوە بۆلای يەكتری ئەوانەی لەسەر دونيا يەكتريان رەنجاندوە بەلأم لەسەر دين نا ، كەسەكە جوێنی بەخوادا بەلأم مولحيد و كافرە بلێم گەردەنم ئازاكە نەوالله قەت وای پێ نالێم ناكری و نابێ ئەبێ تۆ بەرائەتی لێ بكەی .

دواتر فەرمووی : چيتر ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم)؟ (قال:"ثم الأمر بالمعروف، والنهي عن المنكر".)ئەمر بەچاكە كردن و نەهی كردن لەخراپە لەلای خوا زۆر خۆشەويستە ، ئەمرۆ جورئەت نەماوە ئەوە ئيمامی نەوەوی لەكاتەكانی خۆيدا وادەلێ ئەلێ لەكاتێكدا كە شەرحی ئەم حەديسانەمان بۆ دەكا ئەلێ : ئالەم زەمانە كا ئەمر بە مەعروف و نەهی لەمنكر ماوە ، لەوكاتەدا وا دەلێ كە سالی ٥٠٠ بۆ ٦٠٠ كانی هيجری بووە حيسابی بۆبكەی چەن سال لەمەو پێش نزيكەی ٩٠٠ سالێ لەمەو پێش وا ئەلێ ئەی ئێستا ئەگەر مابايە ئەبوايە چی وتبا ئەمر بەچاكەكەردن و نەهی كردن لەخراپە كوا مايە ئەلێن وسبە كاكە بێ دەنگ بە هەمووی بێ دەنگ دەبێ و ئيشەكەش ئاوا دەروا .

ئينجا فەرموويی : ئەی چی لەلای الله تعالی زۆر زۆر ناخۆشە و خراپە و الله رقی لێ يەتی ؟فەرمووی (الأشراك بالله")شيرك ، شەيرك پەياكردن و كوفر لەلای الله لەهەموو شتێك زياتر رقی لێ يەتی .

ئينجا فەرمووی : چيتر ؟ (ثم قطيعة الرحم)خۆشەويستی خزم و كەس وكاری ئيماندار بپچرێنی .

ئینجا فەرمووی : چیتر ؟ (قال: «ثم الأمر بالمنكر والنهي عن المعروف»)[٤٢٧] ئەمر بکەی بە منکر و نەهی بکەی لە مەعروف و چاکە ، وەکو ئەمڕۆ ئێستا ئەوشتانەی کە دەکرێی زۆربەی وایە . شیرکێکی زۆر ئەکرێی وە خۆشەویستی نێوان خزمان زۆری پچراوە وە ئەمریش بە منکر دەکرێی وە نەهی لەمعروفیش دەکرێی بەڵآم نەهی لەمنکر ناکرێی .

پەوبان خزمەت کاری پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم) بینیم پێم وت : پێم بڵیّ عەمەلێك کە بمخاتە بەهەشتەوە یاخود خۆشەویسترین عەمەل لەلای الله تعالى چیە وتی پرسیارم لیّ کرد بیّ دەنگ بوو سیّ جار دووبارەم کردەوە بیّ دەنگ بوو دواتر ئەلیّ : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێکراوە دەربارەی ئەمە فەرموویەتی : (عليكَ بِكَثْرةِ السُّجُود، فإنَّك لَنْ تَسْجُد للَّهِ سجْدةً إلاَّ رفَعكَ اللَّهُ بهَا دَرجَةً، وحطَّ عنْكَ بِهَا خَطِيئَةً)[٤٢٨] زۆر سوجدە بردنە بۆ الله تعالى هیچ سوجدەیەك نابەی بۆ الله تعالى إلا چاکەیەکت بۆ دەنوسرێی وە گوناهێکیشت ڕەش دەبێتەوە بۆیە سەجدە زۆر بەرن بەتایبەتی شەوانی قەدر شەو نوێژ بکەن ، ئەلیّ داواتر لە أبو دردام پرسی هەمان پرسیار  هەمان وەلآمی دامەوە وتی ئەوها بکە .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەسێك لێی دەپرسیّ ئەلیّ حەزدەکەم هاورێت بم لەبەهەشت دا فەرمووی : دەی سەجدە زۆر بەرە تا هاورێم بیّ لەبەهەشتەوە ئەوەی حەز لەهاورێیەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکا لەبەهەشت لەگەلیا بیّ با سەجدە زۆر بەرێی و نوێژ زۆر بکا .

## الله تعالى کیّ خۆش دەویّ

باسی ئەو کەسانە دەکەین کە الله تعالى لەقورئانی پیرۆزدا باسی ئەو کەسانە دەکا کەوا ئەوانی خۆش دەوێی واتا الله تعالى کیّ خۆش دەوێی ، تەبعەن لەقورئان و لەحەدیثی صەحیح دا هاتووە کە الله تعالى فلان و فلانی خۆش دەوێی بە سیفەتەکەی کە سیفەتەکە مەوسوفە لەبەر ئەوەی ئەم سیفەتەی تێدایە خۆشی دەوێی الله تعالى ، هەروەکو چۆن دەفەرموێی : (وَأَحْسِنُوا ۛ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)[٤٢٩]

[٤٢٧] : جامع الآحاديث و الآثار التي خرجها وحكم عليها الألباني١-٢ – ١ص٥٦٥ رقم الحديث : ١٤٦٧
[٤٢٨] :رواه مسلم
[٤٢٩] :سورة البقرة اية : ١٩٥

لەم ئایەتانەدا ئیسپاتی سیفەتی محەبەتە بۆ الله تعالی کە الله تعالی خۆشە ویستی هەیە بۆ ئەم جۆرە کەسانە .

جا لەقورئانی پیرۆز کە کاتێك ئەیخوێنەوە خۆتان سەیری بکەن بزانن چەند ئایەتمان هەیە کە الله تعالی دەفەرمووێ (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ) الله تعالی بەراستی فلانی خۆش دەوێ هەول بدەین هەر هەموومان خۆمان بکەین بەوکەسانە تا الله تعالی ئێمەی خۆش بوێ وەکو فەرمووێ : (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) ، (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ)[430] (وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ)[431]( إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ا)[432] هەروەها دەفەرمووێ: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)[433] (فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ)[434] چەندەها جار الله تعالی لەقورئاندا دووبارە و تیکراری دەکاتەوە ، الله تعالی فلانی خۆش دەوێ ! پێویستە ئینسانی موسلمان ئەمە بخاتە بەرچاو و گوێی خۆیی بەدل وەربیگرێ خۆی بکا بەو کەسانە تاوەکو الله تعالی خۆشی بویی .

پێشەکی بۆ ئەم بابەتە :

دەفەرمووێ : (إن الله تعالى يحب اسمه وصفات ويحب المتعبدين له به التصفين باثار صيفاته) پێش هەموو شتێك الله تعالی ناو و سیفاتەکانی خۆی زۆر زۆر خۆش دەوێ حەزیش دەکا کە موسلمانان بەو سیفەتانە خۆیان وەصف بکەن ئەوەی کە شایستەیانە بەس هەندێك ناو هەیە و هەندێك سیفەت هەیە شایستەی بەندەکان نیە نابیّ خۆیان بەو سیفەتانە متەصەف کەن یانی خۆیان بەو سیفەتانەی کە تەنها بۆ الله تعالی لایەقە وەکو تەکبور وەکو عظمة وەکو جبروت ئەمە نابیّ تۆبلیّ مادەم الله تعالی متكبرە منیش متكبير بم ،

بۆنمونە الله تعالی علیمە تۆش هەولدە عەلیم بی الله تعالی رەحیمە تۆش هەولدە رەحیم بی یانی زانا بە بەسۆز بە میهرەبان بە ئەمانە سیفاتی جوانن لەبەندەدا وە لەالله تعالی دا بەلاّم سیفات هەیە تەنها بۆ الله تعالی یە وەکو تکبر جبروت و عظمة نابیّ کەسیتر ئەمەی تێدا بیّ ، هەتاوەکو ناو هەندێی ناو هەیە تۆ نابیّ کە ناوی الله یە ناوی خۆتی لێی بنێی یاخود لەمندالەکەت بنێی وەکو (الله)وەکو (رحمان) إلا دەبیّ بلێت

[430] سورة البقرة اية : ٢٢٢
[431] : سورة ال عمران اية : ١٤٦
[432] :سورة ال عمران اية : ١٥٩
[433] :سورة الحجرات اية : ٩
[434] :سورة ال عمران اية : ٧٦

عبدالله یان عبدالرحمن ، نابێ بلێ مندالەکەم ناوی (الله)یە یان ناوی (رحمان)ە، هەندێك سیفات هەن یاخود کەلیمەی متکبر ئەبێ مندالەکەت ناو بینێی متکبیر ؟! خۆ ناوی الله شە ! نابێ لەبەر ئەوەی ئەمە تەنها پەیوەست و تایبەت مەندە بە الله تعالی وە وە هەر کەسێك خۆی لەسیفەت و ناوەوە بشوبهێنی بەو ناوانەوە ئەبێتە جێگەی رقی الله تعالی ئەوکاتە چونکە الله تعالی خوا شایستەی ئەم ناوانەیە بەس ناوەکان و سیفەتەکانی تر زۆربەی ئی الله تعالی پێویستە ئێمە سەیریان بکەین ئێمەش ئەو سیفەتانەمان تێدا هەبێ بۆ ئەوەی تعبود و بەندایەتی پێوە بکەین وەکو وتم الله رەحمانە الله رەحیمە تۆ ئەبێ سیفەتی رەحمەتت تێدا هەبێ الله تعالی علمیە ئەبێ سیفەتی عیلمت تێدا هەبێ بۆ ئەوەی عەلیم و زانا بی الله تعالی حەلیمە ئەبێ سیفەتی حیلمت تێدا هەبێ ئەمانە الله تعالی پێی خۆشە بۆیە ئەلێ لەهەموو شتێك زیاتر الله تعالی ئەمانەی پێی خۆشە کە لەقورئاندا فەرموویەتی : (**وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا**)[٤٣٥] الله تعالی ناوی جوانی هەیە تۆ بەم ناوانە بەندایەتی بکە داوای لێ بکە بەالله تعالی بەم ناوانە داوای لێ بکە وە وەصف و سەنای الله بەم ناوانە بکە وە بیکە بەوەسیلەت لەپێش دوعاکانت .

الله تعالی لەقورئاندا دەفەرموێ : الله تعالی ناوی جوانی هەیە تۆ داوای پێی بکە ، بەلآم سەیر ئەکەی بەندەکان بەداخەوە دێنەوە بۆلای عەبدەکان ناچن بۆلای خوای بەندەکان ئەلێ یا الله بۆ خاتری فلان و فلان و فلان !! الله تعالی نالێ بۆ خاتری فلان کەس بەلکو ئەلێ بۆخاتری ناوەجوانەکانی خۆیی ئاگاتان لەمانە بێ !.

أبن القیم ئەفەرمووێ : (ویحب من یسأله ویدعوا بها ویحب من یعرفها ویعقلوها ویثنی علیه بها ویمدحه بها )[٤٣٦] الله تعالی ئەوکەسانەی زۆر زۆر خۆش دەوێ کە شارەزای ناوەکانی ئەون وە بەم ناوانە عیبادەت دەکەن بۆ الله تعالی وە حەقی ئەم ناوانە ئەدەن جاریکیتر دەیلێنەوە لەحەدیسی صەحیح هاتووە فەرموویەتی : الله تعالی ٩٩ ناوی هەیە هەرکەسێك بیژمێرێت ئەچێتە بەهەشت ژماردنی ئەم ناوانە بریتیە:

یەکەم ئەوەیە کەوا لەبەریان بکەی و بیان ژمێریت و وە بیان ناسی بەلآم لەقورئان و حەدیسی صەحیح .

دووەم : ماناکانی بزانی .

سێ یەم: داوا بکەی لە خوای تعالی بەم ناوانە و حەقی ئەم ناوانە بدەیی .

وە بزانی کاتێك کە الله تبارك وتعالی حەلیمە خۆت بێ ئاوات و بێ هیوا نەکەی لەرەحمەتی الله تعالی بلێ والله قەت خوا رەحمم پێ ناکا خوا حەلیمە ! یاخود کە رەحمان و رەحیمە بزانی رەحمەتی هەیە لەهەمان

[٤٣٥]:سورة الأعراف اية : ١٨٠

[٤٣٦] : طريق الهجرتين وباب السعادتين ،،،ص:١٢٩

کاتدا کە غەزەبی هەیە اللە تعالی ئینتقامی هەیە اللە تعالی تۆلەی هەیە  ئەبێ بترسی لێی ئەبێ حەق بدەی بەم ناوانە بەهەمووی .

عبداللە کوری مسعود (رەزا و رەحمەتی اللە تعالی لێ بێ )فەرموویەتی کە پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) فەرموویەتی : هیچ کەسێك وەکو اللە تعالی مەتحی پێی خۆش نیە ،کەئەم مەتحەش بە قازانجی خۆمان دەگەرێتەوە کە مەتحی اللە تعالی پێ بکەین تۆ مەتحی اللە تعالی بکە بەو ناوانە بۆقازانجی خۆت ئەگەرێتەوە ، جا اللە تعالی جەمیلە و جەمالی پێی خۆشە عەفوە و عەفوی پێی خۆشە کەریمە و کەرەمی پێی خۆشە عەلیمە و ئەهلی عیلمی خۆش دەوێی ویترە و ئەهلی ویتری خۆش دەوێی قوەییە و موسلمانی بەهێزی خۆش دەوێی . وە رەحیمە ئەوانەی رەحمیان هەیە اللە تعالی خۆشیان دەوێن وە اللە تعالی بەخشندەیە و بەخشندەکانی خۆش دەوێی وە عدلە و ئەهلی عدلی خۆش دەوێی ئەهلی جور و زولم و ستەمی خۆش ناوێی ئەوانەی کار بەدەستن ئەگەر عەدالەت نەنوێنن اللە تعالی خۆشی ناوێن ئەگەر عەدالەت بنوێنن اللە تعالی خۆشی دەوێن اللە تعالی شەرمی هەیە و ستر دەکا وە شەرم و حەیا و ستری پێ خۆشە هتد....،،،،

باسی ئەو ئایەتانە دەکەین کە اللە تعالی باسی ئەوکەسانە دەکا کەوا خۆشیان دەوێن :

*قال اللە تعالی (وَأَحْسِنُوا ۛ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)[٤٣٧] اللە تعالی بەئێمە دەفەرمووێی : چاکە بکەن اللە تعالی چاکەی پێی خۆشە ، هەمووتان ئەزانن لەدێنەکەتان کاتێك کە جوبرایل (علیە السلام) لێی پرسی پێم بلێ ئیسلام و ئیمان و ئیحسان چیە؟ زۆربەتان بیستوتانە بەلاٚم ئێمە باسی ئیحسانەکە دەکەین ، جوبرایل فەرمووی: ئیحسان چیە ؟ پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم)فەرمووی : (أن تعبد اللە كأنك تراه، فإن لم تكن تراه فإنه يراك)[٤٣٨] ئەمە دەرەجەی ئیحسانە .

واتا: ئیحسان ئەوەیە کە تۆ اللە بپەرستی وەکو ئەوە وایە کە تۆ خوا ببینیت ! ئەگەر تۆ اللە ببینی چۆن عیبادەتەکە دەکەیت ؟وەرن با ئێستا ئێمە شعورمان هەبێ کە خوا دەبینین بەچاوی خۆمان ، نمونەیەکی زۆر جوانی باس کردوە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)ئەتگەیەنێتە ناو کرۆکی عیبادەت ، ئەگەر تۆ خوا ببینی چۆن عیبادەت دەکەی ؟! نوێژەکەت چۆن دەکەی ؟!بەپەلە پەل ! !عیبادەتەکانت تەنها بۆ ئەو

[٤٣٧] :سورة البقرة اية : ١٩٥
[٤٣٨] : صحيح المسلم

ناکەی ! ڕوودەکەیتە غەیری ئەو !؟ جا کە تۆ خوا نابینی بەئەکیدیش لەدونیا خوا نابینی ئەفەرموویێ : (فإنه يراك)[٤٣٩] بەس ئەو تۆ ئەبینی !

کەواتە دەرەجەی ئیحسان دوو خالە ئەبێ ئاگاداربین :

١-وا هەست کەی کەتۆ الله دەبینی کە ئەو عیبادەتە دەکەیت ، دە هەر کەسێکمان ئەو هەست و شعورەی هەبێ هەموو خەلکی لەبیر دەچێتەوە کێی هەیە لەئاستی الله تۆ بیخوێنیتەوە بەس پێم بلێن ؟!ئەگەر تۆ الله ببینی ! ئێستا الله تعالی ئاسمان شەق بکا و خۆیمان نیشان بدا ئاور ئەدەیتەوە بۆلای کەسیتردا ؟!نەخێر ئاور بەلای هیچ کەسێك نادەیتەوە بەس الله چاوی تێدەبریت و عیبادەتەکانت هەمووی بۆ ئەو دەکەی ئەلێ دەبێ ئەوها بکەی ئەمە گەورەترین پلەی ئیمان و عیبادەتە بۆیە یەکەمجار لەحەدیسەکە ئیسلامی باس کرد ئینجا ئیمان ئینجا ئیحسان .

سەیربکەن ئیسلام بازنەیەکی گەورە گەورەیە ڕەنگە کەسێك لەناو کوفر دێتە ناو ئیسلام بە ظاهر ئەبێ بەموسلمان بەس دڵەکەی ئیمانی تێ نەچووە لەناو ئەو دائیرەیەشدا دائیرەیەکیترمان هەیە پێی دەوترێ ئیمان ئەمە ئەو کەسەیە کە ئیمان چۆتە دڵیەوە ، یانی کەسمان هەیە مونافیقە بە ظاهری نوێژ دەکەن بەس ئیمان لەدڵیاندا نیە ئەوە ئیسلام ئەیان گرێتەوە بەس ناچنە ناو دائیرەی ئیمانەوە لەناو دائیرەی ئیمانیش کەسانێك هەن دائیرەیەکی بچوکتریش هەیە پێی دەوترێ ئیحسان کەسەکە برواداڕە بەس دەرەجەی ئیحسانی بەو شێوەیە نیە کە عیبادەت بکا وەکو ئەوەی الله تعالی ببینی ئیمانی هەیە بەس ئیمانەکەی لاوازە ، کەواتە ئەو دائیرەی ناو ئیمان کە پێی دەوترێ ئیحسان گەورەترین پلەی عیبادەتە لەلای الله تعالی .

٢-گەرنا ئەو تۆ ئەبینی .

بۆیە کەلیمەی المحسن یانی موسلمانیشە و ئیمانداریشە و محسینیشە یانی لەو پەری دەرەجەی عبودیەت دایە ئینجا لێرەدا الله تعالی دەفەرموویێ : (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)[٤٤٠] الله تعالی ئا ئەوانەی خۆش دەوێ چونکە ڕاست دەکەن ، موسلمانە بەس درۆ دەکا ! بەظاهر الله تعالی خۆشی ناوێ ڕاستە لەلای ئێمە حوکمی ئیسلامی ئەدرێ بەسەردا لەبەر ئەوەی کەوا ئیسلامەکەی ئیظهار کردوە بەس لای الله تعالی دڵەکەی ئەزانێ چی تێدایە بۆیە خۆشی ناوێ منافقە .

[٤٣٩] : صحيح المسلم
[٤٤٠] :سورة البقرة اية : ١٩٥

ياخود ئيمانداره بەلاّم نەگەيشتۆتە دەرەجەی ئيسحان الله تعالی ئيمانداری خۆش دەوێی بەس محسينی زياتر خۆش دەوێی ! لەبەر ئەوەی محسين دەرجەكەی بەرزترە لە ئيماندار، بۆيە لەئايەتەكە دەفەرموويّی ( **وَأَحْسِنُوا**)چاكە بكەن و بۆ الله تعالی ئەنجام بدەن وە شەريك پەيا مەكەن (**إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ**) الله تعالی چاكەكارانی خۆش دەوێی .

*قال الله تعالی (**إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ**)[٤٤١] سەيری ئەم ئايەتە بكەن ئەم ئايەتە باس لەوە دەكا كە كەسێك كە گوناه دەكا و ئەگەرێتەوە الله تعالی ئەو كەسەی خۆش دەوێی ، شەيطان دێت لێرەدا شتێك دروست دەكا وەس وەسەی بۆ دەكا ئەلیّ تۆ ئەوەت كرد الله تعالی تۆی خۆش ناوێی ! ئەها درۆ دەكا كەچی الله تعالی وا نالیّ بەلكو دەفەرموويّی : (**إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ**) .

بابزانين (التواب)كیّ يە ؟ :

تەوبە لەگوناه دەكرێی كەواتە گوناهەكەی كردوە ئينجا ئەگەرێتەوە ئەلیّ خوايە بەراستی من هەلەم كرد بەراستی بیّ ئاگابووم لە گەورەيی تۆ لەو كاتەی تاوانم كرد تخوا لێم خۆشبە !بەس بە دلّ ئەگەرێتەوە بەراستی نەك حاشا لە خوێنەران درۆبكا ، درۆ و دەلەسە لەگەل الله تعالی ناكرێی هەمووومان كەوتوينەتە گوناه هەمووشمان إن شاء الله بە ئيزنی الله تعالی ئەوەی كە الله تعالی پێی رەوابينی بیّ خوای خۆش دەوێی ئەيەوێی بگەرێتەوە لەكاتی تەوبە و گريانەكەدا يەكسەر دەلیّ خوايە بەراستی لەكاتی گوناهەكە گەورەی و عەزەمەتی تۆم لەبەر چاودا نەبوو تخوا لێم خۆشبە !! جا الله تعالی ئەو كەسەی خۆش دەويی .

پاشان دەفەرموويّی : (**وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ**)[٤٤٢] ئەوانەی خۆيان خاوێن دەكەنەوە بەهەردوو ماناكەی خاوێنی مادی و مەعنەويی .

دلّيان خاوێن دەكەنەوە لەگوناه و لەهەرچی شتە خراپەكانی كە لەدلّدا كۆدەبێتەوە لەحەسەد و لەقين و لەرق و ئەوجۆرانە بەرامبەر بە موسلمانان وە هەروەها لەگەورەترين شت كە شيرك و كوفر و نيفاقە وە ظاهيری خۆشيان لە پيس و پۆخەليەكان پاك ئەكەنەوە.

كەواتە ئەبیّ ناوەوە و دەرەوەت هەردووكی خاوێن كەويتەوە ئينجا الله تعالی تۆيی خۆش دەوێی ، گرينگی زياتر بە ناوەوەيە پاشان دەرەوە ، ئەوەتا نوێژەكانمان بەجلی پيسەوە ئەبیّ !؟ نابیّ ئەوەتا

[٤٤١] :سورة البقرة اية : ٢٢٢
[٤٤٢] :سورة البقرة اية : ٢٢٢

دەست نوێژت هەیە ئەوە غوسلی جەنابەتت هەیە بۆ نمونە ئەبێ ئەمانە بکەی ئینجا الله تعالی تۆی خۆش دەوێی .

ئەو دەست نوێژە گوناهت لادەبا ، لەحەدیسی دەست و نوێژ هاتووە ، هەرکەسێك دەست نوێژ بگرێی لەسەرەتاکەیدا بسم الله بکا پاشان دەست و نوێژەکەی وەکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بگرێی لەکۆتاییدا بلێ (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ)[٤٤٣] ئەلێ هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لەکامیان بچێتە ژوورەوە بچێت بۆ الله ئەم کارە بکا ئەو ئەم پاك و تەمیزییە بۆ الله تعالی بەکار بهێنی بەلاّم ئەمە هەمووی لەسەرە ئەساسی ئیمانە ئاگاداربن ، ئەگەر کەسەکە موشریك بێ هەزار دەست نوێژ بگرێی کە عەمەلە ئەو ئیشەی بۆ جێ بەجێ ناکا الله تعالی ، بەبەردەوام ئەم خالەتان لەبەر چاو بێ شیرك و کوفر هەر عەمەلێك بکەی سودی نیە مادەم تۆ لەناو داخیلت دا ئیمانەکەت ساغ نەبووبێتەوە بۆ الله تعالی موشریك بی یان کافربی یان منافق بی .

ئینجا ئەوانە دڵی خۆیان خۆش نەکەن بلێن والله عەمرەمان کرد و حەجمان کرد و زەکاتمان دا وامان کرد وامان کرد ئەمە هەمووی عەمەلە عەمەلیش لەسەر ئەساسێکە کە ئیمانە ئەگەر ئیمانەکەت تەواو نەبوو ئەو عەمەلە لەلای الله تعالی وەرناگیرێی الله تعالی زۆری لەقورئان ئەمە باسکردوە ئەفەرمووێی الله تعالی : (وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا)[٤٤٤] هەر عەمەلێك بکا کەسەکە شەریکی پەیا کردبێ بۆ الله ئەو کردەوەیە ئەبێ بەتۆزی بادراو و بابردوو هیچ سودی بۆی نیە ، لەبەر ئەوە ئەکردەوەیەی کە ئێستا تۆ خۆتی بۆ ماندوو دەکەی بەیانی تا ئێوارە نوێژدەکەی یان بەرۆژوو دەبی بزانە ئیمانەکەت تەواوە ؟! ئەگەر ئیمانەکەت تەواو نەبوو هیچ سودی نیە وەکو ئەوە وایە کەوا مردووێك جوانترین جلی لەبەر بکەیت چ سودی هەیە ! ؟مردوە و تازە ناتوانێ ئەو لەو جلە جوانانە سود وەرگرێی ، ئەبێ زیندوو بی واتا ئیمانت تەواو بێ ئینجا ئەو عەمەلە سودی هەیە بۆت .

پاشان الله تعالی دەفەرمووێی : (وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ)[٤٤٥] ئەم بابەتە پێویستی بە باسکردنێکی باش هەیە لەسەری چونکە پەیوەستە بەهەندێك شتی زۆر گرینگەوە .

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە (الله تعالی ئەوانەی خۆش دەوێی کە خۆیان خاوێن دەکەنەوە) لەسەر ئاو خۆی خاوێن دەکاتەوە .

[٤٤٣] : روى مسلم (٢٣٤) وأبو داود (١٦٩) والنسائي (١٤٨) والترمذي (٥٥) وابن ماجة (٤٧٠) وأحمد (١٢٢) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ عن عُمَر رضي الله عنهما

[٤٤٤] :سورة الفرقان اية : ٢٣

[٤٤٥] :سورة التوبة اية :١٠٨

لەم ئایەتەدا باسی مسجدی قوبا ە لەپێش ئەمەدا الله تعالی باسی مسجدی ضرار دەکا دەفەرموویێ : لەمەدینە پێش ئەوەی پێغەمبەر بروا (صلی الله علیه وسلم)بۆ مەدینە ئەوس و خەجرەج شەریان بوو لەنێوان یەکتریدا لەناو مەدینەش سێ گرۆی گەورەی یەهود هەبوون بنی قینقاع و بنی نذیر وبنی قریظه بەبەردەوام ئەم یەهودیانە بەشێکیان هاوپەیمان بوون لەگەل ئەوس بەشێکیان هاوپەیمان بوون لەگەل خەجرەج شەربوو لەنێوانیاندا بەبەردەوام وە لەناو ئەوس و خەجرەجیەکانیشدا دووکەس وای لێهاتبوو پالێوراوبوون بۆ ئەوەی ببن بەگەورەی مەدینە (ابو عامری راهب لەگەل عبدالله کوری ابی کوری سلول)ئەمانە ببەن بە سەرکردەی مەدینە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) هیجرەتی فەرموو بۆ مەدینە و صەحابە هەمووی رووی کردە ئەو ئیتر ئەوانە هەمووی لەبیرچوویەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بوو بە سەرۆکی مەدینە ئەم دوانە عقد و قین و رقایەتی زۆریان خستە دلی خۆیان بەرامبەر بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)وە سەرکردایەتی وایە بۆکەس نیە هەتا برا و باوکت بێ رقت لێی یەتی ئەبێ خۆت سەرکردە بی بۆیە ئەمانە رقیان لەپێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەلگر تبوو هۆکاری عداوەتی عبدالله کوری سلول کە سەرۆکی منافقین بوو ئەوە بوو هەلبژێردرابوو ببێت بە سەرۆکی مەدینە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەهات خەلکی ئەو ناخوێنەوە بەلکو ئەو دەخوێنەوە ئەو عقدەی هەلگرت بۆیە لەمەدینە مایەوە لە ظاهر بوو بە موسلمان بەس لەداخل هەر منافیقە ئەویتریان بەلاّم رۆیشت مەدینەی بەجێهێشت رۆیشت بۆ مەککە دواتر رۆیشت بۆشام دواتر دەسیسەی دروست کرد لەناو مەدینە بێن مزگەوتێك دروست بکەن لەو مزگەوتەدا منافیقەکان چاوەری ئەو (ابو عامری راهیبە )بکەن بگەرێتەوە ئەو ببێ بە سەرۆکیان و لەناو مەدینەدا علی اساس عیبادەتیان بۆ بکا وە واز لە مزگەوتی قوبا بێنن الله تعالی وەحی بۆ پێغەمبەرکرد (صلی الله علیه وسلم) کە ئەو منافیقانە ئەو مزگەوتەیان بەم شێوەیە دروست کردوە بۆ زەرەر گەیاندن بە موسلمانان وە تەفەرەقە دروست کردن لەنێوان موسلمانان ناوی نا مسجدی ضرار ئەوەی کەوا دەبێتە هۆی زەرەر بۆ موسلمانان کەواتە جاری وا هەیە مزگەوت دروست دەکرێی بۆ زەرەر ئەمرۆ بەناویترەوە ئەم مزگەواتانە دروست کراون زانایان دەفەرموون : هەر مزگەوتێك تەوحیدی الله تعالی تێدا بەرز نەکرابێتەوە ئەوە ئەو مجسدی ضرارەیە ئەوە دەبێ بروخێنرێی و لەناو ببرێت چونکە شیرك و ضەلالەت و کوفر دلّ بەستن بەغیری الله تعالی وە لەمزگەوتێکدا ناکرێی بۆ غەیری الله تعالی ئەو مزگەوتە بەلکو زەرەر بە موسلمانان دەبەخشێ .

ئەوانەی مزگەوتێکیان بە زەرەر دروست کرد الله تعالی بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێی : تۆ نابێت بچیتە ناویەوە وە نزیکیشی بکەویت ، بۆیە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەم مزگەوتەی سوتاند و روخاندی.

لەوانەیە زۆر کەس بلێ ئاخر چۆن مزگەوت دەروخێنرێی ؟

بەلی ئەوە ئەو مزگەوتەیە کەشیرك و ضەلالەتی تێدایە ئەبێ بروخێنرێی .

جا ئەو صەحابانە لەناو قوبادا الله تعالی وەصفیان دەکا کە تەوحید و ئیمان و خاوێن و پاکیان راگرت وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێی دەپرسێ لەحەدیسێکدا کە ئەیوبی ئەنصاری و جابر وە ئەنەس (رەزا و رەحمەتی الله تعالی یان لێ بێ ) بۆمان دەگێرنەوە ئەلێن : کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : (فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ)[٤٤٦] لەناو ئەو مەزگەوتەدا مەبەست پێی مزگەوتی قوبا یە چونکە مزگەوتی قوبا دروست کرا یەکەمجار پاشان مزگەوتی مەدینە دروست کرا وە الله تعالی بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێی : (لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ)[٤٤٧] ئینجا فەرموویی : (فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ) مزگەوتێك لە ئەساسدا لەسەر تەقوا دروست کرابێ لەسەر یەکخوا پەرستی لەسەر تەوحید و ئیمان لەسەر ئەوەی خەلکەکان بێن فێری بەندایەتی بن بۆ الله تعالی نەك بەندایەتی بۆ ئینسان ، ئێستا بەناوی تەکییەوە ئەوە هەمووی مسجدی ضرارە با پێتان بلێم چونکە بەندایەتیە بۆ بەندە یا عبدالقادر هاوار والعیاذ بالله هەتا جارێك دەلێ یا الله هەزارجار دەلێ یا عبدالقادر ئەوە بەندایەتیە بۆ عەبد الله تعالی رقی لەمەیە خوا رقی لەم جۆرە شوێنەیە خوای دەکرد ناوی هەر مزگەوتێك دەبوو هەتاوەکو مسجدی حرام کەشیرکی تێدا کرا الله تعالی ئەمری بە پێغەمبەر کرد (صلی الله علیه وسلم) کە بەجێی بهێلی نەچوو بۆمەدینە خۆ نەیوت قەینا ئەوە مسجد الحرامە و ئیبراهیم (علیه السلام) دروستی کردوە و باکافرەکانیش تێدا بن من با هەر لەوێی بم بەلکو وتی برۆ بەجێی بهێلە  کەواتە ئەو شوێنە ئەبێ یەکخوا پەرستی تێدا بکرێی پێی ئەوترێی مسجد شوێنی سجود شوێنی عیبادەت ئەما هەموو قورئان بگەرێت تەکییەکی تێدا نابینیتەوە  بۆیە شتەکان گۆراون سەیری قورئانەکەمان بکەین مزگەوت شوێنی سەجدە بردن شوێنی عیبادەت کردن بۆ الله تەنها بۆ الله هیچتر نا ئا لەم مزگەوت بلێ یا رسول الله یەکسەر کافر دەبی یا عبدالقادر کافر دەبی لە مسجدالحرام یان مجسدی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نابێت وابلێت نابێ بیکەیت بە جێگای بەندایەتی بەندە .

[٤٤٦] :سورة التوبة اية : ١٠٨
[٤٤٧] :سورة التوبة اية : ١٠٨

یاخود تەفرەقە نانەوە لەنێوان موسلمانان ئەو مزگەوت بەکار دەهێنی بۆ سەوت بۆ فلان کەس ئەویتر بۆ فلان کەس ئەمە چیە ئەمە ! ؟ئەی ئیسحانەکەی کە باسمان کرد کا کە الله بپەرستی و کەس نەخوێنیتەوە کوا ! ! ؟ ئەبێ زۆر وریا بین .

جا ئەلێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێی وتن: (يا مَعْشَرَ الأنْصَارِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَثْنَى عَلَيْكُمْ خَيْرًا فِي الطُّهُورِ ، فَمَا طُهُورُكُمْ هَذَا ؟)وتی ئەی ئەنصارییەکان ئێوە الله تعالی زۆر وەصفی کردوون لەو ئایەتەدا (فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا)یانی کەسێك الله وەصف و شایەتی بۆ بدا کە ئەمە ئەیەوێت پاك بێتەوە و الله تعالی ئەو کەسانەی خۆش دەوێی کە خۆیان پاك دەکەنەوە کە ئەمەش شایەتیەکی گەورەیە ! وتی بزانم چی دەکەن طهورەکەی ئێوە چیە ؟ خۆ خاوێنکردنەوەکەی ئێوە چیە ؟ تەبعەن دەبێ ئێوە ئاگادارین لەو کاتەدا ئاو کەم بووە مزگەوتەکان بەلوعە و حەنەفی و ئەوشتانەی تێدا نەبووە مزگەوتەکە چوار دیوار بووە لەو دەشتەدا بەبەرد یاخود بە ئاو خۆیان خاوێن دەکردەوە ئاویش کەم بووە بۆیە بەبەرد خۆیان خاوێن کردۆتەوە وە بەبەردیش لەوکاتیەوە و ئێستا و تا رۆژی قیامەت جائیزە خۆت خاوێن بکەیتەوە بەلاَم ئایا بەرد و ئاو دەبێ بەیەك ؟! بەتەئەکید نابێ بەیەك هەردووکیشیان شەرعین بۆیە ئەگەر ئاو و بەرد هەبوو دەبێ بەئاو خۆت خاوێن بکەیتەوە ئاو و بەرد کۆناکەیتەوە بەیەکەوە بەلاَم ئەگەر هاتوو ئاو نەبوو ئەوە ئەوکاتە بەبەرد خۆت خاوێن دەکەیتەوە ، ئەمان بەئاو خۆیان خاوێن دەکردەوە ئەوانیش وتیان : (قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ نتوضأ للصلاة، ونغتسل من الجنابة، ونستنجي بالماء)دەست نوێژ دەگرین و غوسلی جەنابەت دەکەین بەئاو وە سەر ئاو دەکەین بە ئاو (فقال: " هو ذاك، فعليكموه)[٤٤٨] فەرمووی : ئەوەیە بۆیە الله تعالی وەصفی کردوون یانی ئەو ئاوە بەپاکی خاوێنتان دەکاتەوە وە ئێوە پاك و تەمیز و رێك و پێکن الله تعالی وەصفی کردوون .

لەم لایەوەش دەبی ئاماژە بەو کەسانە بدەین کە خۆیان خاوێن ناکەنەوە بەداخەوە مزگەوتەکان برۆ سەیریان بکە حاشا لە خوێنەران بۆنی میز و پیسایی لێ دێی هۆکارەکەشی ئەوەیە بە پێوە میزەکەی دەکا و بەجێی دەهێلی ، یاخود هەندێك شوێن هەیە کراوەتە شوێنی خۆ بەتال کردن لەبەر بۆن ناتوانی بچیت یاخود کەسەکە خۆی داناپۆشیت یاخود خۆی خاوێن ناکاتەوە لەسەر ئەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆمان باس دەکا کە کەسێك لەعەزابی قەبردایە لەبەر ئەمە یانی موجیبی عەزابی قەبرە یانی ئەو کەسەی کە خۆی خاوێن نەکاتەوە لەمیز کردن لەخۆ داپۆشین لەوکاتانەدا لەکاتی قەضای قاجەدا موجیبی ئەو عەزابەیە لە عەزابی قەبردا الله تعالی پەنامان بدا وە بەیەکێك لەهۆکارەکانی عەزابی قەبر

[٤٤٨] : وروى ابن ماجه والدارقطني والبيهقي عن جابر وأبي أيوب وأنس

دائەنرێی ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەلای دوو گۆردا تێپەری فەرمووی : ئەم دووانە هەردووکیان عەزاب ئەدرێن ئێستا وەحی بۆ کرابوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)لەیەکێکیان وتی : خۆی خاوێن نەکردۆتەوە لەمیز !! بۆیە ئەبێ ئاگاداربین و مندالەکانمان فێرکەین وە لەسەر ئەوە پەروەردەیان بکەین کەوا خاوێن و پاك بن الله تعالى ئەوانەی خۆش دەوێی (وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ)[٤٤٩] ئێستا کەسی وا هەیە گوێی لێ نیە و شەهادەی هەیە پانتۆلەکەی حاشا لەخوێنەران دا ئەکەنی و خۆی بەتال ئەکاتەوە و بەبێ ئاو و شت بەجێی دەهێلیی ئەمە بەخۆی دەلێ سەقافەتم هەیە!! لەبەر چی ؟ دەلێ ناتوانم لەبەر پانتۆلەکەم دانیشم یان دەلێ تاقەتم نیە یان دەلێ قەیچیەکە خۆ پیس نیە وەکو ئەوروپا.

*قال الله تعالى (وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ)[٤٥٠] سەبرت هەبێ باشە یاخود سەبرت نەبێ؟! بەتەئەکید سەبرت هەبێ ئەوکاتە تۆی خۆش دەوێی .

سەبریش بەراستی مەنزیلەیەکە چەند جارێك باسمان کردوە زۆر گەورەیە خوای گەروە بەبێ هیچ بەرامبەرێك و حەقت بەرامبەر حیساب ناکا پاداشتت ئەداتەوە ئەجری ئارامگرانبەبێ حیسابە صەبر گرتن لەسەر تاعەتەکەت هەتاوەکو مردن هەروەکو الله تعالى دەفەرموویێ : (وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ)[٤٥١] مەلێ تاقەتم چوو ئەوەنەی نوێژ بکەم ئەوەنە رۆژووم گرت و ئەوەنەی زەکاتم دا ،،، وا مەلێ هەتا مردن تۆ عەبدی ئارامی لەسەر بگرە الله تعالى تۆیی خۆش دەوێی ئەگەر وانەکەی الله تعالى تۆیی خۆش ناوێی .

وە ئارام بگرە لەسەر حەرامەکان مەیکە و خۆت بگرە ئەو کاتە الله تعالى تۆیی خۆش دەوێی وە ئارامیش بگرە لەسەر نارەحەتیەکان دایکت یان باوکت یان برا یان خۆشەویستەکەت دەمرێی قەزای الله یە و تەواو چی بکەین خۆنیشاندان بکەین دژی الله !؟ والعياذ بالله خەلکانێك هەن خۆنیشاندان دەکەن دژی الله چۆن ئەبێ وابکەن ئەوە الله تعالى ئی خۆیەتی (إن لله ما أخذ ، وله ما أعطى ، وكل شيء عنده بأجل مسمى ، فاصبر واحتسب)ئەوە تەعەزییە نامەی راست و رەئیسیە کەسێك کەسێکی لێ مرد بلێ : ئەوە ئی خوایە بردیتیەوە ئەوەی وەری دەگرێتەوە هی خۆیەتی ، ئالەو کاتەدا مندالەکەت ئەداتێ بزانە ئەشیباتەوە وە

[٤٤٩] : سورة التوبة اية : ١٠٨
[٤٥٠] :سورة ال عمران اية : ١٤٦
[٤٥١] : سورة الحجر اية : ٩٩

ئی خۆیەتی پێت دەبەخشی وە دەشی باتەوە ، بۆیە خۆنیشاندان دژی الله مەکە ، بەلکو بلێ (**إنا لله وإنا إليه راجعون**)بلێ ئی الله یە و ئارام بگرە ئینجا لەسەر ناخۆشیەکان ئاوابە .

بەلام بەداخەوە موسلمانان بەعام بەم شێوەیە نین جاری هەر گرتنی ئەو کۆر و تەعزییەنامانە کە ئەگرێی هیچی لەشەرعی الله تعالی دا نیە هەمووی حەرامە ، مردوو چوار شتی هەیە :

١–بیشۆیت .

٢–کفنی بکەیت.

٣–نوێژی لەسەر بکەیت ، گەورەترین شت نوێژە .

٤–خستنە ناو گۆڕەوە .

تەواو ئیتر هەرکەسە و بۆ مالی خۆیی ، یانی ئەوە تۆ دانیشتی چی دەکەی ؟! ئەوە چەندی پێت کرا دانیشتی ؟ چ سودی هەیە ؟! ئەمە دژایەتیە .

کەسێکت ئەمرێی زۆرترین موسلمان لەسەری نوێژی بکەن چاکە چونکە بۆ مردوەکە باشە بەلام ئەگەر مردوەکە کەسێکی کافر یان موشریك بوو هەرچەند خەلك نوێژی لەسەربکەن هەر بێ سودە و با دلی خۆی خۆش نەکا خاوەن مردوەکە بلێ خەلکێکی زۆر نوێژی لەسەر مردوەکەمان کردوە بەلکو ئەبێ ئەو مردوە کەسێکی موحید و یەکخوا پەرست بێ ، الله تعالی ئەم دونیایەی هەمووی لەبەر تەوحید دروست کردوە ، تەوحید یانی یەکخوا پەرستی یانی بەقسە کردنی الله یانی ڕووکردنە الله و پشت کردنە خەلك بەس ئەمرۆ ئەمە بەپێچەوانەوەیە .

جا لەئارامگرتندا (**وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ**)[٤٥٢]ئەبێ لەسەر ئەم تەوحیدە ئارام بگری ڕاستە ئەمرۆ کەمە کەسەکانی وە ئارامگرتنیش قورسە زۆر زۆر لەسەری هاو دەمەکانت کەمە بەلکو ئەگیرێن و ئەکوژرێن و لەناو ئەبرێن هەتا داوای ،،،وایە یاخود وانیە.! سەیرێکی ڕیش بکە ئێستا ئەم ڕیشە ئێستا مقبول و مەرغوب نیە لەبەر ئەوەی وەکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانراوە دەستکاری هیچی نەکردوە ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێت دەلێ : (جزوا الشوارب وأرخوا اللحى)[٤٥٣] ئەگەر تۆ ئەم ڕیشەت هەبێ چەندەها تەقریر لەسەرت دەنوسرێ ، ئەی ئەگەر وەکو ئەمریکایەك سەك سۆکیەك بێلیتەوە سەلامیشت بۆ دەکرێی وەکو ئەمریکایەك بکەی ئاساییە بەس وەکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نابێ بکەی !! وایە یان وانیە ؟! ئەوە حەقیقەتە ، براو خوشکانم بۆ الله بژی

[٤٥٢]:سورة ال عمران اية : ١٤٦

[٤٥٣]: رواية مسلم من حديث أبي هريرة -رضي الله عنه- عن النبي

(فلواحدٍ كن واحداً في واحد)[٤٥٤]

فلواحد : بەس بۆ الله (كن واحدا )منافق مەبە و دووروو مەبە بەلكو يەك روو بە (في واحد)لەسەر ڕێگە ڕاستەكەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) برۆ یەك ڕێگەیە دوو ڕێگا نیە چەندەها ڕێگەی ترە و دەیگرتەبەر و قور دەكرێی بەسەرتا ، بۆ خوایەك یەك كەس بە لەسەر یەك ڕێگا برۆ ئەمە مانای شعرەكەیە زۆر گەورەیە ئەمە .

صەبر لەسەر ئەم تەوحیدە بگرە ڕاستە ئەمرۆ صەبر زۆر قورسە ، بەرێگا دا رۆیشتووم یەكێك بەمن ئەڵێ (باع ع ! !)منیش وتم : تخوا من بزنم یان تۆ بزنی ئەباعێنی ! ؟ كامان بزنین ئەبێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بروا پێ بلێ باع ع ئەی ئەم كەمە چیە هێشتوتەوە ئەمەت بۆ كێی هێشتەوە یان تۆپەلێك دەهێلتەوە ئەویتری لادەبا و دەیتراشێ ، بزانن چۆن حورمەتی پێغەمبەر شكاوە چۆن حورمەتی دینەكەی شكاوە چەدەها جار بەم شێوەیان وتوە بەبێ شەرمانە صەبر بگرن ئەمە زۆر كەس صەبری لەسەر ناگرێی عەبا و پێچەكانمان بەخوا مامۆستا چی بكەم گالتەم پێ دەكەن دەبرۆ خوشكم خۆت رووت بكەرەوە ! قەینا پا چەپلەت بۆ لێدەن ! ! چەپلەكەی دونیا خۆشە یان عەزابەكەی قیامەت، كە الله تعالی لەسەر ئەو حیجابە عەزابت دەدا ئائەوە ناخۆشە یان خەلكێك ئەگەر بێتوو گالەت پێ بكا كامیان زۆر تر ناخۆشە كامیان ؟! پاشان چەپلە لێدانەكەی دونیا بۆ رووت و قوتیەكەی تۆ خۆشە كە پێت دەلێن ئافریم والله كراوەیە و ئافرەتێكی رۆشەنبیرە و رەجعی نیە وەكو دۆلمە خۆی دانەپۆشیوە ئاوای پێ دەلێن ؟!ئەمە خۆشە لای تۆ ؟ یان بەهەشتەكەی الله كە لەموقابیلی ئەم حیجابە ئەدرێتی ئەمە صەبری دەوێی ئەمەیە كە الله تعالی دەفەرمووێی : ((وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ)[٤٥٥] الله تعالی ئەو ئارام گرانەی خۆش دەوێی ، یانی پێچەوانەكەی الله تعالی ئەو كەسانەی كەوا ئارام گر نەبن خۆشی ناوێی .

*قال الله تعالی: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)[٤٥٦] الله تعالی ئەو كەسەی پێ خۆشە وخۆشی دەوێی كەتەوەكول لەسەر ئەو دەكا نەك لەسەر بەندەكان .

ئەمرۆ پشت بەستن لەسەر بەندەكان یان لەسەرالله یە ؟! زۆربەی لەسەر بەندەكانە ئەلێ بەسایەی خوا و سەری تۆوە یان دەلێ ئەگەر خوا و تۆ نەبوایە ! ؟ ئەمە ئەوانەن كە بەحیساب نوێژ دەكەن خۆ ئەوانەی

[٤٥٤] : نونية ابن القيم = الكافية الشافية ،،جزء :١-ص:٢١٩
[٤٥٥] :سورة ال عمران اية : ١٤٦
[٤٥٦] :سورة ال عمران اية : ١٥٩

نوێژ ناکەن و عیبادەت و تەوحیدیان نیە ئەوە باسی خوا هەر ناکەن ئەوە خوا تەواو لەبیرچویتەوە ئەوەشی باسی خوا دەکا دەلیّ خوا و تۆ ئەو خوا و تۆیە ئەمەیان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ : ئەوە شەریکە کەلیمەی (الواو)لەوێدا نابیّ بەکار بهێنرێی ئەبیّ بلیّ (ثم)یانی ئینجا الله ئینجا تۆ یانی ئەصلەکە هەر الله یە ئینجا الله تعالى بەواستەی تۆ یارمەتی دام ئەویش ئەگەر زیندوو بیّ ئەما ئەگەر مردوو بیّ ، بۆنمونە هاواری عبدالقادر و فلان و فلان بکەی هەتا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆت نیە تۆ هاواری بۆ بکەی و تەوکولی لەسەر ببەستی ، تەوکول لەسەر مردوان نابیّ چونکە ئەمە شەریك پەیا کردنە بۆ الله تبارك وتعالى .

جا الله تعالى ئەوانەی خۆش دەوێی کەوا (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)یانی علیه) لەسەر الله تبارك وتعالى تەوکول دەبەستن پشت بە الله دەبەستن ، ئەوەی پشت بە الله بەبەستی زەرەر دەکا ؟!نا. ئەی ئەوەی پشت بە بەندەکان ببەستی ئەری والله زەرەر دەکا .

*یەکێکی تر لەوشتانەی کە الله تعالى خۆشیانی دەوێی الله تعالى دەفەرمووێ : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ)ئەی ئیمانداران لەدینەکەی خۆی )( فَسَوْفَ)یانی کافر بیّ یانی شتێکیتر هەلبژێرێ موشریك بیّ بەو واتای غەیری دینی الله هەلبژێریی (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ)[٤٥٧]هەرکەسێك غەیری دینی ئیسلام هەلبژێرێی لیّ قبول ناکرێ و لەقیامەتیشدا لەخەسارەت مەندانە و لەناو جەهەنەمدا بە هەتا هەتای دەمێنێتەوە ، الله تعالى بەلکو بەس ئیسلامی دەوێی تەواو .

جا دەفەرمووێ : هەرکەسێك لەو ئیسلامە پاشگەز بێتەوە پشتی تیّ بکا و وازی لیّ بێنی یان شەریکی بۆ پەیا بکا و شتێکیتر بخاتە پالّی (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ)ئەوە الله تعالى لەناوتان دەبا کەسانێکیتر دەهێنی کە الله تعالى ئەوانی خۆش دەوێی ئەوانیش الله تعالى یان خۆش دەوێی (أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ)کە زەلیلن بۆ موسلمانان و خەمخۆر و بەرەحمەن بۆیان (أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ)وە دژی کافرەکانیشن ئەها بزانە الله تعالى کێی خۆش دەوێی زەلیلبە بۆ موسلمان وە بەشیدەت و توندبە لەسەر کافر چونکە کافر خۆیی زۆر بیّ قیمەت کردوە قیمەتی خۆی نەهێشتۆتەوە تا تۆ قیمەتی بۆ دابنێی ، الله تعالى لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ : (قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا)[٤٥٨] ئەوە هەرەشەی الله تعالى یە دەفەرمووێ : ئەگەر عیبادەت نەکەی و موسلمان نەبی

[٤٥٧] سورة ال عمران اية : ٨٥
[٤٥٨]: سورة الفرقان اية : ٧٧

لەسەر ڕێگەی ئەو ئیسلامەی من نەرۆیی هیچ قیمەتت نیە وە عەزابیش مسۆگەر دەبیّ و لیّت نابێتەوە (فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا)یانی عەزابی الله پێوەیی ئەلکێی بۆ هەتا هەتایە ، بۆیە تۆ دەبیّ دووژمنایەتی کافران بکەی نابیّ بلیّ من عیلاقەم نیە .

ئینجا دەفەرموویّی : (الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ) لەپێناوی الله دا تێدەکۆشن بەهەموو جۆرەکانی تێکۆشان ، جیهاد و تێکۆشان مانای زۆر گەورەی هەیە جیهادی نەفس هەیە ئی خۆت ئەبیّ ئیمان بهێنی وە ئەبیّ عەمەل بکەی وە ئەبیّ دەعوە بکەی وە ئەبیّ صەبر بگری ئەمە چوار جۆر جیهادە لەنەفسی خۆتدا ، جیهادی شەیطان هەیە بەرامبەر بە شبوهات و شەهەواتی رابوەستیتەوە ئەمەش دوو جۆریتر لە جیهاد ، جیهادی ئەهلی زولم و ئەهلی فیسق و ئەهلی بیدعە ئەمانە هەیە کە بەدەعوە و بەبانگەواز و بە ئەمر کردن بە مەعروف و نەهی کردن بە مونکەرجیّ بەجی دەبیّ ، وە جیهادی کوفاریش هەیە کە لەکاتی دەسەلات و تواناادا شەریان لەگەلدا دەکەی ئەمە هەمووی لەقورئاندا واریدە ، جا ئەو کەسانەی وا بکا دەفەرموویّی : لەلۆمەی لۆمەکارانیش ناترسێن کاتێك تۆ ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەیەك دەکەی لۆلۆمەی لۆمەکاران ناترسی (ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ)[٤٥٩] ئەمە فەزلی الله یە ئەیدا بەهەرکەسێك ئەمە بەخششی الله ئەیدا بەهەرکەسێك وە الله تعالی زۆر بەخشندە و میهرەبانە وە الله تعالی زانایە بە ئەحوالتان .

جا لەم ئایەتەدا ئەوە بەدیار کەوت کە دەفەرموویّی : ئەگەر ئێوە وانەکەن ئەگەر ئێوە لەسەر دینتان بەردەوام نەبن لەناوتان دەبا و قەومێك دەهێنی کە الله تعالی ئەوانی خۆش بوێی وە ئەوانیش الله تعالی یان خۆش بوێی واتا الله تعالی بەس موسلمانی خۆش دەوێی باش بزانە ، لە بابەتەکانیتر باسمان کرد وتمان بەخشینی الله تعالی بەکافرەکان ئەمە ڕێز لێنان نیە ئاگادار بە ، ئەفەرموویّی : ئەگەر دونیا هەر هەمووی بەقەدەر یەك بالە مێشوولە قیمەتی هەبووایە لەلای الله تعالی بەشی یەك کافری نەئەدا چونکە کافر زۆر بیّ قیمەتە ، بەس الله تعالی ئەوەی دانەناوە لەسەنگی مەحەك بۆ ڕێزلێنان و ڕێز لێنەنان ، نەوالله لە بەندەکانی خۆی دەگرێتەوە وە بەکافرانیش دەدا ئەوە ئێستا نابینن کافر لەهەموو کەسێك دەولەمەنتر نیە !؟ موسلمانیش فەقیر و لاوازە بەس تۆ دلت بەمە نەسوتیّ بەخۆت لەبەر ئەوەی بەهەشتێکت هەیە دونیا هەرهیچ نیە لەچاویدا بۆیە ئەبیّ ئاگادار بی ، ئەی بۆ ئەوان ؟ جەهەنەمێك هەیە کە ئەگەر بەهەزار هەزار خۆشی دونیایان وەرگرتبیّ کە یەکجار هەلکێشرا لەجەهەنەم کە وەکو لەحەدیسدا دەفەرموویّی : دەلی بەژیانی خۆم خێر و خۆشیم نەبینیوە بۆیە دلتان بەدونیا خۆش مەکەن .

[٤٥٩] :سورة المائدة اية : ٥٤

شەرحی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکەین دەربارەی ئەوانەی کەوا الله تعالی خۆشی دەوێن دوای ئەوەی باسی ئەو ئایەتانەمان کرد .

لەوانە (**فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ**)[٤٦٠] وە مەتەقی ئەو کەسە کە خۆی لەحەرام کراوەکان دەپارێزیی وە واجبەکان جێ بەجێ دەکا سونەتەکانیش جێ بەجێ دەکا .

وە (**إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ**)[٤٦١] وە هەروەها مقسگین ئەو کەسانەن کە داد پەروەرن چ لەمال و مندالی خۆیان چ لەناو گەل و هۆزی خۆیان بەعەدالەت لەسەر شەریعەتی الله تعالی دەرۆن ، هەمانە هەمووی الله تعالی خۆشی دەوێن .

پاشان باسی هەندێك حەدیسمان بۆ دەکا کە حەدیسەکان لەسونەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە لەوانە :

حەدیسی عامری کوری سەعد(رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ ) عامری کوری سەعد دەگێرێتەوە کەوا کەوا سەعدی کوری ئەبی وەقاصی باوکی (رەزاو رەحمەتی الله تعالی یان لێ بێ )دوور کەوتەوە لەزەمەنی فیتنەی صەحابە لەو شەرو شۆڕانەی روویدا بەداخەوە لەنێوان صەحابەکاندا خۆی دوورە پەرێز گرت لەوفیتنانە ، رۆیشت لەجێگایەکی دوور لەناو حوشتر و لەناو مەڕوومالاتی خۆیدا بەتەنها ئەژیا کورێکیتری هەبوو ناوی عومەربوو عومەری کوری سەعد ئەم عومەرە وانەبوو ئەیویست باوکی هاندا لەبەر ئەوەی سەعدی کوری ئەبی وەقاص یەکێکە لە عەشەرەی موبەشەرە ئەیویست هانی بدا بێت بۆ ناو فیتنەکە وە لەوێی ئەو شەرانەی کەوا دروست بووە لەنێوان صەحابەدا تەبعەن لایەك بەسەر لایەکدا زاڵ دەبێ ئەمیش تەماعی ئەوەی هەبوو کەوا باوکی بێتە ناو ئەمەوە و مولکی دەست بکەوێی بە ئیعتبار یەکێکە لە عەشەرەی موبەشەرە (كان سعد بن أبي وقاص في إبله فجاءه ابنه عمر فلما رآه سعد قال أعوذ بالله من شر هذا الراكب) کەسەعد بینی وتی یا الله من پەنا دەگرم لەتۆ ئا لەشەری ئەم سوارییە (مەبەستی کورەکەی بوو کەسواری ئەسپ بوو ) (فنزل فقال له أنزلت في إبلك وغنمك وتركت الناس يتنازعون الملك بينهم)بە باوکی وت تۆ شار و ولاتت بەجێهیشت و صەحابەکانت بەجێهێشت هاتی لەم دەشتەدا خەریکی حوشتر و مەڕەکانتی و خەلکت بەجێهێشت لەسەر مولك مونازەعە بکەن تۆش بۆخۆت لێرە دانیشتووی ! یانی ئەویش رەغبەتی هەبوو ئەویش بێتە ناو مەوزوعەکەوە بۆ ئەوەی مولکی دەست بکەوێی (فضرب سعد في صدره)ئەلێ باوکی یەکێکی دا بەسەر سینگی دا و وتی (فقال اسکت)وتی بێ دەنگ بە (سمعت رسول الله

[٤٦٠] :سورة ال عمران اية : ٧٦
[٤٦١] :سورة الحجرات اية : ٩

صلى الله عليه وسلم يقول إن الله يحب العبد التقي الغني الخفي)[٤٦٢] سەیری ئەم حەدیسە بکەن سەعد ریوایەتی دەکا لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حوجەی خۆی بەمە هێنایەوە وتی : لەپێغەمبەرم _صلى الله عليه وسلم) بیستووە وتویەتی : الله تعالی کەسێکی خۆش دەوێی ئەم سێ سیفەتەی تێدا بێ (التقي الغني الخفي) یانی ئەمانە لەو کەسەدا هەبێ تەقوای الله تێدا بێ وە دەولەمەندی تێدا بێ وە خۆشاردنەوەی تێدا بێ لێرەدا کەلیمەی خۆشاردنەوەکەی کرد بە بەلگە .

جا التقی : وەکو وتمان ئەو کەسەیە المتقی کەوا شەرم لە الله دەکا و لەعەزابی الله تعالی دەترسی و پێچەوانەی الله تعالی ناجولێتەوە واجبەکانی جێ بەجێ دەکا و حەرامەکان ناکا.

الغنی : ئەو غنیەی کە لێرەدا باسی کردوە مەبەستی کەسێك نیە مالی زۆر بێ بەلی لێرە مەبەستی غنی نەفسە یانی نەفسی دەولەمەند بێ ئەو کەسەی نەفسی دەولەمەند بێ جاری وایە کەسێك فەقیرە بەس نەفسی دەولەمەندە داوا لەکەس ناکەیت وە تەماع نابریتە کەس ، جالێرە مەبەستەکە ئەوەیە ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەحەدیسێکیتردا فەرموویەتی : ( ليس الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ)[٤٦٣] دەولەمەند ئەو کەسەیە دل و نەفسی دەولەمەند بێ .

دەولەمەند هەیە فەقیرە ! هەر تێر ناخوا هەر نورەی لێوە دێی و تێر نابێ وە بەپێچەوانەوەش فەقیریش هەیە دەولەمەندە قانعە بە بەشی الله تعالی ، جا سەعد وتی الله تعالی ئەو کەسانەی خۆش دەوێی .

الخفی: کەسێکە کەوا خۆی دەرناخا ریا و سومعە ناکا ناچێتە ناو خەلکی بلێ من من !! .

ئەمە بەلگەی ئەو زانایانەشە بۆ ئەوەی کە لەکاتی فیتنەدا خۆیان دەشارنەوە نابنە سەرقافلەی فیتنە چیان .

ئینجا ئاگاداری حەدیسەکە بن الله تعالی ئەمانەی خۆش دەوێی . هەرچەندە شەرحی حەدیسەکە زۆر زۆر هەلدەگرێی بەلام بەکورتی باسمان کرد .

ئەوانەی الله تعالی لەم حەدیسەدا خۆشیان دەوێن:

١–ئینسانی تەقوا دار .

٢–ئینسانێك کەوا دلی دەولەمەند بێ .

٣– ئینسانێکیش کەوا خۆی دەر نەخا ریا و سومعە لێ نەدا .

[٤٦٢] : الكتب » صحيح مسلم » كتاب الزهد والرقائق،، رقم الحديث : ٥٢٦٦- ٢٩٦٥

[٤٦٣] :عن ابي هريرة رضي الله عنه أخرجه البخاري، رقم (٦٠٨١).

بەلأم ئەگەر موسلمان پێویستی پێی بوو ئەبێ بچێتە ناو موسلمانانەوە و عیلم بلأو بكاتەوە نابێ بلێ من عیلم بلأو ناكەمەو با دەر نەكەوم ! عیلم زەرورە ئەبێ بلأوی بكەیتەوە ، بەس تەكەبوری پێوە لێ مەدە خۆت لەخەلك بەباشتر مەزانە خۆت بە فەقیرترینی خەلك بزانە وە خۆت بەتاوانبارترینی خەلك بزانە لەدلی خۆتدا بەرامبەر بە الله تعالی .

ئەبو هورەیرە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ ) دەفەرمووێی : (إن الله عز وجل إذا أنعم على عبد)یانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی الله تعالی ئەگەر نیعمەتێك بەسەر عەبدێكدا برێژی (إذا أنعم على عبد نعمة يحب أن يرى أثر النعمة عليه)ئەگەر تۆ الله تعالی مالێكی دایتێ خۆت بەفەقیری دەر مەخە مالەكەت با پێوە دیار بێ شوكری الله تعالی بكە لەسەر ئەم نیعمەتە مەكورزێرەوە خۆت بە فەقیر دەر مەخە ، بلێت با ئەوها بكەم نەوەكو خەلك بزانی دەولەمەندم الله تعالی رقی لەمەیە ، بەلكو ئەوەی خۆش دەوێت كە نیعمەتەكەی خۆی لە بەندەكەی ببینێ ئەلێ (يحب أن يرى أثر النعمة عليه)بۆیە با ئەو نیعمەتەت پێوە دیار بێ دوایەش شوكری الله تعالی لەسەر بكە (و يكره البؤس و التباؤس)خۆ فەقیر كردن و خۆ رەزیل كردن و كروزانەوە ئەمانەی پێ ناخۆشە ، یانی وا هەست كە كەسەكە دەولەمەندیشە كەچی وا خۆی دەردەخا كەوا فەقیرە لەبەر ئەوەی خەلك پێی نەلێ دەولەمەندە الله تعالی ئەمەی پێی خۆش نیە ئەی چۆن دەولەمەندان دەركەون تاوەكو خەلك داوایان لێ بكا ئەگەر دەولەمەندان خۆیان بەفەقیر نیشان دەن ئەی چۆن بزانرێی ئەوە دەولەمەندە ! ؟ با پێتەوە دیار بێ بۆ ئەوەی خەلكی داوات لێ بكا (و يبغض السائل الملحف)هەروەها الله تعالی رقی لەكەسێكە كەوا داوا بكا بە إلحاحەوە لەخەلكی كەچی پێویستیشی پێی نیە ، زۆر هەیە پێویستیشی پێی نیە كەچی داوا دەكا بە إلحاح (و يحب الحيي العفيف المتعفف)[٤٦٤] وە الله تعالی كەسێكی خۆش دەوێی و شەرم بكا و داوا نەكا لەكەس وە كەسێك بێ دووربێ لەشەهەوات و خۆی مەنع بكا لەوشتانەی كەوا حەلال نیە واتا خۆی لە حەرامەكان مەنع بكا الله تعالی ئەوەی پێی خۆشە ئەو كەسەی خۆش دەوێی كەوا بكات .

[٤٦٤] السلسلة الصحيحة " ٣ / ٣١٠ ،، أخرجه البيهقي في " الشعب " ( ٢ / ٢٣١ / ١ )

له ئەبو هورەیرەوە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیٚ بیٚ ) دەفەرموویٚی : پیٚغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (أَنَّ رَجُلًا زَار أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصَد اللَّهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجِتِهِ مَلَكًا) پیاویٚك چوو سەردانی برایەکی کرد لە دیٚیەکی تر الله تعالی مەلائیکەیەکی لەسەر شیٚوەی ئینسان خستە سەر ریٚگەکەی (فلما أتى عليه) کابرایەکە کە هات بەریٚگادا تیٚپەربوو مەلائیکەکەی بینی ، تەبعەن نەیزانی مەلائیکەیە بەلکو لەسەر شیٚوەی ئینسانیٚك بوو (قال أين تريد)کەسەکە کەلەسەر شیٚوەی مەلائیکە بوو پیٚ وت : تۆ بۆکویٚی ئەچی (قال أريد أخا لي في هذه القرية)ئەمەویٚت سەردانی ئەو برایەم لەم گوندە بکەم (قال هل لك عليه من نعمة تربها)باشە کەتۆ ئەچیت بۆلای هیچ مەبەستت نیە إلا الله نەبیٚ شتیٚك یان مەصلەحەتیٚك لەنیٚوانتان نیە کەوا بۆی بچی ؟ ئەها یەکیٚك بۆلای کەسیٚك ئەچیٚ زۆر بەی وەکو چونەکانی ئەمرۆ زۆر بەی مەصلەحەتیٚکی هەیە لەو چونەدا کاریٚکی پیویستبووە لەو چونەدا یاخود ، جا مەلائیکەکە لیٚ دەپرسی تۆ بەس لەبەر الله تعالی دەچیت بۆلای هیچ مەصلەحەتیٚکت نیە بۆچون بۆلای (قال لا غير أني أحببته في الله عز وجل)نەوالله هیچ مەصەلەحەتیٚکم نیە تەنها لەبەر الله ئەچم بۆلای حەزدەکەم و لەبەر خاتری الله تعالی خۆشم دەویٚی و ئەچم بۆ لای (قال فإني رسول الله إليك بأن الله قد أحبك كما أحببته فيه)[٤٦٥] وتی من نیٚردراویٚکم لەنیٚردراوەکانی الله مەبەستی مەلائیکەیەکە الله تعالی منی ناردوە کە پیٚت بلیٚم الله تعالی تۆی خۆش دەویٚی چونکە لەبەر خاتری الله تعالی تۆ چویت بۆلای ئەو .

ئیمامی نەوەیی لەم حەدیسەدا دەفەرموویٚی : فەزلی مەحەبەتی لەپیٚناوی الله تعالی تیٚدایە وە هۆکارە بۆ ئەوەی کەوا الله تعالی تۆی خۆش بویٚی ئەگەر تۆ بەندەکانی الله تعالی ت لەبەر خاتری الله تعالی ت خۆش ویست ئەوەش ئەوکاتە الله تعالی تۆی خۆش دەویٚی . وەرهەروەها فەزلی ئینسانی چاك و باش و هاوریٚیانی تیٚدایە .

*زیارەتی خەلکی دەبیٚ بەدوو بەشەوە :

یەکەم :لەبەر ئەوەی بتەویٚت کات بکوژی ، ئەلیٚ دەوەرە بچین بۆلای فلان کەس کاتمان نازانین بەچی بەرینە سەر بابچین بۆلای فلان کەس بۆخۆمان دانیشین دووسی قسەی خۆش و سوبعەت بکەین ئەوە ئەمە بەزایە دەچیٚ لەسەرت !.

[٤٦٥] : الكتب » صحيح مسلم» كتاب البر والصلة والآداب» باب في فضل الحب في الله،،رقم الحديث : ٢٥٦٧

دووەم: لەسەردانیەك لەبەر الله ، نمونە دەچیت بۆلای کەسێك بۆئەوەی پرسیاری ئایەتێکی لیٚ بکەیت یان با لەو حەدیسە وەلامم داتەوە یان با مەجلیسێکی عیلم دابمەزرێنم یان با زکرێك بکەین یان مەصلەحەتێکی دین و دونیاوی ببەین بەرێوە ئەمانەشتێکی باشن .

بەس زۆر بەی دانیشتنەکانی ئەمرۆ بەداخەوە سەیر دەکەی سەردانەکان زۆربەی بۆ کات کوشتنە ، ئەلێن چۆنی و چاکی و فلأن چۆنە و دەست دەکا بەغەیبەتی ئەو ئەوانیتر ، نالێت ئەم ئایەتە و ئەم حەدیسە نالێن بزانم مال و مندالت چۆن پەروەردە دەکەیت و ئسولی پەروەردەکردنی مندالەکانت چۆنە وەرە بازانایان فێربین یاخود بلێن وەرە با ریسالەیەك بخوێنینەوە تاوەکو بزانین چۆن مندالەکانمان فێرە تەربیەت و پەروەردە بکەین زۆربەی خەلکی بیٚ ئاگایە لەمندالەکانی ئادەی چۆن خێزانەکانمان پەروەردە بکەین ، چۆن خێزانەکەم ئەو کەسە بیٚ کەنەچێتە بەردەگا وە مەجلیس لەبەردەگادا دروست نەکا وە نەبێتە جێگای نەزەریی خەلکی ، با خێزانەکانمان ئاوا بن کە جێگای شەرم و حەیای مالەوە بن هەروەکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێ : نزیکترین ئافرەت لە الله تعالی وە ئەوەیە کەلەناو کونی مالەکەیدایەتی ، مەفهومی عەکسەکەی ئەوەیە کەوا کەهاتیتە دەرەوە دووردەکەویتەوە لە الله تعالی ، ئەمە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێ .

الله تعالی دەفەرموویێ (**وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ**) [٤٦٦] إستقرار بگرن لەمالەکانی خۆتان ، بەم شێوەیە پەروەردەیان بکەن ، کارت نیە بۆچی ئەچیتە دەرەوە ، ئیشیشت هەیە با پیاوەکە بۆت بکا یان کورەکەت بۆخۆت ئەچیتە دەرەوە ، ئەمرۆ ئەوشتانە نەماوە بەلکو نابیٚ ئەوباسانە بکرێتەوە بەم شێوەیە سەردانی یەکیتری بکەن .

(وفی أن الادمین أن یرو الملائکة) هەیە مەلائیکە دەبینی بەس لەسەر شێوەی ئینسان ئایەت و حەدیسمان زۆرە لەم بارەیەوە ، مەریەم تان لەبیرە مەریەم خۆ پێغەمبەر نەبوو مەلائیکەکە هات بۆلای وە جوبرائیل نەهات بۆلای !!! (**فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا**)[٤٦٧] بوو بەبەشەرێك لەبەر دەمی مەریەمدا ، کەواتە مومکینە ئینسان مەلائیکە ببینی لەسەر شێوەی ئینسان بەخۆت نازانی کەوا مەلائیکەیە ، یاخود بۆ تاقیکردنەوە الله تعالی کەسێك دەنێری بۆی دەولەمەندە ئەلیٚ فەقیرم و لێقەوماو پەکەوتەمە ئەلیٚ نیمە ئەرواتەوە ، یەکەسەر لەسەری تۆمار دەکا و ئەلیٚ خوایە ئەو دەولەمەندە درۆیی کرد وتی نیتم .

ئەمەشیان تاقیکردنەوە بوو لەلایەن الله تعالی ، حەدیسمان هەیە لەم بارەیەوەش ، کەبرای کەچەلەکە وگوێرەکە مشهورە .

[٤٦٦] :سورة الأحزاب اية : ٣٣
[٤٦٧] :سورة مریم اية : ١٧

حەدیسێکیتر ئەبو دەرپڕ (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ )فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (مَا مِنْ رَجُلَيْنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ إِلا كَانَ أَحَبُّهُمَا إِلَى اللَّهِ أَشَدَّهُمَا حُبًّا لِصَاحِبِهِ)[٤٦٨] دوو کەس نیە یەکتریان خۆش بوێی لەبەر خاتری الله تعالی إلا خۆشەویسترینی ئەوکەسە لەلای الله تعالی ئەوەیانە کە ئەویتری لا خۆشەویسترە کامیان ئەویتری خۆشتر دەوێی لەبەر الله خۆشەویسترین لای الله ئەمەیانە .

تخوا چ دینێك هەیە وەکو دینی ئیسلام هێمنی و ئاسایش و خۆشەویستی ئەم سەر زەوییە رابگرێی ، ئەم هەموو حەدیسە ئەم هەموو هاندانە بۆ ئەوەی یەکتریتان خۆش بوێی دەستت نەچێتە خوێن و مال و شەرەف و عرض و کەرامەت و غەیبەتی یەکتری ، تۆ ئەگەر براکەت خۆش بوێی غەیبەتی دەکەی یاخود دەیکوژی سەیری شەرەف و ناموسی دەکەی ؟!یاخود غەدر و خیانەتی لێ دەکەی ؟! ئەی ئەمە ئەصلی هێمنایەتی و ئاسایش نیە ئەم قورئان و حەدیسەی کە الله تعالی باسی دەکا بۆمان ئەگەر ئێمە پەیوەست بین پێوەیی .

کەواتە هەموو هێمنیەك و خۆشحالیەك لەسەر ئەم زەمینە لە قورئان و حەدیس هەل دەقولێی لەمزگەوتەکانەوە ئەبێ هەلبقولێی بەراستی .

حەدیسێکیتر لەعائیشەوە (رەزاو رەحمەتی الله تعالی لێ بێ)دەفەرمووێی : پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پیاوێکی نارد لەگەل مەجومەعەیەك صەحابە بۆ شەرێك لەشەرەکان سەرییەك بوو ، تەبعەن ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆی لەگەلیدا بووبێ ئەوە پێی دەوترێی (غزوە)ئەگەر صەحابە برۆن ئەوە پێی دەلێن (سرییە)واتا کردی بە ئامر سەرییە بەسەر صەحابەکاندا ، تەبعەن ئەو کاتە هەرکەسێك سەرۆکی ولات بوایە سەرۆکی جەیش بووایە یاخود سەرۆکی سەرییەك بووایە ئەوە سەرۆکی دین و دونیای ئەو خەلکە بوو دین و دونیای لەپێش هەموو شتێکەوە لەمزگەوتەوە دەر دەچوو ، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) خۆیی وابوو دین و دونیای برد بەرێوە لەمزگەوت و لەسەر ئەرزی واقیع صەحابەکانیشی وا فێر ئەکرد ، ئەبو بکر و عومەر و عوسمان و عەلی (رەزا و رەحمەتی الله تعالی یان لێ بێ)هەموویان سەرۆکی ئەم خەلکە بوون لەدینیش و لەدونیاشدا نەك بلێن دین بۆخۆتان و دونیا بۆ ئێمە بەم شێوەیە نەبوو .

[٤٦٨] : الكتب » المعجم الأوسط للطبراني» بَابُ الْمِيمِ» مَنِ اسْمُهُ : مُحَمَّدٌ،،، رقم الحديث :٥٤٢٤

ئەلێ ئەم صەحابەیە ئیمامەتی بۆ دەکردن کە ئیمامەتی دەکرد فاتیحەکە و سورەتێکی دەخوێن هەرچی بخوێندبایە دواتر سورەتی (الاخلاص)ی بەدوایدا دەخوێند تیکراری دەکردەوە ئەم شتە لەهەموو نوێژەکاندا صەحابەکانیش هاتن بەپێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم)وت ، وتیان ئەم صەحابەیە وادەکا وتی لێ بپرسن بۆ وا دەکا ، وتی سورەتی (الاخلاص)سیفەتی الله یە و خۆشم دەوێی ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویی : برۆن پێی بلێن ئەوە الله تعالی خۆشی دەوێی مادەم ئەم سورەتی لەپێناوی الله دا خۆش دەوێی الله تعالی ئەوی خۆش دەوێی [٤٦٩].

سورەتی (الاخلاص) زۆر گەورەیە ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەحەدیسێکدا دەفەرموویێ: ئەتوانن هەریەك لەئێوە لە شەوێکدا سێ یەکی قورئان بخوێنێتەوە ؟ وتیان ناتوانین چونکە دە جۆ قورئان دەکا ، فەرمووی : سورەتی قل هو الله أحد (الاخلاص) بخوێنن ئەچێتە بای تەقای ئەم دە جۆ ە یانی ئەجری ئەمەت ئەداتێ الله تعالی ، بەلآم لەحەدیس نەهاتووە بلێ تۆ سێ جار بخوێنیت بکاتە خەتمێك ئەوە نەهاتووە زۆر جار ئەوەش دەبیستین ئەمە حەدیس نیە بەس ئەمایان حەدیسە ئەلێ یەك سورەتی الاخلاص بخوێنە ئەکاتە سێ یەکی قورئان وە هەر ئەمەشە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێ : باش نیە ئینسان قورئان لەرۆژێکدا خەتم بکا بەلکو ئەلێ لەسێ رۆژدا خەتم بکا بۆیە هەموو شەوێك تۆ سورەتی الاخلاصت لەبیر نەچێ و بیخوێنە بەسێ شەو خەتمێکت بۆ ئەنوسرێی بەم شێوەیەیە بابەتەکە ، نەك لەشەوێکدا سێ جار بیخوێنی چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : وامەکە [٤٧٠] ، لەسێ رۆژ کەمتر مەخوێنن جا زۆرجار گوێمان لێ دەبێ یان نوسراوە لەشەوێکدا سێ جار سورەتی الاخلاص بخوێنن بەخەتمێکدا دەنوسرێی !.

لەبەرچی وای وت ؟! لەبەر ئەوە ئەگەر ئێمە سەیری قورئان بکەین لەسێ شت بەدەر نیە ئەم قورئانە ئەگەر تۆ پێناسەی بکەی ، یانی ئەگەر تۆ لێتیان پرسی ئەم قورئانە باسی چی دەکا ئەبێ تۆی موسلمان بزانی و بلێت باس لە سێ شت دەکا :

١-باسی الله دەکا جل وعلا ربوبیەت و الالوهیەت و ئەسماء وصیفاتی الله تعالی ت پێ ئەناسێینی .

٢-حقوقی ئەم تەوحیدە کە پێت دەلێ ئەوامیر و نەواهییەکان پێت دەلێ وابکە و وامەکە .

٣-چیرۆکی ئەو کەسانەی وایان کرد و وایان نەکرد واتا کافر و موسلمانەکان .

[٤٦٩] : وعَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ رَجُلا عَلَى سَرِيَّةٍ وَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ سَلُوهُ لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ رواه البخاري ٦٨٢٧

[٤٧٠] : مەبەستی پێی لەخەتم کردنی قورئانە لەشە و رۆژێکدا .

لەوە زیاترمان نیە لەم قورئانەدا باسی دەکەینەوە بۆئەوەی زیاتر لەم حەدیسە تێ بگەی بۆچی سورەتی الاخلاص سێ یەکی قورئانە :

یەکەمیان الله تعالی ت پێ دەناسێنی ناو و سیفەتەکانی و ربوبیەتی الالوهیەتی ئەسما و سبفەتەکانی پێت دەلێ من تۆم دروست کرد و من بەخێوت دەکەم و بم پەرستە ئەمەش سیفەت و ناوەکانمە بمناسە .

دووەمیان: ئەمانە بکە ، ئەمانە مەکە ، نوێژ بکە و رۆژوو بگرە و عیبادەت بکە ، ئەوە مەکە و شیرك مەکە زینا مەکە کەس مەکوژە بەناحەق ئەمە ئەوامیر و نەواهیەکانە لەواجباتەکان .

سێی یەمیان : ئەو کەسانەی ئەمەیان جێ بەجێ کرد موسلمان وە ئەوەشی جێ بەجێ نەکرد کافر ، لەچیرۆکەکان ئەم قورئانە پریەتی لەچیرۆك ، لەوانە چیرۆکی باوکە ئادەم چیرۆکی نوح وە چیرۆکی إبراهیم وە موسا وە پێغەمبەر محمد وە گشت پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)ئەوەی کەباسکراون ئەوەی کەوا بۆی باس کردووین ئەو ٢٥ پێغەمبەرە ئەمە باشەکان ، ئینجا چیرۆکی خراپکارەکان ئەمە فیرعەون ئەمە قارونە و ئەمە هامانە ئەمە شیطان ئەمە فلان ئەها بۆکوێی چوون !! ئیعتباریان پێ بکەن .

کەواتە قورئان لەسێ شت پێك دێی سورەتی الاخلاص لەکامەیاندایە ؟ لەباسی الله تعالی دایە .

مانای سورەتی الآخلاص:

(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

(قُلْ)بلێ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم(هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ئەوە الله یە ئەوە أحدە ، باشە أحد و واحید جیاوازیان چیە ؟ واحید : واتا یەك خوا یەکە نابێ بەدوو تەواو یەك زاتە دوو خوا مان نیە دوو خوا بایە دونیا تێك دەچوو وەکو گاورە کافرەکان نالێن خوا سێ یانە خوا کوری هەیە ! وەکو عەرەبە موشریکەکانیش نالێن خوا کچی هەیە ! وەکو یەهودیە کافرەکانیش نالێن عوزێر کوری خوایە ! سەیری سورەتەکە بکەن (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)واحید یانی یەك ، بەلاّم أحد: واتا لەسیفاتدا شازە الله تبارك وتعالی وێنەی نیە لەسیفاتەکانیدا (أحد فی صیفات وألاسما )وەك ئەو نیە سەیری کۆتایی ئایەتەکان بکەن (اللَّهُ الصَّمَدُ)هەرگیز هاوتا و هاوشێوە و هاو دەسەلاتدارێکی تر نیە کە لەبەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێ (لَمْ يَلِدْ)مندالی نیە (وَلَمْ يُولَدْ)وە لەکەسیش نەبووە (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ)کەسیش وەکو ئەو نیە هەرچی بەخەیالتدا بێ ئەوە نیە ، واتا کافرە ئەو کەسی بەخەیالیدا بێ بلێ الله تعالی وایە و وایە و وایە هاوشێوە و هاو دەسەلاتی بۆ دابنی ، پەنادەگرین بە الله تعالی یاخود بلێ کور یان ژنی هەیە ، الله تعالی

خۆی دەفەرمووێی لەقورئاندا (أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ)[٤٧١] دەلیّ من مندالم لەکوێی بوو ژنم نیە !! الله تعالی وادەفەرمووێی کەچی ئەو هەموو گاورەی کەئێستا زۆربەی زۆری دونیایان داگیر کردوە ئەو لەعنەتیان دەلیّ بەلیّ خوا کوری هەیە و عیسا کوری خوایە والعیاذ باالله ئێمەش رێزیان لیّ دەگرین !! الله تعالی دەفەرمووێی : ئاسمانەکان خەریکە شەق دەبیّ لەبەر ئەم قسەیە ! من گرتوم نەتەوە ، ئاسمان و ئەرز خەریکە پارچە پارچە دەبیّ لەداخی ئەم قسەیە من نایەلەم بکەوێی ئەوەندە قسەیەکەیان پیسە !.

جا ئەم سورەتی الأخلاصە چەندێك گەورەیە کە صەحابەکە ئەیخوێندەوە ئەیوت خۆشم دەوێی سیفەتی رەحمانە ئینجا ئەمە حەدیسەکەیە(وعَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ رَجُلا عَلَى سَرِيَّةٍ وَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلكَ للنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ سَلُوهُ لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلكَ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ)[٤٧٢] چەند موژدەیەکی گەورەیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) موژدەت بداتیّ کەصادقی مصدقە کە چەند راستگۆیە بلی الله تۆی خۆش دەوێی بۆیە سورەتی الأخلاص تان خۆش بوێی هیچ موسلمانێك نیە لەبەری نەبیّ زۆربەی زۆری ئێمەی موسلمان بە نەخوێندەوارەکانیشەوە ئەم سورەتەیان هەر لەبەرە بەس نازانی ماناکەی چیە بەس نازانی ئەمە ماناکەیەتی خۆزگە بیزانیایە واحید و أحد الله تعالی پەرستراوەکەمان واحید و أحد ە وینەی نیە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) نابیّ بەوێنەی الله تعالی لەبەر ئەوە نابیّ بلیّ یا رسول الله هاوار بەلکو دەبێت بلیّ یا الله هاوار ، ئینجا سورەتی الأخلاص دەخوێنی دەلیّ یا رسول الله هاوار و یا عبدالقادر هاوار و یا کاك أحمدی شێخ هاوار یاخود دەلیّ یەهود و نەصراش ئەوانیش ئیماندارن ، والله ئەوەی بلیّ یەهود و نەصرا بروادارە کافرە بەئیجماعی هەموو زانایان ئەگەر وابیّ شەیطانیش ئیماندارە ئەویش بروای بە الله هەیە هەر ئەوەندە نیە بروات بە الله هەبیّ و بلیّ قیامەت هەیە خوا هەیە و مەلائیکە هەیە و ئەوبابەتانە بەلکو دەبێت تۆ ئەوشتانەی کە الله تعالی وتویەتی نەیبەزێنی الله تعالی وتویەتی من کورم نیە ، کەچی ئەو دەلیّ کوری هەیە !دەتۆ کافری تەواو با ئیمانیشت بە الله هەبیّ ، چۆن الله کوری هەیە .

حەدیسێکیتر ئوسامەی کوری شەریك دەفەرمووێی : لەلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبووین سەیری ئەدەبی صەحابە بکەن (کنا جلوسا عند النبی صلى الله عليه وسلم کأنما على رءوسنا الطیر ، ما

[٤٧١] :سورة الأنعام اية : ١٠١
[٤٧٢] : رواه البخاري ٦٨٢٧

يتكلم منا متكلم)ئەلێ : كە لەمەجليسى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دائەنيشتين ئەيوت تەير لەسەر سەرمانە ، تۆ بيركەرەوە ئەگەر كەسێك تەير لەسەر سەريەوە بێ يانى چى ! ! تەير ئەچێتە سەر سەريى كێ ؟ ! كەسێك كە نەجولێتەوە سەرى دابخا ! ! كە جولەيەكت كرد دەروا يانى كەس جولەى نەبوو كەس نوقتى نەبوو كەس قسەى نەدەكرد بەلكو قسەى بۆ دەكردين (إذ جاءه أناس فقالوا)ئەلێ كەسانێك هاتن لەپێغەمبەريان (صلى الله عليه وسلم) پرسى (منحب عباد الله تعالى؟ )ئەى پێغەمبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) كێ خۆشەويسترين بەندەى الله يە لاى الله ؟ خۆشەويسترين كەسان لەلاى الله كێ يە؟ (قال: (أحسنهم خلقا)كاميان ئەخلاقيان لەهەموويان جوانتر بێ ، سەيرى ئەخلاق بكەن ،ئينجا لەوانەيە زۆر كەس لەم حەديثە تێنەگا بلى كاكە با ئيمانيشى بە الله نەبێ خۆ ئەخلاقى جوانە ئەمە لاى خوا خۆشەويستە ! ئەمە هيچ كاتێك قبول نيە لەلاى الله تعالى چونكە تۆ نازانى پێناسەى ئەخلاق چيە .

پێناسەى ئەخلاق دەكەين :

ئەخلاق واتا مامەلەكردن لەگەل كەسێكى غەيرى خۆت ئەم كەسى غەيرى خۆت دەبێ بەدوو بەشەوە :

يەكەم الله جل وعلا .

دووەم : خەلقەكانى الله بەگشتيان .

چۆن مامەلە لەگەل الله بكەين وە چۆن مامەلە لەگەل خەلكدا بكەين ئەمە ئەخلاقە.

يەكەميان : مامەلە لەگەل الله دا ئەبێ ئيمانت پێى هەبێ وە ئەبێ خۆشت بوێى وە ئەبێ لێ بترسى وە ئەبێ بەقسەى بكەيت وە ئەبێ سەجدەى بۆ بەريت ئەبێ ركوعى بۆ بەريت ،،، هەتا داواى دەبێ لەفەرمانەكانى لانەدەى ئەمە مامەلەى تۆلەگەل الله تعالى دا وە شەرم لە الله تعالى بكەى ، لەحەديسێكدا هاتووە فەرموويان: ئەى پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) ئێمە عەورەتمان هەيە بۆ نمونە دەر خستن و دەر نەخستنى لەكێى دەرخەين و لەكێى دەرنەخەين ئەوشتانە ؟ پێغەمبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووى : ئەگەر لەناو خەلكدا بووى دەبێت خۆت داپۆشيت وە ئەگەر لەگەل خێزانت بووى ئەوە الله تعالى رێگەى داوە بەتەنياش بووى الله شايستەترە تۆ شەرمى لێ بكەى ! ، ئەها بزانە چى خوێندەوە !ئەبێ هەموو كاتێك الله تعالى ت لەياد بێ هەتاوەكو لەجل و ليباسيشدا ئەگەر بەتەنيا بووى خۆت رووت و قوت مەكەرەوە جلت لەبەر دا بێ لەژوورى خۆتى بەرووت و قوتى مەبە مەلێ كەس چاوى لێم نيە ئەگەر بەتەنيا بووى شتێكت لەبەردا بێ لە الله شەرم بكە بەلاَم لەگەل خێزانتدا بووى الله تعالى رێگەى داوە ،

ئەی لەگەل کەسانیتر بەتەئەکید ئەبیّ خۆت داپۆشی عەوەرەتەکان بەدیارخراوە ، پاشان وەکو وتم لەپێش هەموو شتێکەوە ئیمان هێنان بە الله ئەمە ئەوە ناگەیەنی تۆ دەست پاك و چاو پاکی و خیانەت لەکەس ناکەی نوێژناکەی و ڕۆژوو ناگری وعیلاقەی کەست نیە والله خراپترینی زەمانی خۆتی وریا بن زۆر جار گوێمان لیّ دەبیّ کاکە مام حاجی دزی دەکا خۆمن دزیش ناکەم نوێژ دەکا خۆمن نوێژ ناکەم بەلاّم من زولم لەخەلك ناکەم  کاکە ئەو مام حاجیە لەو جوزئیەتەدا هەلەکەی کردوە بەلاّم ڕووی لە الله وەرنەگیراوە و نوێژەکە نەکا ، ئەی تۆ لەکاتێکدا دەست پاك و چاو پاکی بەحیسابی خۆت تەمەنا دەکەین وابیّ دەی لەگەل الله شدا ڕاستکە ! خیانەت لە ئەمانەت مەکە (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ**)[٤٧٣] ئەم قورئان و حەدیسە خیانەتی لیّ مەکە وەرن نوێژ بکەن وەرن نوێژ و عیبادەتی الله تعالی بکەن ، پاشان من پرسیارێك دەکەم ئەگەر کەسێك خیانەت لە الله بکا ؟ خیانەت لەخەلك ناکا ؟! ئەگەر کەسێك ڕوونەکاتە الله و شەرم لە الله نەکا شەرم لە الله دەکا ؟! بەدەگمەن ئەم حالەتە هەلدەکەوێ بەلاّم هێشتا لەلای الله مقبول نیە چونکە ئەم کەسە بەقسەی الله نەکردوە ، شەیطان یەك ئەمری الله تعالی جیّ بەجیّ نەکرد مالی خۆی وێران کرد یەك ئەمر سەجدەیەك بەرە نەیبرد لەسەر سەجدەیەك مال وێران بوو ئەمەتان لەبیر نەچیّ شەیطان لەسەر یەك سەجدە مال وێران بووە تۆ ڕۆژانە چەند سەجدەت پێدەوترێی نایبەیت ؟! ئینجا بەخۆشت ئەلیّ باشم ! زۆر جار بەمن دەلێن مامۆستا والله زۆر باشم من هیچ کێشەم نیە !کەچی جگەرەکەی بەدەستەوەیە جاری بەس جگەرەکەت زەرە و زیانی خۆت و بۆخەلکیش هەیە ! ئەلیّ من درۆ ناکەم و دزی ناکەم بەس دلم پاکە و باشم کەچی نوێژ ناکا و جگەرە کێشە ڕۆژوو ناگرێی ئەلیّ من باشم نەخێر بەلکو من سیقەم پێت نیە ئەگەر واش بیت لەحالەتێکدا هەر باش نیە .

جا ئەخلاق کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی خۆشەویسترینی بەندەکانی لای خوا ئەو کەسەیە ئەوەی ئەخلاقی جوان بیّ ، ئەخلاقی لەگەل الله وە ئەخلاقیشی لەگەل بەندەکانی الله .

دووەم : لەگەل بەندەکانی الله ، لەگەل پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەخلاقت چۆن بیّ لەگەل مەلائیکە حیسابی مەلائیکەتەکانتان کردوە ؟ ئەلیّ بۆنی دەمتان خۆش بیّ  ئەگەرنا مەلائیکە لێتان دوور دەکەوێتەوە لەکاتی خویندنی قورئانتاندا دەم دەخاتە سەر دەمتان بۆیە بۆنی دەمتان خۆش کەن ئەگەر بۆنی ناخۆشتان لێی بیّ دوور دەکەوێتەوە لێتان تۆ حیسابی ئەمەت کردوە ؟! جگەر کێشان و سیرخۆرەکان و پیاز خۆرەکان ئەو بابەتانەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەمزگەوت ئەیکردنە

[٤٧٣] : سورة الأنفال اية : ٢٧

دەرەوە بۆ بەقیعی رەوانە دەکردن بۆ قەبرستان ئەیوت ئەبێ تۆ لەگەل مردوودا بژیت نابێ لەگەل زیندوودا بژیت چونکە ئەزیەتی زیندووەکان ئەدەی ، رەمەزانان چەندەها گلەیمان بۆ ئەهاتەوە مامۆستا پێیان بلێ بۆنی دەمی خەریك بوو شێتم بکا !!! هەر نوێژەکەشم بەدلەوە نەنوسا ! ئی واللە راست دەکەیت برای بەرێزم ئێ لەبەر اللە ئەم جگەرە تەرك بکە واللە هیچ کەسێکی عاقل نیە بلێ پاکە ! هیچ کەسێکی عاقل نیە بلێ بۆن خۆشە ! هیچ کەسێکی عاقل نیە بلێ ئەمە میسك و عەنبەرە ! هیچ کەسێکی عاقل نیە بلێ بەمە گوشتی پێ زیاد دەکەم ! دەبەسە وەرەنەوە سەر هۆشی خۆتان ئێوە لەرەمەزاناندا لەبەر اللە ئاو تەرك دەکەن لەبەر اللە تعالی خواردنت تەرك کرد لەبەر اللە چونە لای خێزانت واز لێ هێنا ! ئەمانەش هەمووی حەلال بوو دەی تۆش لەبەر اللە تعالی ئەم حەرامە تەرك بکە تەنها لەبەر اللە و شەرم لە اللە تعالی بکە ، یانی ئێستا اللە تعالی ببینی جگەرەکەت بەدەستەوە دەگرێی ؟! ئێ دەتبینی ئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەمە ئیحسانەکەیە !! ئەخلاقی جوانیش ئەمەیە .

ئینجا لێرەوە دێن زەمی من دەکەن ئەمە هەموو شتێکی حەرام کرد ئاخر تۆ وەرە پێم بلێ کێ حەلالی کرد ؟! هەتاوەکو من حەرامم کردبێ ، خۆی حەرامە لەخۆیدا .

مامەلەی تۆ لەگەل ئەم خەلکەدا جل و بەرگت پاك و خاوێن بێ نالێن ئەوپەری تازەترین جل لەبەر بکەیت جلەکەی خۆت لەبەر بکە بەس پاك بێ و بیشۆیت بۆنی ناخۆش و عەرەقی لێ نێ ، وە بۆنی خۆش لەخۆت بدە ، پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) مەشهور بوو بەوەی کەوا لەشوێنێکدا برۆیشتایە بۆنەکەی دەهات پێش ئەوەی خۆی بگا لەبەر ئەوەی بۆنی خۆشی دەهات کە لەخۆی دەدا . ئێوەش بەم شێوەیە بن.

ئەخلاقی جوان لەگەل خەلکدا ئەوەیە روو خۆش و قسە خۆش بی وە ئەخلاقی جوان ئەوەیە کەوا لەگەل مال و مندالدا باش بی و تەربیەتی باشیان بدەیت بیر لە گۆر و قیامەتەکەت بکەیتەوە ئەمەش ئەخلاقی جوانە .

لێرەدا کۆتایی بەم کتێبە دەهێنین کە ئەم ماوەیە شەرحیمان کرد اللە تعالی لێمان قبول بکا .